# خاک و هەڵدێر

ڕۆمان

عەزیزی مەلای ڕەش

بەرگی سێیەم

هەولێر ٢٠١٩

* **ناوی کتێب** : خاک و هەڵدێر
* **نووسەر** : عەزیزی مەلای ڕەش
* **هەڵەچن** : نووسەر
* **تایپ** : سەنگەر شنۆیی
* **دیــزاین بەرگ و ناوەوە** : شاخەوان جەعفەر
* **تــیــراژ** : ١٠٠٠دانە
* **چاپخانە** : ڕۆژهەڵات

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (٣٠٥) ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە

## سەرایی یەکی لابەلای بە ملداماتن:

هەرکە پارتی دیموکراتی کوردستان ساڵی (١٩٩٦) هاتەوە شاری هەولێرو حکومەتی دامەزراند هەریەک لە من و ڕێزدار مامۆستا «عەبدوللا سەراج» ڕۆمانێکمان بۆ چاپ کردن دا وەزارەتی ڕۆشنبیری.
ئەوسا خوالێخۆشبوو فەلەکەدین کاکەیی وەزیر و مامۆستا سەردار میران و کەریم فەندی بەڕێوەبەری وەزارەت بوون.
ڕۆمانەکەی من «خاک و چەوسانەوە» بوو کەچی ڕۆمانەکەی مامۆستام بەداخەوە لەبیرچووەتەوە.
نازانم چەند ڕۆژی پێچوو ڕۆژێک چوومە چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری دیتم ڕۆمانەکەی مامۆستای ناوبراو وا چاپ دەکرێت.
فەرمانبەر و کاربەدەستانی چاپخانەکە زۆریان لەمل خۆشبوو چاپکردنی ڕۆمانەکەی من پێش ڕۆمانەکەی ئەو بکەوێت و پێیان گوتم:
- کوا ڕۆمانەکەی جەنابت دیار نییە؟.
چوومە وەزارەت و گوتیان:
- هێشتا لای خەبیر نەهاتووەتەوە.
چەند جاری دی چوومەوە و هەر ئەو .. وەڵامەم دەست دەکەوت.
هەتا ڕۆمانەکەی مامۆستا تەواو چاپکراو هەرمابوو «تەجمیع» بکرێت،من بۆ هەمان مەرام چوومەوە لای مامۆستا «سەردار میران»ی خوالێخۆشبوو، تازە ڕۆمانەکەی منی بەدەست گەیشتبوو، کە چاوی بە من کەوت لە حیدەتان شین و مۆڕ هەڵگەڕاو گوتی:
- بە حەقی خوا من لەپیلانی ڕۆمانەکەی تۆ کەم و زۆر ئاگادار

نیمەو هەرچی هەیە لەمەڕ سەری «کەریم فەندی و عەبدوڵلا سەڕاجە».
منیش هەتا ئەوساتە لە گوێی گاوە نووسبتووم و ئاگاداری هیچ نەبووم.
هەرکە تەواو لە بنج و بنەوانی وێکەوتم، یەک لە پیلانە شوومەکە ماموستا عەبدوڵلا کرا بووە خەبیری ڕۆمانەکەی من. ئەگەر پیلان نەبووایە منیشیان دەکردە خەبیری رۆمانەکەی ئەو.
لە وەزارەت وەبەر گوێیان هەڵدام رۆمانەکەی ماموستا هەتا زوو چاپ بکرێت نەدراوەتە خەبیر.
من لە ڕۆمانەکەمدا گوتوومە:
- لە ساڵی ١٩٣٧- ١٩٣٨ دا «مستەرلابین» ی ئەندازیاری دابەشکردنی زەویی کشتوکاڵ لەدەشتی قەراج و کەندیناوەدا بەجوتیاران دەڵێت:
- زەوی خۆتان مەدەنە ئاغا. دواڕۆژ بەخۆی دەرتان نەکات کوڕی، کوڕێ کوڕی دەرتان دەکات.
جوتیارەکان دەڵێن:
- ئاغا لەبەر ئەوە بە تەنیا توانای تۆ کردنی ئەو هەموو زەوییەی نییە پێویستی هەردەم بە ئێمە دەبێت.
مستەر لابین دەڵێت:
- هەتا ئەو ڕۆژەی من دەڵێم مەکینەیەک پەیدا دەبێت جوت بکات و یەکێکیش دروونە.
جوتیارەکانیش دەڵێن:
- ئۆی. لەو درۆیە.
ماموستای خەبیر بۆ ئەوەی ڕۆمانەکەی من ڕەفز بکرێتەوەو چاپ نەکرێت چوو بووە بارەگای «حزبی شیوعی» و پرسیاری کردبوو:

- ئەریَ ئەو بۆچوونەی عەزیزی مەلای ڕەش ڕاستە، یان درۆ؟.
ئەندامانی حزبی شیوعیش دەڵێن:
- ئـەوە لەمێـژەو لەبیـری ئێمـەدا نییـە، بـەڵام لەناوچـەی کەندینـاوە بـاوە.
ئەمەم لە بارەگای حزبی شیوعیم پێگەیشت.
هەرکـە مامۆسـتای خەبیـر ئەمـەی بـۆ نەچـووە سـەر، بـۆ ئـەوەی چاپەکـەی دوای چاپـی ڕۆمانەکـەی خـۆی بکەوێـت لەگـەڵ مامۆسـتا «کەریـم فەنـدی» ڕێـک دەکەوێت و ماوەی (٤٠) چل ڕۆژ دوای تـەواو بوونـی لای خەبیر لەنێو چەکمـەزەی ئـەو حەشـار دەدەن. هەتـا چاپـی ڕۆمانەکـەی تـەواو بـوو ئەوجـا دەریـان خسـت.
مـن لـەو پیلانـە قەباحەتـە زۆر تـوورە بـووم، بـڕوا بکـەن ئەگـەر مامۆسـتا لەبـەر «ژمـارەی - ڕەقـەم» ی بچووکـی وەزارەتـی بووایـە، بـە منـی بگووتبووایـە:
- پێـم خۆشـە چاپکردنـی ڕۆمانەکـەی مـن پێـش چاپـی ڕۆمانەکـەی جەنابـت بکەوێـت، بەوپـەڕی گـوراح خۆشـییەوە ملـی ڕەزامەندیـم بـۆ دادەنوانـد. بـەس بەداخـەوە وا دیـارە مامۆسـتا پیلانـە قەڵپەکـەی لاپیـرۆز و هەموارتـر بـووە.
نوسـخەکەم لەمامۆسـتا سـەردار وەرگرتـەوە و ویسـتم بێمـە دەرەوە تۆنـد دەسـتمی گـرت و سـێ جـار فەرمـووی:
- پیـاوی باشـبە مەبیـەوە، شـەرتە وا بکـەم بـە زووتریـن کات بـۆت چـاپ بکرێـت.
بە هەڵچوونەوە گوتم:
- تـازە هەرگیـز بێزم نایـەت، لەبـەر ئـەو پیلانـە دزێوەی کـە دەسـتی وەزارەتیشـی تێدایـە پێتـان چـاپ بکـەم.

لە شروان هێرشێکی توندوتیژم کردە سەر مامۆستای خوالێخۆشبوو فەلەکەدین کاکەیی. ماڵی سەت جار ئاوا بێت، لە پایەبەرزی خۆیەوە لە جیاتی وەڵامدانەوە پێم تریقاوە.
ڕێزدار کاک «شێرزاد ئیسماعیل عەلی» لە سویدەوە هەرکە بە گوێی کەوت لە وەزارەتی رۆشنبیریدا، بۆ ویستی حەزی مامۆستا عەبدوللا سەراج غەدر لەمن کراوە، هەتا ئەوساتەش من ئەوم نەدەناسی یەکسەر(۱۰۰۰) هەزار دۆلاری بۆ چاپ کردنی رۆمانەکەم نارد. ئەوکات دۆلار((۳۸)) سی و هەشت دیناری عێراقی بوو. هەر ئەو ڕۆژە چووم لەچاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری بە پارەکە چاپی بکەم.
کاربەدەستانی چاپخانەکە ماڵیان سەت جار ئاوا بێت یارمەتییەکی یەکجار زۆریاندام. ئەمەش بۆ غەدرەکە دەگەڕاوە.
فلووسێکم بە پلێت نەدا، کەونە پلێتیان لەملاو لەولا پەیدا کرد. واتە نیوەی نرخی چاپکردنیان بۆ گێرامەوە.
هەزار (۱۰۰۰) دانەی چاپی کتێبەکەم نزیکەی (۸) هەشت هەزار دیناری تێچوو. نزیکەی (۳۰) سی هەزار دینار لەپارەکە ماوەو هەر زوو جەوابم بۆ کاک شێرزاد نارد و گوتم:
- چ لەو پارەیەی لەپاش چاپکردنی ماوەتەوە بکەم.
ئەویش جوابی رەوانە کرد و گوتی:
- من پارەکەم داوەتە جەنابت و موڵکی خۆتە.
نازانم چەند ڕۆژ دوای چاپ کردنی پێچوو، خوالێخۆشبوو مامۆستا «شەوکەت شێخ یەزدین» جەوابی بۆ ڕەوانە کردم و منیش چووم. هەرکە دانیشتم و گوتی:
- کتێبەکەت چۆن چاپ کرد؟

واریقاتەکەم لەسیری هەتا پیازی بۆ دەور کردەوە.
دەستی بۆ چەکمەزەکەی بەردەمی برد و گوتی:
- ئەوا ئێمەش (٤٠٠) چوارسەد دۆلارت پێشکەش بکەین.
هەرچەندی گوتم:
- نامەوێت و پارەیەکی زۆر دوای چاپکردنی کتێبەکە بۆم ماوەتەوە.
سوێندێکی مزری پێداداو گوتی:
- لەبەر ئەوە. وەریدەگریت تاکو بزاندرێت پارتی ئاگاداری ئەو غەدرەی لەتۆ کراوە کەم و زۆر نییە.
ڕێزداری خوالێخۆشبوو مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی هەرکە زانی لە وەزارەتەکەی غەدرێکی گەورەم ختوخۆڕا لێکراوە، ئەوکاتیش دەنگۆ لەنێو وەزارەت بڵاوببووەوە، «کەرکووک چیاتیان بەکارهێناوە کاتێک بۆ(٤٠) چل نووسەر مووچەی هەزار (١٠٠٠) دیناری ئەوسای بڕییەوە، ناوی منیشی لەگەڵدابوو.
من هەتا ئەو ڕۆژە لە پارە وەرگرتندا، بەناوی نووسەرایەتییەوە تۆزێک نامۆ بووم، زۆر جارم ڕەت کردبووەوە، ئەمەش لای نووسەرانی شاری هەولێر باوەو هەتا هێندێک لە نووسەرانی سلێمانیش دەزانن. بۆیە پێویست ناکات لێرە چیرەی بدەمێ.
لە هەوەڵەوە ویستم ئەمەش ڕەفز بکەمەوە هەتا بەدۆستی ئازیزم «د.عەزیز گەردی» ڕاگەیاند و گوتی:
- پارەی حکومەتە بۆ وەرناگریت».
ئەمە وایکرد ئاوی لێنەخۆمەوە.
پاش وەرگرتنی بە دوو سێ مانگ وتارێکی توندوتیژم دژی حکومەت بڵاوکردەوە.
مەلا موعەلیمێکی خوبزەی حیزبی، لەکۆنەوە دۆستایەتیمان بەهێز

بـوو «ناوهێنانـی ڕەوا نییـە» پێیگوتـم:
- تۆ ناکیرولجەمیلیت. حکومـەت مانگێ هـەزار دینـارت دەداتێ ئەوجا هێرشـی دەکەیتـە سـەری.
ئەگــەر پـارەم وەرنەگرتبووایــە ئــەو خوبزەیــە حــەددی ئــەو قســە تڕووهاتــەی نەدەبـوو.
لـە زمانـی زوو لـە دێهاتەکانـدا هـەر گۆوەندێـک پارەی وەرگرتبووایـە پێیاندەگـوت: «چـاوەش» ئەگەرنـا بـە «حەیـران بێـژ و لاوک بێـژ و بەسـتەبێژ»ناو دەبـردران.
بـە قسـەکەی زۆر دڵگیـر بـووم و گریـان لـە هەوگـم قەتیس مـاو هـەر ئەو دەم خۆم بە چاوەشێکی ڕاستەقینە خەملاند. باوەڕ بکـەن ویستم ڕەفـزی بکەمـەوە، کەچـی ئەوسـا گوزەرانـم تـەواو نەبـوو. مووچەکـەم بـۆی دەرنەدەهێنـام. ئیتـر لەسـەر چاوەشـاتییەکەم بـەردەوام بـووم هەتـا حکومـەت رزگاری کـردم و بـڕی.
کەچـی مامۆسـتای خەبیـری کتێبەکـەم وەک چـاو ئێشـە بۆ یارمەتیـدان دەگـەڕا. ئەمـەش هەندێـک لـە نووسـەرانی شـاری هەولێـر دەزانـن.
من خۆم ئەمەم بەچاو دیوە:
رۆژێک لە کۆڕێکدا ئافرەتێک نەمدەناسی و ئەمەی گوت:
- بەداخـەوە مامۆسـتا عەبدولـلا سـەڕاجی رۆمـان نـووس دەسـتی زۆر کورتـە و پێویسـتی بـە یارمەتیـدان هەیـە و هەتـا ئێسـتاش یارمەتـی نـەدراوە.
دوو سێ رۆژ پاش ئەمـەی سـەرەوە لەگـەڵ کاک بـارزان مـەلا خالیـد، کـە تـازە بووبـووە، وەکیلـی وەزیـری رۆشـنبیری، بەیەکـەوە دەچووینـە ماڵـەوە گوتـی:
- دەڵێـن عەبدولـلا سـەڕاج دەسـتی کورتـە و بەنیازیـن، هاریکاریەکـی

باشی بکەین.
ئەمەش پێش ئەو کێشەی نێوانمان و مووچەکەی من بوو.
منیش گوتم:
- لە نووسەرانم وا بیستووە:
یەکەم: دوو خانووی هەیە.
دووەم: پارەی بە قازانج لە بازاڕ دەگەڕێت.
سێیەم: شڕوشاتاری ماڵەوەی لە یەک ملیۆن دۆلار پترە.
بارزان گوتی:
- بە ڕاستیتە!؟.
- دەتوانیت لە نووسەرانی دەوروبەری بپرسیت.
- وەللا ئەگەر وابێت فلووسێکی لە وەزارەت نادرێتێ.
لە یارمەتیدان و نەدانەکەی ئاگادار نیم.
مامۆستا عەبدوللا جگە لەو تاوانەی دەرحەق من ئەنجام داوە ئەوجا بەم تەرزەش هێرشی ناڕەوای بێ پەردەی ئەدەبەوە کردووەتە سەرە من و فەرموویەتی:
- عەزیزی مەلای ڕەش بەهرەی هەیە، بەڵام ڕۆشنبیر نییە».
ئەگەر باسی تاوانەکەی خۆی لە پاڵ بکردبووایە هەرگیز من حەرەجم لێنەدەگرت و بگرە ملی تەرازووم بە حەزەوە بۆ لاردەکردەوە و دەمگوت:«
- راوبۆچوونی خۆیەتی»، کەچی خۆی کەم و زۆر لە قەرە نەداوە.
بۆیە هەتا مردن بە ناحەزی خۆمی دەخەملێنم و پێیدەڵێم:
- یەکەم: - کام ڕۆمانی جەنابت لە ڕۆمانی کوێخا سێوێ لە کوردستان بەناوبانگترە، بگرە هەموو ڕۆمانەکانت بە ئەندازەی ئەم ڕۆمانەی من لەسەریان نەنووسراوە.

دووەم: کام ڕۆمانت لە ڕۆمانی «پل» و «لێقەومان»ی من بەهێزترە.
سێیەم: - ناوەڕۆکی کام ڕۆمانت لەناوەڕۆکی «پل» بەهێزترە.
چوارەم: کێهان ڕۆمانت بەقەدەر ...ڕۆمانی «پل» هێرشی ئاشکرای کردووەتە سەر پوخلەواتی کاربەدەستانی کوردەوە.
پێنجەم: - کام ڕۆمانی جەنابت لە زەمانی دکتاتۆردا هێرشی توندی بە ئاشکرای کردووەتە سەر بەعسی داگیرکەر، وەک ڕۆمانی «گورگ و بزن»
شەشەم: - کام ڕۆمانت تەقریری لەلایەن زرکوردەوە بۆ ڕێکخراوی «مەنزوومە»ی «یەرموک» لەسەر نووسراوە تەرزی ڕۆمانی «گورگ و بزن».
حەوتەم: - کێهان ڕۆمانت لە هەرچوارپارچەی کوردستان تاکە ڕۆمان بێت بۆ مێردمنداڵانت نووسیبێت وەک ڕۆمانی «بۆرە» و «گورگ و بزن».
لەنێو میللەتیشدا بەلای کەمیەوە دە هێندەی جەنابت بەناوبانگم.
کەواتە جەنابت بەچی کەشخە لەسەر من لێدەدەیت. تەنیا ئێرەیی پێ بردنە و بەس. کاروانیشم سوپاس بۆ خوا هەربەردەوامە.
من دان پێدادەنێم ڕۆمانی «خاک» هەر دوو بەرگ زۆر بێهێزن.
نەخاسمە بەرگی دووەم. ئەمەش بۆهۆیەکی تایبەت دەگەڕێتەوە.
بەڵگەش نزیکەی ((١٠)) ساڵ دوای کوێخوا سێوێ و غەوارەم نووسیون.
دەبووایە بەهێزتربوونایە. کەچی بەداخەوە بەرەواژن.
دەبووایە مامۆستا عەبدوللا ئەگەر مەرامی سووکاتی من نەبوایە ئاماژەی بۆ ئەوەی سەرەوە بکردبووایە. ئەمەش تاوانی دوومێتی.
هۆیەکە:

لەکاتی گرانییەکەدا دەستم زۆر کورت بوو. گوزەرانی خۆم و منداڵم بە حاڵەحاڵ پێدەسووڕاو بۆ ماوەی ((١٠)) مانگ زیاتر خۆم و منداڵم دەممان بە گۆشت و برنج نەکەوت. ئەوکات چوار لاپەڕە کاغەز بە دینارێک بوو.

نەفت بە گوللە چنگ نەدەکەوت، کەچی لەپێش بارەگای دزەکان بەتەنکەر دابەش دەکرا. چاپەمان بە پووش و پەڕەکاغەز لێدەنا. بەرگی دووەمی ڕۆمانەکە، لە بێ کاغەزیان «مسوەدەکە»یم لە هەردوو دیوی وەرەقەم نووسی. بەداخەوە ئەوسات لە عولعولاتی خۆمەوە نەخۆشی خۆشەویستی چاپ کردن بەسەرمدا زاڵ بوو، ودڵم بەردەستی نەدام هەتا توانای کاغەز کڕینم دەبێت ئارام بگرم و جاری دووەمیان بنووسمەوە و کەم وکوڕیان نەهێڵم. مسوەدەکەیانم بە چاپ گەیاندن. ئەمەش گەورەترین نسکۆی قەڵەمەکەمە وا کاکی خەبیر چاوپۆشی لە ((٨)) هەشت ڕۆمانەکانی دیم بکات و بەم دوو بەرگە نەخوێندەواریم بداتە پاڵ.

بەرگی یەکەم لەبەر کەمی لاپەڕەکانی(( ٢٧٠ )) دووسەت و حەفتا لاپەڕە بوو. ودەسەڵاتم بەجارێک نووسینەوە. تۆزێک بەسەریدا شکاوە. کەچی بەرگی دووەم «٤٠٠» چوارسەت لاپەڕە بوو...و توانام بەسەریدا زاڵ نەبووە و داڕشتنەکەی زۆر بێهێزە.

تا لە ڕوانگەی ڕێزمانیشەوە پێویست بە نووسینەوەی جارێکی تر هەبوو.

هەرکە چاپ کراو خوێندمەوە ئەوجا زانیم و پەنجە گەستنی پەشیمانیش، دوای ترێ خەپشەی بڕێ دادی نەدام.

پاش چاپکردنی بەرگی دووەم، برای زێدە هێژا و ئازیزم «د.عەزیز گەردی» هەرکە هێندە نووسینمی دیت لە هەردوو لای کاغەزم

نووسیوه حسیا لەبەر نەبوونیه و یەکسەر بەڕێزدار کاک «مەحمود»ی پلک زای و بەڕێوەبەری چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی گوت: یارمەتیم بدات.
ئەویش ماڵی ئاوا ناوه ناوه «دووبەند» سێیانی لەم کاغەزانەی کە لە پاشماوەی چاپ کردنی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاران دەماوە، دەدامێ و ئیتر لەو ڕۆژەوه گیروگرفتی نەبوونی کاغەزم نەما.
بەرگی «سێیەم»ی ڕۆمانەکە هەروەکو گوتم کاغەز پەیدا بوو کەچی لەبەر. بەرگەکانی پێشوو زەوقم بە هیچ شێوەیەک لەسەری نەما جاری دووەمی بنووسمەوه. هەر مسوەدە بوو. دوای ((١٦)) شازدە ساڵ ڕۆژێک سەیرم کرد بەهۆی شوێنەکەیەوه، لەگەڵ چەند نووسراوی تر «تەڕەشوحی»یان هەڵێنابوو. وزۆربەی نووسینەکان کەڵکی خوێندنەوەیان نەمابوو. ئەمە ناچاری کردم ڕۆمانەکە جاری دووەم، بەبێ دەسکاری تەنیا لەڕووی ئیملاو ڕێزمانەوه نەبێت بنووسمەوه.
لە چەند شوێنان لاوازه. نەخاسمە لە ڕوانگەی تەکنیکەوه. لەبەر هۆیەکانی پێشوو چەندی تانم لە خۆمدا نەمتوانی کەم و زۆر خۆم لە قەرەی بەپیزکردنی بدەم. واتە تۆزێ ڕۆمانی «پل» لە هیچ ڕوویکەوه ناشکێت.
گەر دەتەوێت زۆربەی ئەو کارەساتانەی بەرپرسان بەسەر کورد و کوردستانیاندا هێناوه و بشزانێت ئەنفالی یەکەم و دووەمی گەوره و گچکە و سێیەم چۆن بوونە بیخوێنەوه.
ئێوه و ڕۆمانەکە:

ستەم لە ژێر هەر قاوغێک دابێت، هەر ستەمە. لە دەروونی ئەو کەسانە چەکەرە دەکات فریان بەسەر هەستی مرۆڤایەتییەوە نەمابێت و هاونیری «گۆریلـلا» بن. لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا، ئەگەر خوێن سەرکانیش ببات ئەوجا. ڕێویی ناوپاوان ئاسا بەز پێدەگرن و بە ئاژاژکی خۆشی و سەرفرازییەوە دەستی حەزیان دەخەنە سەر دڵە بە مراز گەیشتووەکەیانەوە.
بەرگری چینی ستەمدیدە لە ئاست چەوسانەوەی نەتەوایەتیدا لەملان زۆر سووکە و راستە ڕێی قەت لێون نابێت و بە پروپاگەندەی «کات لە من و جۆت لە من» هەرگیز لە خشتە نابردرێت. دار هەڵبرین لە ئاست سەگی خانەزانیی یەوە گۆترە نییە. مەگەر بە تەوژمی جەسارەتی و ملهوڕیی گیان لەسەر دەستانەوە.
ئەمەیان بۆ ئەوەی ئاوقای مەرامەکەی ببێت، کە مژینی خوێنی میللەتە، لە وەهلی بێ شنگیدا، هەتا جێی قوونی تەواو گەرم دەکات، بە هەموو بارێک دێتە بەرێ و بیبیسوانە، بە سەتان ڕەنگ خۆی دەخەملێنێت و دەچێتە بن عەبای دەیان هەڵوێست. لە ڕووالەتدا دەسبەرداری شەکانەوەی درووشمی پرشنگدار و بەختەوەری نابێت، تەنیا هەر منم نوێنەری راستەقینەی ئێوەی میللەت.
ئەوسا بێباک پەردەی خەجاڵەت دەزرێنێت و وەک مرۆڤی گۆرین نەبێت دەچێتە سەرداری غەزەبەوە و لەگەڵ باوکی خۆی بە حەق ناجوولێتەوە و «ئەوەی دەستی خۆی دیت باوکی خۆی ناناسێت». دەبێتە دوژمنی باوەکوشتەی ئەوانەی لەسەر ورگیان پێگەیشتبوو.

* * *     * * *     * * *

ترسی بەعسییەکان، کە قەڵاچۆکردنی نێرومێی بنەچەکەیە و گیانیشی لەبەرایی هەموو شتێکە، هورووژمی بۆ هێناو:

- دەبێ پێش تایێ بەڕەی بە خۆماندا بدەین و هەتا نەکەوتینە بەر کەلبە تیژەکانی «ع» ی داگیرکەرەوە، چارەیەک بدۆزینەوە.
تخی لەماڵ و خانوو. و موچە و شاری باب و باپیرانی کردو:
- کە سەرمان تێدەچوو ئەوانە بە چ کەلک دێن».
ئەو شارەی لە ژیانیدا متووی بوو بوو. وخۆشەویستی لەناخی دڵیدا غەزەرەی وا دەرکرد بوو گریمان هەفتەیەک لێیدا ببڕابووایە هەستی غەریباتی هەڵدەستا و تنۆکە فرمێسکی هەواداری بۆ هەڵدەڕژاند و:
- کەسێک غەریبی مەفتەنی خۆی نەکات، بێگومان بە بنیادەم لەقەم نادرێت.
ئـ هـ کێشکە بە کێشکایەتی خۆی ئێواران بۆ کونەکەی خۆی دەگەڕێتەوە.
بەخاووخێزانەوە و تخ لە هەموو شتێک هەیپەیان لێکرد و لە گوندێک لە گوندەکانی ناوچەی «ت» و نساری کێوی((........))کە لاچەپ و دوورەدەستی دوژمن بوو سەنگرانەوە:
- ماڵوێرانی و قوڕبەسەری ئەوهایە: لە ترسی زەبر بەدەستانی غەواره و داگیرکەرانەوە، ئەوانەی خاکی باب و باپیرانمانیان پێشێل کردووه و بە چاوی غەزەب و دڕندایەتییەوە سەیرمان دەکەن و هەرکە دێنەقسانیش:
- غیر کردی جئت من الجبال، «لەشاری خۆم نەحەویمەوە. ئەوشارەی کەوا لەگەڵ هەناسەم تێکەڵ بووه».
لەگەڵ ئاخێکدا دەقی ئاغابانووەکەی تێک چووبوو..و ڕێکی خستەوەو:
:- چۆلکردنی کەندێناوە دەمێکە...
لەگەڵ دەست خستنە سەر سییەکان و:
- سیپەلاکمی تەریفە کردووه. ئـ هـ ئەوجارە جەرگیشمی دەچێتە

پاڵ. ئەوەش زامێکە بەهەوەنتە سارێژ نابێت، بەزم لێرەدایە: بووین بە مشک پشیلە، لەنێو کونی خۆمان سەراو دومان دەنێت. ئەوجا ئومەمییەکان بە داگیرکەری ناخەملێنن و دەفەرموون:

- داگیرکەر و ژێرچەپۆک، ئاگروپووش، گورگ و مەڕ لە دێر زەمانەوە برانە، برایەکی دایک و باوکی و دەرزیان لەم ڕووەوە بەمەعبێن وە ناچێت. ئەوانە حەیام زەمانێکە بۆ ئەو مەرامە فرۆشراون. ئەگەرنا دوای ئەوەندە ساڵە هەوڵ و تەقەلا خشتێکیان لەسەر خشتێک دادەنا. ئـ. هـ نەتەوە پەرەستەکانیش بە درۆی دووزەردێنەی لێبانلێسییەوە کاوێژیان دەکەنەوە و مینەکی ئەمدیو و ئەو دیو نەبن مسۆگەر ملکەچی داگیرکەرێک هەر هەنە.

زۆر کەیفساز بوو.. و لایوابوو ئەگەر غەریبایەتی نەبووایە، تازە هاتووەتەسەر ڕووی دنیاوەو:((

- ئۆخەی خۆ لەترس و هێرشی دڕندایەتی زەفتییەکانی بەعسی داگیرکەر حەسامەوە!. ئەگەرچی تەنیا ئاسمانت لێوە دیارە...

پشت ئاڤایی چیایەکی بڵندی کەشکەلانی و خۆرهەلات و خۆرئاوای یاڵ و ملەن و ڕۆژی لە دێیەکانی دەورو بەر زووتر لێئاوا دەبێت و درەنگتری لێهەڵدێت. لە باکووریدا دۆلێکی پان و بەرین و کاکی بەکاکی و دەستی وێرانی داگیرکەر زیارەتی نەکردبوو. .وهەر لەسەر دەستووری کۆنی باب و باپیرانەوە مابووەوە، هەلاش و گڵ:((

- بەلان بۆن و بەرامەی هەواکەت ئازادە و هەست بە سەرفرازییەکی یەکجار زۆر دەکەم و لامواپە پاشای سەر تەختیمە».

زوو بەرگوێی کەوت خوبزەکانی داگیرکەر گەمارۆی ماڵەکەیانداوە:

- ئا. ئەوە هەلوێست و دەستووری دوژمنە لە ئاست چنگ قژکەرەواندا».

پاش چەند ڕۆژێک ئێشک گرتن دەستی بەسەردا دەگرن:
- عەجایب ئەوە قەت خەسڵەتی بەعسی درندە نەبووە. ناوەڵڵا!. ڕەنگە لەبەر ئەوە تێکیان نەدابێت تاکوو سەیتەرە لەسەر گەڕەکەکە بکەن بە خەفیەکی خۆیان بسپێرن.

* * *

لەبارەی تۆڵەکەیەوە، ئەوەندەی هەوەست پێدەهات لەباس نایەت. جوقجوقانی هەڵدەپەڕی و:«
- ئەمە بەرەی رووتانین لەمارەیی دایکمان خۆش بین لە تۆڵەی خۆمان خۆشنابین. نەخاسمە لە ڕاست دوژمنی داگیرکەر».
لایوابوو تازە لە غەزای «ع» ان گەڕاوەتەوە:«.
- زۆر شکور خوایە خۆ کەلەکەی ئۆخەم کەوتە عەردی!. ئیدی بەسمە و چیترم ناوێت، نا».
بێ پەردە، بەوپەڕی شانازییەوە بە خزم و ناسیاوی عەرەب و عەجەمی ڕاگەیاند:«
- ئایا. دەزانن تۆپاندمان، تۆپاندنێکی وا لە دوڕ کۆشی ژنەکەیەوە کردمانە پەندی زەمانە».
- تا فتراقی دڵی خۆی، کە لە ژیاندا متووی بوو بوو باش داکەواند
- «ئەوە بۆ من هەموو ماندوو بوون و لێقەوماوی و دەربەدەرییەک دەهێنێت».
ئەو تەرزە تۆڵەیە، بڕی دڵان بەجارێک جوینەوە داناکەوێنێت تا لە سینگان پەنگ نەخواتەوە هەرگیز دەست بەرداری نابن. نەخەسەلە نەتەوەیەکی کۆسکەوتەو و ژێربار، زەبر لە دوژمنێکی بەهێز و غرووڕو چاوسوور و خوێن ڕێژی بێ ئامان بدات:«
- دەرمان خست ئێمە هەرچەند شپرزەو بێ شنگ بین دەتوانین

لەبنەوە لەپێ تۆڵە قژکەینەوە، لە دنیاشدا ئەوەندەمان سەروزێدەیە».
هەر زوو چەشنی ئاگری «بڕەسۆرە» بەبەروە دەچوو.. وبووە بنێشتە شینکەی سەر زارانی کۆڕ و کۆبوونەوەی دیوەخان و یانە و گازینۆ.. و شوێنە گشتییەکانی ناو شار. خەڵکە عەوامەکە بە بتوونی پێ شاگەشکە بوون و زۆربەیان لە دوڕ ژووریماڵەوەیان، لە کەیفان سێ جڕتیانە هەڵدەپەڕین. وەک دەستی خۆیان سەوز کردبێت، ڕۆژانە بەدەیان جار تیلک لە دوای تیلکی شانازیان تێوەردەدا:
- دەگ دەستتان خۆش بەرەی ڕووتان.
- سەت ئافەرین لەخۆتان و نەبەردیتان.
- بەڕاستی تۆڵەی خۆتان مەردانە کردەوە!.
- دەرتان خست، ڕۆڵەی تەنگانەن. نەک گەمە.
- دەستی خۆتان کەسک و پیرۆز کرد و حەق وایە هەموو ڕۆژی چوارشەممان زیارەت بکرێن.
- ناوی خۆتان نەمر کرد.
- ئەوە گوتنی ناوێت.
- بریا بە بریایێ دەستی ئێمەشی تێدابوایە!.
- وەللا بێ حیساب و کیتاب، بە پێڵاوەوە دەچووینە بەهەشت.
- ئەوجا ئەگەر ئەو بنەماڵە نەبووایە ئێمە تۆڵەمان هەر بە خەیاڵیشدا نەدەهات.
- کورە ئێمە و ئەو غیرەتەمان لە کوێ بوو.
- ئەوەی ئەوان کردوویانە هەتا هەتایێ لەیاد ناکرێت.
- ئەو داستانە مەزنە هی لە یادکردنییە. موستەحیلە.
- دڕندەترین قەسابی شارەکەمان بتۆپێنن و لەبیریش بکرێت!.
- نەخێر لەیاد ناکرێت.

- لێرە ڕا هەڵکوت هەڵکوت دوو ناوچە و چەند گوندان ببڕن و بچنە ناو «٤»ان هەر بە زار خۆشە.
- ئەدی خۆ بەلاش لە تۆڵەسەندنەوەدا ناودەنگیان دەرنەکردووە.
- ڕاستە هەموو لایەکمان دەزانین چەند داستانی ئاوایان ئەنجامداوە.

* * *

پێنج و دوو ڕۆژی پێنەچوو لە گفتوگۆ. و هەڵسوکەوتی چەکداران بۆی یەکلابووەوە: هەستی نەتەوایەتی، بە جۆرێکی وایان لە مێشک سەقادراوە فڕی بەسەر ئەو هەستەوە نییە، کە میللەت ساڵەهای ساڵە چاوەڕوان و عەوداڵینە:«
- کەر لەکوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە. ئـ هـ بە بۆنی کەبابەوە هاتم، بەداخەوە نەمزانی کەرداخ کردنە».
زەینی بەرەو دواوە ڕۆیشت:
- لەو ڕۆژەی کە بۆ ئافەرینێک، بەنان و زگی خۆتانەوە پێناو ئاسا بوونە پێش قەرەوری هێزی کورد کوژەکەی ئەودیو حسیام سەمعە سۆتتان لە باخەڵدا نەماوە، شایەنی سوپاس و ستایش بێت. ئـ... هـ کەسێک لەگەڵ دوژمنی خاک و میللەتی خۆی هاونیر بێت چی لێڕەچاو دەکرێت.
مەزەندەی وایدەخەملاند:«
- دەهۆڵی ئەمەو بگرە هەستی مرۆڤایەتیش لەناخی کەللەیانەوە دڕاوە و دڕندایەتی میراتگرەوە و میللەتیش مەڕی بێ شوانە و کەم و زۆر حسێبی بۆ ناکرێت».
- تا خۆم هەبم میللەت چییە.
- کەسیش شک نابردرێت دەست لەبەردەستیان هەڵبدات، یاخۆ بە زار بەرپەرچی ئەم هەڵوێستە ناهەموارە و دوور لە هەستی

مرۆڤایەتییان بداتەوە و:((
- ئێوە کورد نین کورد کوژن)).
مەگەر ئەو کەسەی لە گیانی خۆی بێزاربێت:«
- بەحەقی خوا شەو ناکاتەوە، بێ سێ و دوو لە خرتۆرەی وەردەدەن».
حەمەڕەحیم هەرکە ئەم دیمەنە دزێو. و مەکرووفەی بە چاودیت:
پیاوێکی باریکەلەی سوور و فل و کاملیان چنگ لەسەر چنگ دا بەرپارەسوو. و قۆنداخان و لە ئاوایی زۆر دوورنەکەوتنەوە دەنگی سێ چوار تەقە مام ڕەمەزانی شلەژاند و ما بە چەپەلۆکان وەرگەرێتە سەر و گوێلاکی خۆیەوە و:«
- وەیرۆ. ئامۆزا. بەغەدر کوژراوەکەم ڕۆ...»
ڕۆ ڕۆی باوکی لەسەر زاری دایکییەوە لە گوێی زرینگاوە:«
- وەیرۆ. بابەڕۆ.. براڕۆ.. سەید تەڕەماشی نانە خۆرەی خۆمان کوشتمی!.)).
بەجارێک شپرزا و پشووی خەفەتانی سواربوو..و هانکە هانکی پێکەوت و سەری غەزەبی لە بێدەسەلاتییەوە بردەوە غەریفێ و:
- قادری ئامۆزامە و شێخ جەوابێ بۆ ناردبوو ((١٠)) دە هەزار دیناری بۆ بنێرێت، ئەویش بە زمانی سووتاوی وەڵامی ئەداتەوەو:
- لە پێناوی چی؟.
هەرکە تۆزێک هێور بووەوە واریقاتەکەی بە کاملی بۆ. دەور کردەوە:
هاروهاج ئەبێت و یەکسەر ئەمری قەبزی بۆ دەرئەکات.
- بێنێک لەبەرخۆیەوە کورەکایەوەو:
- من زۆر لەبەری پاڕامەوە پێموت:

- من ئەبمە کەفیلی هێنانی پارەکە و لێیوەرنەگرتم و وتی:
- ئێمەگیانی خۆمان لەپێناوی سەرکەوتنی شۆڕشدا تەرخان کردووە، کەچی خائینی ئاوا. پارەی لە ئێمە چاوەو، وەڵامم بۆ ئەنێرێت: «لە پێناوی چی؟. ئ.هـ بۆ ئەوەی چاوی هیدیکەی پێ بشکێت و گووی ئاوا گەورە لە ئاستماندا نە خورێت پێویستە بتۆپێندرێت».
بێ ئەوەی هۆی نەناردنی پارەکەی لێو بکەوێت.
بە ئاخێکی کەسەراوییەوەی گوت.
- واتە لەسەرماڵی خۆی و بەبێ مەحکەمە؟.
- بەڵێ ئەوە یەکەم کەس نییە لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی دواییدا دوو سێ کەسی ئەوهایان لەسەر پارە نەدان بێ مەحکەمە کوشتووە.
- «ئ.هـ کەواتە ئێمە بۆ لۆمەی کاربەدەستانی داگیرکەر بکەین. کەرمدا بە کەرێ هەردوو چاوی دەرێ».
سەری قاری دەمێک باداو:
- بەڕاستی ئەوە کردەوەی پێشمەرگایەتی نییە و نێوان ئاسمان و ڕێسمان لە ڕێبازی کوردایەتییەوە دوورە.
حەمە ڕەحیم لەسەر دوانی ناخییەوە بەردەوام بوو و:
- بۆیە دڵنیام ئەگەر بێتوو بەشێوەیەکی ئامۆژگاریی بەڵگەداریش ئامـاژە بۆ دەهـۆڵ دڕان و هەڵوێستە چەوتەکەیان بکەم:
- ئەوەی ئێوە دەیکەن کوردایەتی نییە گورگایەتییەکی سرفە، بۆی هەیە بە نوێژی نیوەڕۆ پەلەواژەم بکەنەوەو ئەوجا لە دام و دەزگا ڕاگەیاندنی چەقاوەسووەکەیاندا ڕەنگە فرمێسکی تیمساحانەشم بۆ بڕێژن و:
- ئای.. لەو خەسارەتەی بەلەناوچوونی ئەو پیاوە مەزن و خێرخواز و گەل پەروەرەی ناوچەکەمان لێکەوت، یاخۆ هەر نا بمکەنە چاشکە

قـوڕەی کەلـک تەنەگـە داری ئاخـری زەمـان و بـە پلووکـە بـەردی نەفرەتـان رەجمـم بکـەن.
ماوەیەک سەری خەمانی باداو:
- ترسیشـیان کردووەتـە مۆتەکـەی سـەر سـینگان و لـە ڕووالّەتیشـدا، لـە ئاسـت بیروبـاوەڕی خەڵکـە سـاویلکەکەی دەوروبەریـان قەپاخێکـی کوردایەتـی زۆر مکوومیـان بەسـەر پاشـەڵە تەڕەکەیانـدا داوەو:
- ئەمـرۆی حـازری هیـچ هێزێـک، چینێـک لەسـەرتاپای کوردسـتاندا کوردپـەروەرەی وەک ئێمـە چـاوی هەڵنەهێنـاوە ئەوهـا دڵسـۆزی کوردایەتـی بێـت.
بۆیـە لـە تاسـای کەسـی ناوچەکـە دا نییـە تەکانێکـی بـە ئاسـتەمیش لەخۆبـدات، یـان بـەزار پرتۆخیـان تەبـەڕا بـکات. ناوەلـلا لـە تاسـای کەسـدا نییـە.
ئازادییەکـەی لـێ بووە بەندیخانـە و دنیـای بـە جارێـک لێوێـک هاتـەوەو نەیدەزانـی شـەو و ڕۆژچییـەو و لـە هەنـاوەوە هـەردەم دەکوڵـێ و فرمێسـکی درشـتی کـە سـەرانی بـۆ نەتـەوە لێقەمـاو و بێدەرەتانەکـەی دەبارانـد و:«
- ئـ.هـ خەڵـک نەخـۆش کەوێـت دەچێتـە سـەر «ئۆمەرمەنـدان». ئـەی گریمـان ئۆمەرمەنـدان خـۆی نەخـۆش کەوێـت دەچتـە کێنـدەر خوایـە!».
کەچی دەسەڵاتی نەبوو لای منداڵەکانی خۆشی بەرگری بکات و:
- چـۆن دەزانـم ئاسـمان لـە سـەرەوەمانە و حەوجـە بـە پەنجـە نـاکات ئەوهـاش دەزانـم هـەر بدەرێنـم ئیشـم بـێ قەیـد و شـەرت و مەحکمـە تـەواوە.
پێشـتر لای وابـوو، ئـاو و هـەوای دێیەکـەی پێچەوانـەی ئـاو و هـەوای شـار ئـازادن. کەچـی بـۆی کەوتـە سـەر پشـت بەنداتـی تەنیـا بەرهەمـی

کاربەدەستانی زۆڵ و ئومی و بیرتەسکە و بەس:
- تاکو شێخ و سەرەک هۆز. ڕابەرمان بن ئەمڕۆ جەژنمانە.
سەت خۆزگەی دەخواست هانای بۆیانی نەهێنابووایە و هەر دووراودوور دەنگی دەهۆڵیانی گوێ بیست بووایە».
- پشووی ئومێدمان بە هەندێ خۆشە هەتا پێشمەرگەی کوردستان، یان نەمانمان بەشاخەوە بن».
کەچی:«
- من لە هەڵلادانەکە پەشیمان نیمە. ناوەللا پەشیمان نیمە. ئ..هـ لە دنیادا نەزاندرێت. «بەرەی ڕووتان» تۆڵەی خۆیان کردووەتەوە، چبم لە قیامەتە. بەڵام هاتنی لای ئەو دڕندانە پشتمی شکاندووە و دوورکەوتنەوەش لە شارە ئازیزەکەم هەر نەبیسە».
دوای بیرکردنەوەیەکی درێژدادڕ، لە ناخەوە بایداوە لە بۆچوونەکەی خۆی و.
- نا..نا. بریا زووترم بناسیبوونایە!. تاسەلاواتم لە ناخەوە و بەهەموو شێوەیەک لەسەر مەزناتیانم نەدابووایە.
- بیروباوەڕ و هەست و سۆزم ئەو چەند چەکدارەی ناوچیا و شاخانن. گیانی خۆیان کردووەتە قوربانی ئازادی و سەرفرازی ئێمەمانان.
کافر بە خێراخۆی ناچێتە دۆزەخەوە. ناچار لە ترسی گیان و شەرەف و چەشنی مەڕی ئاوگەلە، ماخۆی هەردەم لاگر بگرێت. ئەو حەمە ڕەحیمەی وا لە سەرو توندە تەبیعەت کە هەردەم لە ڕاست شتی ناحەق لە باوکی خۆی قەبوول نەدەکرد. تا لە ژێری باری بەعسی دڕندە و داگیرکەرەوە، لە ئەحمەدە گولەی هەولێریی دانەدەهێناو:«

- چاک بۆخۆت تێ بگە من ئەو خەڵکە نەفام و تووڕ تورە بە جۆیەی دەورەبەریت نیمە: هەرچی لە زارت دەربێت توتیانە بڕوات پێبکەم. خوام لەو خوایەیە زیانێکم پێدەگەیەنێت ئەوجا خۆت دەبینیەوە!».
وای لێهات لەم بارەیەوە بە نەقیزەش نەیەتە گۆ:«
- ئاو و ئاگر و دڕندە هەرچەند لێیان دوور بێت گیان سەلامەت دەبێت».
هەتا بۆشی بلوابوویە:«
- بۆ ئەوەی تووشم بە تووشی ئەو دیمەن شێرو دەروون ڕێویانە نەبێت، باخۆم لەگەڵ خەڵکە بێگەرد و ساویلکەکەی ئاوایی شەکل بکەم».
تایبەت لەگەڵ دراوسێ و دۆستی نوێی «مام رەمەزان».
جوامێرێکی کارامە و لێهاتوو. ..کورتەباڵا و تێکچەقی و کەپوو بە رانانی کەمێک سەرەدەرەی لە خوێندنەوە دەردەکرد:
- بەڕاستی جێی بڕواومتمانەیە!.
حەمە ڕەحیم ئەوانی تەرزی خودی خۆی دەناسین:
- گلاوی وەک خۆیان نین و کەم و زۆر کەلکی دار تێوەردانیان نییە. نەخاسمە لەراست ئەو کەسانەی سەر بە کۆریتی خۆیان نەبن لایان وایە کافر و زەندیقن. جگە لە دەرخستنی هێزی چەک و ئیهانەکردن چیدیکەیان لێرەوچاک ناکرێت.
بۆرە شکێکیان کەوتبوە سەری و:
- وێدەچێت کۆنە جاش و سەر بە ئیستخباراتی بەعس بێت.
تەواو دڵنیانەبوون و هەردەم سایەدی جم و جوڵی بوون و بە چاوی غەزەب و دڕدونگییەوە سەیریان دەکرد و لایان وابوو باوە

كوشته‌یانه. كه‌چی نیمچه هه‌نجه‌تێكیان له‌م ڕووه‌وه لێده‌سگیرنه‌ده‌بوو دڵیان له‌ناسنی ناخی ده‌روونیه‌وه سه‌قا بدات. نۆبات له خافڵه‌ت و ناكاوییه‌وه به‌روباخه‌ڵیان، بێ په‌رده بۆ هه‌وییه‌ی جاسووسی ده‌پشكنی.

ئه‌ویش له بێده‌سه‌ڵاتییه‌وه، له‌ناخه‌وه ده‌یپرتاند و:«

- كه‌رم گایه وه‌نا!؟، یان به‌عسیم و نیشتمانتانم داگیركردووه‌؟، یاخۆ به ده‌سته من خاكه‌كه‌تان كراوه‌ته چوارپارچه‌ی له‌یه‌كتر جیا»!.

ئه‌وسا كۆڵی دڵی خۆیان، كه ئازاردان و كوشتنه پێداڕێژن. هێنده جار خواستیان بوو ختوخوڕا، بێ مهانه داركاری بكه‌ن:«

- گریمان به ئه‌ندازه‌ی بانگۆڵه‌یه‌ك تاوانی نه‌بێت به‌ڵام سه‌گ هه‌ر سه‌گه و گڵاوی لێده‌رناچێت».

له ترسانا بێ خوایشتی حه‌زیه‌وه خۆی به بردنه‌وه‌ی غه‌رێفێ فس ده‌كرده‌وه:«

- با له‌گه‌ڵ سه‌یان نه‌كه‌ومه چاڵه‌وه».

مسۆگه‌ری بوو به په‌ندی ده‌به‌ن.

ڕۆژ نه‌بوو نه‌یده‌نه به‌رتانه‌و ته‌شه‌رانه‌وه.

- گوایا نزیكه‌ی (٣٠) سی ساڵه مامۆستایه ئه‌وجا مێشكی هیچ شتێكی وه‌رناگرێت.

- كوره مێشك وشك و شت وه‌رگرتن كوجا مه‌رحه‌با.

- خۆزیا هه‌ر مێشك وشك بوایه!. هه‌ڕه‌ی له به‌ڕه‌ی پێشكه‌وتن ده‌رناكات.

- هه‌ر به عه‌قڵی سه‌له‌فییه‌ت و عه‌شایه‌ری و كۆنه‌په‌رستی لێده‌خوڕێت.

- «به‌ڵێ ڕاسته هه‌ر به‌و عه‌قڵه‌ی ده‌ڵێن لێده‌خوڕم و هه‌ڕه له‌و پێشكه‌وتنه ده‌رناكه‌م كه‌وا ئه‌مڕۆ درووشمی به‌رزی جه‌نابتانه.

- درۆم بـۆ دەرمانیـش لا چنـگ ناکەوێـت و لەنێـو کۆریتـی سـاختەو تەڵەکەبازیـدا نـە ژیـاوم و قەتیـش وەک ئێـوەی ئـازادی پـەروەرو پێشکەوتووخواز چاوم نەبڕیوەتە و ناشبڕمە نامووسـی ئـەو کەسـەی کـە بـەدڵ و داو خزمەتـی کردبـم!».
- بنی قسەت هێنا.
«مرۆڤایەتـی و کوردایەتـی و خزمەتـی میللـەت و پێشکەوتن لای ئێـوە گومـڕا کوتـەک و داپەلۆسـینە دەرحـەق ئـەو کەسـە بێدەسـەڵاتانەی کـە حـەق و ڕاسـتی متووی زاریـان بـن هـۆ بابینـە».
- خـوا بۆمانـی چـاک بـکات: ئـەو جـڕو وجامشـتانە ڕۆشـنبیریی ئەمڕۆمانــن.
«بەمەزەبتـان نـەک هـەر جڕوجامشـتین، بگـرە جاشـک و کۆلکیـن و دژایەتیمـان واجبـی سەرشـانتانە».
- بـەس وا بەهـۆی ئـەو ڕێبـازە پیـرۆزە و شۆڕشـە مەزنـە نوێیـەی ئەمـڕۆ گرتوومانـە.......
- «ئـەوەی دەڵێـن هـەر لـە زاری خۆتانـەوە بـەر گوێمـان دەکەوێـت و بـەس.»
- ئەستێرەی ئەو نەوعە کەسانە، بەرەو ئاوابوون ئەخزێت..
- «نەخێـر شـەکرتان شـکاند، ئەسـتێرەی ئێمەمانـان بـە ئەژدادیشـتان ئـاوا نابێت. ئـ.هـ ئێمەهێزی میللەتیـن کەینـی بەچـاو بینیتـان، داروبـەرد لـە کوردسـتاندا نەمـان ئەوسـا ئەسـتێرەی ئێمەمانـان ئـاوا دەبێـت».
- کوێرە چیت ئەوێت؟. دوو چاوی ساخ.
- ئەوانـە لـە بیروباوەڕی ئێمـەی شۆڕشـگێڕدا هیـچ حسـێبێکی ئەوتۆیـان بۆ ناکرێت و.. وەک ئـاژەڵ سـەیر ئەکرێن.
«ئـ.هـ بەزاتی خوابەس لەمەڕاست دەفەرموون».

- لەمەی فەرمووت شایەنی هیچی تر نین.
شـوان لاوێکـی کاپێلـک ئەسـتوور و بـەوەج و تونـد ڕەویـان قسـەی خـۆی تێئاخنـی و:
- زۆر جـار مـن کـە ئەبینم لـە مزگـەوت نوێژی دابەسـتاوە، بـە ئەنقەسـت بـە پێـڵاوەوە ئەچمـە سـەر حەسـیرەکەی پێشـی و لنـگ لەسـەر لنـگ کتێبـی مارکـس و لینیـن ئەخوێنمـەوە، کەچـی ئـەو قوڕەمسـاخە وەک بزانێـت لێـی لـە هەنجەتـم مرتـەی لەخـۆی ئەبڕێـت
« مرتـە لەگـەڵ کـێ بکـەم کـە نەزانێـت گفتوگـۆ.. و هەسـتی مرۆڤایەتـی و ڕاسـتی ڕوویـان لـە کیهـان لایـە».
- منیـش خـۆ. لـەو گـۆڕە دایناپەلۆسـم، ئەوسـا عـوزرم لـە قەباحەتـم گەورەتـر ئەبێـت و:
- :«ئەگـەر هەسـتتان بـە قەباحـەت بکردبووایـە ڕۆژمـان قـەت بـەو ڕۆژە شـوومە نەدەگەیشـت».
- ناڵێـن کابـرا بـۆ بـەلاش، بـێ ئـەوەی زاری لەگەڵـت بگەڕێـت بـە گـژ ئـەو پیـاوە ڕیـش سـپییەدا ئەچێـت؟.
«ڕەنگە جەنابتان مردووی ئەوتان و تەشەرانە بن!».
بەتەوسەوە لە دڵەوەی گوت.
- زۆرجـار یەختیارەکانـی ئاوایـی، کـە مـن بەبـێ عەقـڵ و دواکەوتوویـان لەقەڵـەم ئـەدەم....
«ئەو فەرموودەتان تەنیا بیروبۆچوونی خۆتانە و بەس».
- کوڕە ئێوە حەقتان بەسەر ئەو یەختیارە هەژارە چییە؟.
- ئاخـر پێمـان ناڵێـن، تاوانـی چییـە؟. هەرلەبـەر ئەوەیـە کـڕ و بێهەسـت و خوسـتە و مەگـەر نۆبـات ئەویـش لەقسـەی حـەق بەمـلاوە لـە زاری دەرنایـەت.

«ئاخر ئەو حەقەیە بەری ملتان دەگرێت و نایەڵێت بە ئاواتەکەتان، کە سەردانواندنی ئێمە مانانە بگەن!».
- بە بۆچوونی من ئەو و ئەوانەی ئاوایش هیچیان مافی ژیانیان نییە.
لە دڵەوە منگاندنی و:«
- چاکە جەنابت وا دان بەراستی بۆچوونی دەروونتەوە دادەنێیت و خیلاف لە قسەکانت نییە. ئەوەی کڕنووش بەری یەک لە داگیرکەرانی کوردستان نەبێت و ساڵە((........ ........))کەی بەبیریەوە بێت مافی ژیان نییە».
تەنیا مام ڕەمەزانی بەدەستەوە بوو..و جاربەجار ئاخ و ئۆخی دەروونی لاهەڵڕێژێت:
- گریمان ئەو پیاوە ڕەوشت بەرزە نەبووایە بەو چەند ڕۆژە بەجارێک دیقم دەکرد.
- قوڕ بەسەر ئەو میللەتە کەساس و خێرلەخۆنەدیوە ئەو عەلۆ و جەلۆیانە پێشڕەوو رابەری بن بۆ دەرمانیش هەستی بەزەیی و مرۆیایەتیان لاشک نابردرێت. تەنیا بەهێزی چەک و چەقاوەسوویی یەوە وا خۆیان بەسەریدا کردووەتە فس فس پاڵەوانی مەیدانی خەباتی کوردایەتی و خۆیان گوتەنی:« هەڵگری چرای دواڕۆژی گەل ونیشتمانن». بێجگە لە ئەوەی نمەکی هەرماڵێک بکەن چاو دەبڕنە ناموسی. لە نیوەشیان زیاتر لە ترسی عەسکەری ڕێی نەهاتا پەنایان بۆ ئێرە هێناوە. نەک هەستی نەتەوایەتی.
- زۆربەشیان لە کۆڕی ژیان و خوێندندا فاشیل بوونە و سەرکەوتووە هەرە مەزنەکانیان، کە بەدەگمەن پلەیەکی خوێندنیان وەدەست هێنابێت ئەویش دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی و بازرگانییە.

- بەڵێ راست دەفەرموویت، لەجەهلی مورەکەبدا دەخولێنەوە و ئەوجا خۆیان ئەوەندە بەپێشکەوتووخوازحسێب دەکەن، لایان وایە بێجگە لە خۆیان کەسی تر لەسەرتاسەری کوردستاندا شک نابردرێت.
- پێشکەوتن و شارستانییە تە لایان ئەگەر بە هەموو هێزیانەوە دژایەتی داب و نەریتی میللەتی خۆیان بکەن.
- خوێن ڕشتن و لەوەڕان لەسەر ورگی ڕەش و ڕووتی میللەت و بەرگری نەکردن لە تاوان و بەد ڕەوشتی و بەرەڵلایی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشەوەیان دەبات و لە کۆنەپەرستی و عەشیرەتگەری و عەمالەت دەربازیان دەکات. ئـ.هـ خۆ جێی چاویشیان تێدا نییە ڕۆژێک دابێت بگەڕێنەوە و دەست لە ملی بەرژەوەندی نەتەوەکەیان وەرێنن.
- بەسەر بادانی ناڕازییەوە:
- ئەو جا وەرە لەگەڵ ئەو کۆرە بژانە کە بەزۆر دارەکی گەرەکیانە بە میللەتی خۆیان بسەلمێنن تەنیا پەلامیزی سەرکردە کوردکوژەکانیان، بێ ئەوەی ئاورێک لە «.......» تەمەن درێژیان بدەنەوە، کوا بۆنی کەلاکیان لێوەدێت. داهێنانە مافە. ئازادی و مرۆڤایەتی و رزگارکەری کوردستانە.
- هەتا ئەورۆژەی هەریەکەیان جاشی داگیرکەرێک بوون، وەک گورگی دەشت و بەنێ بەناویەکتر وەربوون و هێرەیان بە کوشتن و شەرەف و هەڵوێستی یەکتر دەکرد. لە مێژووی سەرهەڵدانی مرۆڤایەتییەوە تا ئەمڕۆی حازری هیچ دوژمنێک بە دوژمنی بابە گەورەی خۆی نەکردووە.
- وێڕای دیل کوشتنی بێ مەحکەمە، خانووی یەکتریان دەسووتاند و کەس وکاری یەکتریان دەگرت و باجە پێشمەرگایەتییان دەستاند و هەتا نایلۆنیشیان لەسەر جەستەی حەپسان تواندووەتەوە.

- ئەوانەی دەڵێیت لای عەرەب و عەجەم ئاشكرانە.
- دوژمن زۆر تاوانی، كە دەرحەق میللەتی كوردی ئەنجام داوە و دەیدات لە ئەوانەوە فێربووە.
- بەڵێ قسەكەت خیلافی نییە و بەڵگەش ناوێت، بەڵام پیاو ناوێرێت لای منداڵی خۆشی بدركێنێت.
- ئـ هـ ئەوەشمان «دروشمی حیزی و سەلامەتی» لە نەگبەتی قورپبەسەرییە.
- گرتنی كەس وكاری پێشمەرگان لە ((........)) و((........))و زۆر شوێنی تر دوژمنیان لەو ڕۆژەوە فێر كرد.
نەیدەویست لێی بگرتەوە و هەر لە ئەمیشی ڕادەدیت هەمبانەی ناخی بۆ هەڵبڕێژێت. بەكەپوو فن كردن تۆزێك لەسەروسەكوتی ڕووانی.
- كاتێك سامۆتەی داگیركەرێكیان توورڕ هەڵدا برایانە و جاشانە سەری تەوازوویان بە یەكەوە، بەبێ پاداشتی نانێكی سووتاو دڵسۆزانە بۆ داگیركەرەكەی دی لاركردەوە، واموویان بە نێوانەوە ناچێت.
- نەك هەر موویان بە نێوانەوە ناچێت سوێند ئەخۆیت قەسابەكانی گۆرینی یەكتر نینە.
- كەچی لەبەر ئەوە درووشیمان كوردایەتی ڕاستەقینە نییە بۆیە لە ڕاست یەكتر هەر زگ ڕەشەكەی جارانن و هەر هەندیە، كیان قیبلەی كڕنووشی جاشكاتی گۆڕی بە شەوقەوە دەگەڕێنەوە ناو زەلكاوی خیانەتی ساڵەهای ساڵیانەوە.
- حاڵی حازر بەناچاری و چاو بەرەو ژێرییەوە، بێ پەردەی شەرمەوە دژی ئەو هەڵوێستەی كە لەسەری داروەدستەكەی خۆیان

پەروەردە کردبوون و مێشکی خەڵکە بێ سەواد و کەودەرییەکانیان پێ زاخاو دابوو:«
- تاکو کێرمیزی ئەم جۆرە بەرهەڵستکارانەمان لەسەر خاکی کوردستاندا نەبڕێن ئێمە هەرگیز بە ئاوات ناگەین»، وەستان.
- من هەزار کەڕەتم گوێ لێبووە، تا لە بڵاوکراوەکانم خوێندووەتەوە.
- بۆ فریودانی نەتەوە کلۆڵەکەی خۆیان هەتا پتر لەسەر ورگیان مشەیان بێت «بەرەی نیشتمانی و برایەتی» یان دەقەبەڵ ڕێککەوتنەکەیان کرد.
- کەچی لە ڕاستیدا بەرەی خاتروخوتری چاوی بەڵەکی یەک لە داگیرکەرەکان بوو.. و بەس.
- جوانی بۆچوویت. ئەگینا کەسەکانیان کەمێکیان لە قسە تەڕاوزوو..و جوێن دەگرتەوە. هەتا ئێمە مانان ناوی بنێین «بەرەی نیشتمانی».
- وێڕای ئەوەش لە گەورە و گچکە و چەپڕەو و ڕاستڕەو و نەتەوەپەرست و سۆسیالیست پەروەر و شێخ و ئاغا و دەوڵەمەند و هەژاریان بپرسن: لە چ ساڵێکدا، لەچ ڕۆژێکدا چاکەیەکیان بۆ سونەتیش بەنێوچەوانی میللەتەوە ناوە، بێجگە لە زەرو و زیان.
- کاکە ئەوە وتنی ناوێت، جگە لە زار و بەڵێندانی درۆ بەمڵاوە چیتریان لە خورجەدا نەبووە و ناشبێت.
- خۆزگە هەر زارەکەیان بووایە!. بە کردەوە بەریان نەهاویشت بووایە!.
- ئەوجا عەمالەتی داگیرکەری هەردوو دیویان، بە شانازییەوە کردووەو دەشیکەن.
بەمەزەبیان بۆمانەوەیان بە عەیب لەقەڵەم نادرێت.

* * *

- بۆن دێت.
- بۆنی ڕەشەبای وێران دێت.
- بۆنی گەردەلوولەی دمۆر و شووم و زریانی وەیشوومە دێت.
- بۆنی ئەنفالی بێگاان دێت.
- بۆنی ئەنفالی داگیرکەران دێت.
- بۆنی ئەنفالی دۆستە دڵسۆزەکەی دەولەتە ئیشتیراکییەکان دێت.
- بۆنی ئەنفالی عەرەبی داگیرکەر دێت.
- ئەنفال ئاوقای میللەتێکی نەدار و بێ خاوەن دەبێت.
- ئەنفال پرکێشی نامووسی کوردان و موڵک و سەروەت و سامیان بۆعەرەبان حەڵاڵ دەکات.

دوای وەستانی ئاشی شەڕەکە زلهێزی ئەم دیوە لە چەند لاوە. وا تەنگ بەناوچەکە هەڵدەچنێت و پەردەی گوێی سەرباز و عەشیرەتە عەرەبەکانی دەوروبەر دەسمی:

- ئەوەی بنیادەمە ورد و درشت و نێر و مێ پەرێز پاکژی، لە پاداشتی پێش قەرەورەکاندا دەخرێنە ژێر بەرداشی زندەبەچاڵی سرگومەوە.
- عەشتەبای زندە ماڵ و مردەماڵیش ناهێڵدرێن دەفرێندرێن.

ئەمانەی باسکران بۆ ئەوەی میللەتی کورد ورەی برووخێت ڕژێم لە نەشرەیەکی تایبەتدا، لە دەڤەرەکەی بڵاوکردەوە.

زۆربەی خەڵکی ئەو گوندەی حەمەرەحیم لێیگیرسابووەوە سەرەدەریان لە مانای ئەنفال دەرنەدەکرد.

* * *

- ئەرێ ئەنفال چییە؟.
- ئێمە چوو زانین چییە.
- بە خۆیان نەبن کەس نازانێت.
لە هەوەڵەوە بە ئەو دەنگ و باسەی لە شارەوە ڕاهاتبوو.. و ڕەمەزان دەوری کردەوە و هیچ پێ قولاخ نەبوون. کەچی ئەو هەر کەبیستی:
- یاللا خێرا!. هەر خوا بۆمانی چاک بکات!.
بەپێوە بوو. و لە شروان تاسان دەستی بەسەرداگرت و هەناوی قاپانده بار یەک و ڕەنگی دەلحاز پەڕی و چاوی کەوتە دنیای ڕەشکە و پێشکەوە و سەیتەرەی لەسەر لاقەکانی نەما. کەوا هەڵبەز و دابەزیان بوو..و ئەژنۆکانی ماوەیەک تەق تەق بە یەکتر دەکەوتن:
- ئەی هاوار هە پیشە شە ش میللەت وا لە خۆی نییە ئەوجا ئەو نەهامەتییەشی تووش ببێت!.
پاشدان شل و بوون نووشتانەوە. بە ئاخەوە:
- خوا هاوار و خوا تۆبە!. دەبێ عەرەب چمان بەسەر بێنن!؟.
- چمان بەسەر دێنن؟. بەیەکجاری مەفحمان دەکەنەوە. وا دەکەن ئەوەی بە «خوبز» بڵێت «نان» لەناوچەیەدا جارێکی تر نان دوو لەت نەکات. ئا. ئەوهامان لێدەکەن.
دوو بەشی بەمە پسابوو.. و لێی ڕوون بوو:
- بەعس هەر تاوانێکی بە خەیاڵدا بێت، بێ بەزەیی یانە ئەنجامی دەدات و:
- ئەوانە دێوو جنۆکەی هەڵەت و کێوانن و پێویستە لەناو بچن، ئەگەرنا ئەنفالی خۆبە خۆیی لەنێو میللەتی موسڵمانان کوجا مەرحەبا!.

- زرینگ و هۆڕی مێشکی بووە ژانەسەرێکی بە حوجەت، ناچار هەردوو دەستی بە دەم و چاوییەوە گرت و هەر چەندی کرد و کۆشا توانای هەستانەوەی نەبوو:«
- شەو دەڕوات و ڕۆژ دەڕوات، قەزا و بەڵای لابەلا ناڕوات».
ئەوانەی لای بوون خۆیاندایە بن هەنگڵی و قیتیان کردەوەو بە لاکەلاک گەیشتەوە ماڵ.
- هاوار لە خۆمان ماڵوێرانی!.
شەو و ڕۆژێک، بێ تفەڕکی زاد لەسەرچاو کەوت و هەناوی مەشکە ئاسا دەهەژا و هێڵنج بەهیچ کلۆجێکەوە بەری نەدەداو:
- خۆزگە نەدەگەیشتمە ئەو ڕۆژە ڕەشە!.
سوڕ دەیزانی ڕژێمی داگیرکەر ئەو بەڵایەی تووشی خەڵکی دەڤەرەکە دەکات و هێزیش نییە لەم ڕووەوە بەرەنگاری ببێت.
- ئەگەر هێزمان هەبووایە ئەنفالمان تووشی نەدەکرا.
ڕەمەزان لە بن و بۆتکەوەی نەخۆشییەکەی گەیشتبوو...و نەک تێک چوون بگرە هۆشیشی لە کەللەی سەری فڕیبوو..و چرۆچاوی گرژی وا زۆر لەو خراپتر، کەچی وەک ئەو ورەی نەڕووخابوو.
- دەردێکی گەلێک گرانە، بەڵام کە دەسەڵات نەبێت.
تاساشی بە هیچ جۆرێک نەدەکرد لەم بارەیەوە شەکرێک بشکێنێت، تەنیا بەپڕ هەڵمانەوە ئاخێکی هەڵکێشاو:
- چاک تووشی کونەڕەشەی خۆمان هاتووین، هەر خوا بۆمانی چاک بکات.
گورجی بێ خەبەر پاش بیست و چوار سەعات و گوراح هاتنەوە بەری بەخۆی نەوەستا و زاری کردەوەو:
- ئەرێ پیاوێژگە تۆ بە دەنگ وباسی ئەو ناوە عاجباتییە، ئەنفالە،

مەنفالـە مـردی و ژیایتـەوە و پێمـان ناڵێـت چیـە!؟.
«ئـ.هـ دەیەوێـت ئـەو مزگێنییـە خۆشـەی بدەمـێ». بـە دوو سـێ قلْپـی دریـژدادڕی لەسـەر یـەک گـەدە هەلاویسـاوەکەی نەختێـک دامـرکاوە و بەئاخێکـی دیکـەوە دەمێـک لەسەروسـەکوتی رەمەزانـی، کـە لەتەکییـەوەی دانیشـتبوو...و کنـی چـۆل نەدەکـرد نـواڕی و لـە ڕەنـگ ڕەش هەڵگەڕانییـەوە حسـیا ئەویـش مـردەی ئـەو نەگبەتـە نەگریسـەیە.
نەیویست ڕاستییەکەی بۆ هەڵڕێژێت:«
- با ئەویش پێ خەفەتخان نەبێت». جا گوتی:
- حورمـێ کارەکـی ئەوەنـدە مەکرووف و قـۆڕە هەرچەنـد دەکـەم دڵـم بەردەسـت نـادات بیدەرێنـم:
- گەلێک زۆر لە کارەساتی ساڵی کەر گێڕانێ دزێوترە.
گورجـی بردییـەوە هەنـاوی، هەرکـە دیتـی ڕەمەزانیـش لـە ڕەنـگ و ڕوویـەوە شـپرزاو دوو سـێ تنۆکـە ڕۆنتـک لـە چـاوە زیتەکانییـەوە زەنگوڵـەی:«
- قـوڕە شـینی دنیاییمـان بـۆ گیرایتـەوە و ڕۆژە ڕەشـی ئێمەمانانـی کـوردی بـێ پشـت و خاوەنـە»، بەقـەد ڕوومەتـە لۆچاوییەکانییـەوە بەسـتا.
لـە حەیفـان هەسـتاوەو کەوشـە لاسـتیقی قەیتانـداری کەرکووکـی بەچاشمیشـیەوە لەپـێ هەڵکێشـان و دەسـتێکی بـە هێواشـییەوە، بـە پاشـەلی شـەڕواڵە بۆرە خەتخەتـە سپییەکەیەوە، کـە بەهـۆی دانیشـتنی چوارچمکییـەوە، بـە لەشـییەوەی نووسـابوو، داهێنـاو لـە یـادی فـڕی خواحافیزیـان لـێ بـکات:«
- چاک ئەکەیت پێی ناڵێیت. با هەر من و تۆ پێ داخدار بین».
سـاتمەیەکی حێلـی خافڵەتـەوەی لـە عەتەبـە چـوار پەنجـە بەرزەکـەی

دەرگاوە کـرد و سـەرانگریّ بـوو. هەردووکیـان لەگـەڵ:«
- یاللا» لێوەهاتندا غاریاندایە و ڕاستیان کردەوە.
توانای زارگەڕانی ئەوساش نەبوو...و تەنیا:«
- چ نەبوو بەرەم دەن» نەبێت:
- چما لەخـەم و کەسـەران ئاگام لەخـۆم مـاوە؟. خۆزگـە گیانـم لەگەڵـی دەردەچـوو! نـەک ئـەم کارەسـاتە بـە چـاو ببینـم.
حەمەڕەحیـم لـە ڕەنـگ هەڵبزڕکاوییـەوە حسـیا: ئەوەنـدەی بـە ڕۆیشـتنەکەی ڕەمـەزان شـلەژا، ئەوەنـدە بـە خۆشـییەکەی نەشـلەژاو:«
- بـە ناخێری گیانمـان هانامـان هێنـا تـا کـۆ خۆمـان لـە دەمـی گورگـی بیابانـان قوتـار بکەیـن». بـە تەوسـەوە:
- تەڕ قوتار بووین!.
- پیاوەکە خەریکی چیت؟.
- تـا زووە بەدەسـت بەعسـی داگیرکـەرەوە لەنـاو نەچووینـە خۆمـان بگەیەننـە پێشـمەرگان.
بـۆ ئـەوەی لـەم بارەیـەوە پرسـیاری لێنـەکات و لـەو نەگبەتـە شـوومە بەشـدار نەبێت، کـە پێوەی دیـار بـوو هەنـاوی لـە هەڵبـەز و دابەزدابوو..و بـە ئەنقەسـت سـەری متـی بەخـۆدا شـۆڕ کـردەوە.
گورجـی لەدڵـی سـەقا درا کارەسـاتێکی یەکجـار دزێـوە، دوای پشـت تێکردنـی ڕەمـەزان، مەراقـی زانیـن هەراسـانی لێهەڵگـرت و:«
- ئیلـلا بیلـلا دەبێ ئەو ئەنفالـە کارێکـی زۆر قـۆڕی وەک نامـووس چوون بێت. ئەگـەر نـا پیاوی تایـەن ئەوها پێ تێکنەدەچوو. ودەشـیدەراند».
- پیاوەکە ئەگەر لە خۆمانی تێکنەدەین چ دەبێت؟:
دەمێک لە بچمی موورِ بووەوە و جا بە ڕوویەکی تەڵخەوە گوتی:
- بـە حەقـی خـوا یەکمـان بـە سـاغی نایێڵـن و پەلپەلمـان دەکـەن و

ئەوجا فرێمان دەدەنە بەر سەگان.
عاجباتییانە:
- حا. هـ.!؟.
- بەعس و حاومای ناوێت.
بەخۆی نەوەستاو بە هاتوچۆکردنی لەبەردەمیدا سێ چوار نۆرە ئەمەی دووپات کردەوە:
- چشتێ ئا..وا. بەهاوسەری خۆت نەڵێیت، ئەدی بەکێ دەڵێیت!؟.
لەسەر بەرزکردنەوەدا دیتی ڕەنگی لە سوان سوور.. هەڵگەڕاوە و بالاّی لەقار و خەفەتی سک سووتاندا تەواو داهاتبووەو حاڵەتی ئێستای لە کوێ و دوای گواستنەوەی، کە دەتگوت کەر ئەسپە و لە ڕۆییندا ڕنگەی پێیدەهات و کوڕی دەویست لە هەموو ڕوویێکەوە دایبووە ڕێنیتەوە، لە کوێ؟.
- تۆ زۆر خورت دیاریت؟.
- ناحەق نیم.
- پێم ناڵێیت؟.
- لەوە زێتر لە کارەکەرییەوە بوومە خاوەن ماڵ و مێردی خۆم.
کەیفی زۆر پێهات و خاتریشی زۆر دەگرت. خۆشی و ترشی:
- ئەلحوکمولیلا:
بە ملیدا هات، لە سیری هەتا پیازی بەڕێکی لە مست بنێت و بە هەوگی تەژی گریانەوە:
- ئەوجا خۆ حاڵی بوویت!؟.
ماوەیەک لەناخەوە گینگڵەی پێدا و لەهەوڵەوە، بەشڵەژانەوە بۆی ڕووانی، پاشدان لەگەڵ شەپ دانێکی قاییم لە شلکەی ڕانە چرچەکانی و قووناو قوون تەپەی هات و مازرچە، لە کۆنا زەرد

هەڵگەڕاوەکانــی خــۆی بهێنێـت و:
- ئەیڕۆ، سەراو قەت کەسمان نەما چما ئەنفال ئەو قەباحەتەیە!؟.
«بەڵـێ، لەبـەر ئـەوە دەسـکردی بەعسـی داگیرکـەرە لـە هەمـوو قەباحـە دنیاییێ قەباحەتـرە».
- کەواتــە بــۆ ئێمــە مانانــی کــوردی قوڕبەســەر ســاڵی کەرگیرانێکــی دیکەیــان دامەزرانــدووە.
- هەزار خۆزگە بەو ساڵە کات!.
ئەمەی بە ڕوویەکی گرژەوە گوت.
ئیـدی زاری گیـراو مرتــەی تـری لەبــەروە نەهــات و چەشـنی نـاوک کەوتـن بێـلات و جووم دەمێـک بـۆی ڕووانـی و پاشـدان خشـییە ژێـر پێخەفـەوە ولاتــە عەردێکـی گـرت و:
- یاخـوا بەخێـر بێیـت سـوورە گوڵـی باخـان هـەر تۆمـان مابـوو لـە ژیانـدا!.
قاروکەســەر لــە هەنــاوی پەنگیــان خــواردەوە و مــا لــە دەروونــەوە بکورکێتــەوە:
- بەناشـکوری ناڵێـم ئێرەشـمان لێبـوە دۆزەخ، ئـ هـ ئەوجـا قـوڕی کێنـدەر بۆخۆمـان بگرینـەوە و سـەر بـۆ چ لایـەک هەڵگریـن خوایـە!.
بووک و کچە عازەب و کوڕەکەی خراتر بوون و:
- کافرستانی ئاوامان، بە تووڵی عەمرمان نەدیتوە!.
- بەڵێ نەماندیـوە، بـەڵام تـا لـە ژێـر دەسـتی عەرەبـی داگیرکەردابیـن و ئـەو خوبـزە چەمووشـانەش ئـاڵای گورگایەتـی هەڵشـەقێنن حاڵمـان مسـۆگەرە و حەوجـە بـە بەڵگـە نـاکات خراپتـر دەبێـت و کارەسـات و کافرسـتانێتی ترمـان زۆر دەقەبـەڵ دەکرێـت.
گریـان لـە هەوگیـان گیـر بـوو...و نەیاندەزانـی ئەنجامیـان بـە دەسـت

ئەنفالـەوە بـە چـدەگات. تەنیـا ئەوەندەیـان دەسـەڵات بـوو بـە چـاوی پڕ بیـم و شـڵەژانەوە سـەرنجی بـدەن. ئێـ هـ بەڵکی پێش کار لـە کار ترازانـێ تەکبیرێـک، چارەسـەرێکی رزگاربوونیـان پـێ ببێژێـت.

- ئەدی خۆ. هەر ئەوها دەست لەچۆک وەرین ناوەستێت!.

تـا ئـەو سـاتە گـوڕی هاتبـووە بـەرو بـەڵام خـەم و قـار ئاوێزانـی بـوون و شـلەژانی منداڵەكانیشـی سـەربار، دەیزانـی دژی ویسـتی چەكدارەكانـە و زۆر خراپیـش بەسـەریاندا دەشـكێتەوە. كەچـی هـەرزوو تخـی لێكـرد و بـە پێویسـتی سـەرشـانی خـۆی زانـی:

- دەبێ هەرچۆنێک بێت تـا زووە و كارلـەكار نەترازاوە لـەو كارەسـاتە نەگریس و ناگەهانەیان قوتـار بكـەم.

هەرگیـز لـەم ڕووەوە درێغـی نـەكات و بەقـەدەر توانـا چنكـە پڕەیـەک بـكات:

- سوڕ دەزانم دواڕۆژ بەڵایەكی گەورەم بەسەر دێنن.

- گوێی پێنەداو:

- هەرچی دەبێت بە گونی بارگینم.

لەگـەڵ ڕەمـەزان مـاڵ بەماڵیـان، كـە لـە هیچێكیـان تۆتكەیـان نەگـرت و هەموویانـی حاڵـی كـردن و:

- كاری چاک بە خۆی دیارە.

- ڕاست دەفەرموویت.

- ئۆخەی خۆ دڵم مورتاح بوو!.

خەڵكەكـە ورد و درشـت، لـە شـرەوی تـەورات خوێندنەوەكـە، ڕژانـە دەرەوە و لـە كۆڵان و سـەرگوفەک و بەرماڵان وەک ڕۆژی حەشر تێک قژقـژان. كـەس بەكـەس نەبـوو...و هـەر بـا ...بـا بـوو پەكـوو پەكـووی لێقەومـان و خەریكـی مـاڵ پێچانـەوەو خـۆ تەیـار كـردن بـوو..و:

- هەتا زووە خۆمان لە دەمی گورگی ئەنفالی عەرەبان قوتار بکەین.
- ئەوە پێویستییەکی سەرشانی هەموو لایەکمانە.
ناحەقیش نەبوون، ئەوەی حەمەڕەحیم بۆیانی بە سۆزەوە دەور کردبووە، کە جێگەی متمانەیان بوو، بووبووە تەندوورێکی داگیرساوی دوورِ هەناویان و بە ئامان و زەمانی خوا دانەدەمرکاوە.
- دەبێ دەستوەکەرییەکی ژیرانە بکەین، ئەگەر نا بێگومان لەناوچەی ((........))و((........)) مان خراپترمان بەسەر دێنن.
- ئەوە گوتنی ناوێت».
گۆترە نییە و هەموو کەس خۆی لەبەر ناگرێت:
- بێجگە لە سەروەت و سامان ژن و خوشک و کچمان بکەونە بەر دەستی هەر سەربازێک، ئیسلام و گاور، عەرەب و عەجەم وەکی خێزانی ڕاستەقینە دەبنە حەڵاڵی و کەسیش ناتوانێت بڵێت:
- لەل.
لە داخاندا:
- تۆ خوا ئەوە کردەوە و ڕەوشتی بنیادەمانە!.
- نەخێر، بەڵان هەرکە گوترا:
- بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی دەبڕێتەوە.
- هەزار ڕەحمەت لە دایک و باوکت.
ئەمە وای کرد لە هەوەڵەوە دەست بە نەزیرۆک خوێندنەوە بکرێت و:
- ئەوجا ئەو قەباحەتە قۆڕە مابوو ناموسمان ببێتە حەڵاڵی جاش و وەلەکی نەدی و بدییان!.
- جا ئەبێ ڕژێمی بەعس ئەوەمان لەگەڵ بکات؟.
- ئا. بۆ ناکات؟.

یەکێکی تر بەوپەڕی بڕواوە گوتی:
- ئــەدی نەتانبیســتووە لەناوچــەی گەرمیــان و قــەرەداغ ئەنفالــی بەکارهێنــاوە.
- بەڵگــەی ناوێــت و لــە کونــی کارک ڕاســتترە. ژن و پیــاو و منداڵــی بەرمەمکانیشــیان ڕاپێــچ کردوونــە و دەشــڵێن:
- زەندە بە چاڵ کراون.

* * *

شێخ ســەدرەی ســەرکردە باڵابەرزێکی ســوور و ســپی و هەنــدام ڕێک و کەپــوو شووشــەیی، بــە بیســتنی هــار و هــاج بــوو...و چــاوی چــووە پشــتە ســەری و ســاتێک چییــە نەقرقــرا بەرەنــگاری نەبێتــەوە:
- هەتا من لێرە بم موستەحیلە بێلم سەربگرێت.
بــە مەزەبــی ئــەو دەڤــەرە ڕزگارکــراوە گشــت لەژێــر مەرحەمەتــی ئــەو دایــە و کــەس حــەدی نییــە کــەم و زۆر دەســت لەبەردەســتی هەڵبــدات:
- چــۆن ئەبــێ ڕەنجــی شۆڕشــی ئەوەنــدە ســاڵەمان بەفیــڕۆ بــڕوات و ئــەو خەڵکــە لــە ژێــر فەرمــان و حەمــدی ئێمــەی ســەرکردە دەربچــن.
بــە پێچەوانــەی هەمــوو دەســتوورێکی ژیانــی دەخەمڵانــد لێکــرا بــە بڵاوبوونــەوەی دەنــگ و باســێکی لــەلاڕا بارگــە تێــک بنێــن.
- هــەر ئــەو ئیهانەیــە مابــوو: کــەوا ئێمــە بــە خوێنــی گەشــی خۆمــان ئــەم ناوچەیەمــان ئــازاد کــردووە، ئــەو جروجامشــتە ناکــەس بەچانــە، وا بەحوکمــی ئێمــەی کــورد و کوردســتان پــەروەر قایــل نەبــن و حۆتــر حۆتــر بچنــەوە ژێــر بــاری بەعســی خائینــەوە. ئــ.هــ ئــەوە هــەر نەبــووە و ناشــبێت.
چەکدارەکانــی دەوروبــەری بــۆ پتــر خــۆ. ڕەپێــش کردنیــان وەبــەر گوێیــان هەڵــداو:

- هەموو لەمەڕسەری حەمە ڕەحیمە. ئەرێ وەللا هەموو لەمەڕ سەری ئەوە.
- ئاژاوەچیی وەک خۆی نییە.
- بە کرۆکەیە بە دایک و باوک.
- هەر سەرو گوێلاکی وێدەچێت.
- ڕەحمەت لە خۆت و شیرت لەگەڵ قسەی کردت.
- لەوەتی تەشریفیناموبارەکی پێی ناوەتە ناوچە ڕزگارکراوەکەمانەوە شەو و ڕۆژ لە پیلان و گێرەشێوێنیدا ئەخولێتەوە.
- زمان لووسێکی واشە، شەیتان لەخشتە ئەبات.
- بەراستی کاتی داپەلۆسینێکی باشی هاتووە.
- دارکارییەکی وا تا لە ژیاندا ماوە، پێ لەم بارەیەوە خوار دانەنێت.
شێخ سەدرە زۆر کەڕەت بە فیتیان هەڵخەڵەتابوو. وئازاری خەڵکە ڕەش و ڕووتی بێتاوانی ناوچەکەی گەلێک دابوو:
- ئەوانە خوا هەر بۆ ئەوەی درووست کردوونە، بە چەغە لێکردن داریان تێببڕدرێت.
پاشدان پەنجە گەستن دادی نەداوە و لای دۆستانیش سەرکۆنەکراوە و:
- حا. هە خەڵکانێک تاوانیان کەم و زۆر نەبێت چ خێرێکی خوایە ئازاریان بدەیت!.
گەرچی ئەو چەشنە تاوانە، بۆ ئەو کەلەبەرزی شێخانە و لە شۆڕشدایە و چەند کەسیشی لە پشتە، بەئاوی دەستنوێژ دەڕوات، بەلام لەدڵەوە هەرپێ قرس دەبوو. زەفتییەکانی شارەزای بوون: حالۆری نێو.. وەک خۆی نییە و هەر جارێ بۆ دامرکاندنەوەیی بوغزی، هەر زوو لە چرۆچاوی مچومۆڕییەوەی هەست پێدەکرا،

بلەز دەست نیشانی جێ ژووانێكیان بۆ دەكرد. ئیدی ((........)) بووایە، با هەر كوردستان لەژێر پۆستاڵی بێویژدانی دوژمنان بەردەوام بێت. تەقەی سەری دێت.

حەمەڕەحیم هەركە بەمەیزانی هاروهاج بوو:

- عاجباتی ئاخری زەمانە و لە مێژووی كوردەواریدا ئەو یەك: پێشمەرگە ببێتە((........))كەواتە ئەوانە مافیان بەسەر پێشمەرگایەتی نەماوە و بگرە((........))ڕەسمیە.

گەرچی باوكی پێشمەرگەی شەهیدی خۆیانە و هانای بۆ هێناوە و بەلایانەوە لەمبارەیەوە لایەنی حەق و شۆڕشی گرتووە، بەڵام بە بیروباوەڕی شێخەوە عانەیەكی سووتاوی نەدەهێنا..

- من ئەو گێلمە گێلمەیە نازانم و تاوانبار باوكیشم بێت ئازاری ئەدەم.

تەنیا لەم دوایی یەدا هەركە یارمەتی لە ئەحمەدە گولەی ئامۆزای بەدەست گەیشت و:

- ئەگەر لە گوێ و فەرمانی من دەرنەچن قانزانج دەكەن.

نەیدەویست بە هیچ جۆرێك لە ئاستیدا پێ خوار دابنێت و ملكەچی خواستی خوبزەكانی خۆی ببێت و یەكسەر بە گژی دابچێت.

لە زۆر كەسانی ئاڤایی پرسی:

- پێمناڵێن ئەو ناكەس بەچەیە كێیە ئەم ئاژاوەیەی ناوەتەوە.

ئەو ماوەیە، بەس چەكدارەكان هەوەستیان پێنەدەهات و:«

- بە بارەبار دیارە خەفیەی بەعسە».

ئەگەرنا جێگەی خۆی لەنێو دڵی گەورە و بچووكی خەڵكەكەی كردبووەوە:

- پیاوێكی باش و بە سەویەت و لاگری ئاژاوە و دووبەرەكییە.

تابـۆی بلوێـت زیـان بـە مێروولەیەکـی خـوا سـایی ناگەیەنێـت.
بەسەر بادانی دەغەزەوە گوتی:
- «ئـ..هـ ئەمـڕۆ لـە سـێبەری ئەوانـە بۆنـی کوردایەتـی و نیشـتمان پـەروەری، لەناوچەکـەدا سـڕاوەتەوە. تەنیـا پیـاو بـاش و خـراپ بەمەزەبیـان مۆدێلـە».
ئەمەی لە دەروونەوە بە تەوسەوەی منگاند.
کـردەوە بەناوبانگەکانـی بنەماڵەکەشـی خۆشەویسـتی کردبـوو...و ناتوندڕەوەکانیـش دڵیـان نەدەپشـکفت دژی هەڵوێسـتی خەڵکەکـە پێدابگـرن و:
- ئاخـر چ حەقێکـی رەوایـە، بەناوبانگتریـن پیـاوی ناوچـەی کەندێنـاوە هانـای بۆیانـی هێنـاوە و لـە جیاتـی ڕێـز و حورمەتگرتنـی دارکاری و ڕیسـوا بکرێـت.
بـۆ سـومعەی دێیەکەیـان لەبـار نییـە و لەگینـە هـەزار تـف و نەفرەتیـان حەواڵـە بکرێـت و:
- ئەگـەر بـە ئاسـتەم هەسـتی مرۆڤایەتیتـان هەبووایـە قـەت ئیهانـەی ئـەو بنەماڵـە تێکۆشـەرەتان نەدەکرد کـە بـە هەمـوو هـەوڵ و توانایـەوە دژی سـتەمی بەعسـی داگیرکـەر کۆشـاوە و هـاواری بـۆ ناوچەکەکتانـی هێنابـوو.
کەسـی دی کـەوا جێگـەی بـاوەڕ بێـت تاوانـی پەلەقـاژەی بارکردنەکـەی نـەدەدا پاڵ. لـە ڕوواڵەتـدا بـە ڕوویەکـی گـەش و عوبابـەوە ڕووی زاری لـە حەمەرەحیم کـرد و:
- مامۆستا بەهۆی ئەوە باوکی چەند پێشمەرگەیەکی شەهیدی و...
- ((دەبێ ئەو حسێبەی بۆ ئێمەمانان بکەن؟ چ بڕوام نایەت».
- کـردەوە نەبەردەکانیشـتان سـەربار، بـاوەڕم بـە کەسـانی دوو زمـان

و بەكرۆكان نایەت. لە بن زمانیشم دەگەیت...
- «دوو زمان و بەكرۆكە تەنیا گۆرگەكانی خۆتن كاكە گیان».
- ئێستاش بۆم دەركەوتووە، تۆ پیاوێكی سەر راست و مەردو پیرۆزیت و پێ و قدوومت بەخێر و بەرەكەت لە قەڵەم ئەدەم و... بە حەیەرمانەوە:
- خۆزگە وابوویایە!.
- لەناخەوە سوپاست ئەكەم و تاكو تەشریفت لێرە بیت ملم لە ئاست چی فەرمانتە لە موویێك باریكترە.
«دەبێ ئەمڕۆ كەری كێ لە گاڕان نەهاتبێتەوە خوایە!».
حەمەرەحیم بەدرۆیەكی سرفی دەچوواند:«
- حوشتر بگرە خەت پیشەم نەبووە قەت».
دڵنیابوو پاشەرۆژ بە شەكراو دەیخنكێنێت.
- «گورگ و ئەو هەڵوێستە مرۆیاتییە، نەگوتراوە. ئ.هـ كەسێك لەسەر ...ڕیشوە نەدانی بە زۆر چەند كەسی بێتاوان و مەحكەمە بكوژێت چاكەی چی لێرەچاو دەكرێت. گریمان ئەوەندە خۆشەویست بوومایە جارێك لەو ماوەیەی لێرەمە ئەلفازت لەگەڵم دەگێڕا».
كەچی ناچار بوو بە دۆستی دایكی بڵێیت:
- زۆر سوپاس خاڵە شێخ. ئەوە لە پایەبەرزی خۆتانە!.
بۆ ئەوەی خەڵكەكە باوەڕی پێ بكەن و لە پەلە قاژەی ڕۆییشتنەكەیان سست ببنەوە ڕووی گفتی تێكردن و گوتی:
- جەنابتان لە ئێمە چاكتر ئەزانن لەمەوپێش چەند پێشمەرگەیەكی كەممان، بە چەكی سووكەوە، ئەچوونە دێیەك، دوژمن بە هەموو هێزی فڕۆكە و زرێپۆشەوە هەرچەند هەوڵ و تەقەلای ئەدا هەتا پێشمەرگەكان بەكەیف و ماشای خۆیان پشتیان لە ئاوایی یەكە

نەکردبووایــە، هەرگیــز تاســای نەئەکــرد تخوونــی بکەوێــت.
«ڕۆڵە ئەو درۆیانەت لای یەکێک بێژە سەمعە سۆت ئاگاداری هەڵس و کەوتتـان، کـەم و زۆر نەبێت و دەیـان قۆنـاخ لێتانـەوە دوور و لاتەریک بێت. ئەگەر نا کەسانی عولعولی و شاش و فیشیش دەزانن:
- ئـەو شــەڕانەی پێشــترتان، کــەوا ئەمــڕۆ شــانازی پێــوە دەکــەن، هەتــا پــەرە بســتێنن و بتوانــن، بەتەنیــا بەرپەرچــی ئەوانــی تــر بدەنــەوە، لابــاڵ قــووڵ کــردن بــوو هۆبــاب. دەنــا دوژمــن ئەوەنــدە بــە ڕۆحــم و بەزەییــدار نەبــووە و نییــە دەیتوانــی بــە تەیــارە و دەبابــەوە خاکــی گوندەکــە، هــەروەک لــەزۆر شــوێنان ســوختەتی بــووە بەســەر یەکدای کۆرکاتــەوە.
- ئەمڕۆ ئێمە لە سایەی لێزان و هەول و مەزنایەتی سەرکردەکانمانەوە وا چەند هــەزار پێشمەرگەی گیان لەسەر دەست و خاوەن درووشمی «کوردســتان، یــان نەمان»یــن بــە هەمــوو جــۆرە چەکێکــەوە، بــەچ عەقڵێکــەوە ڕێگا ئەدەیــن هێزی پۆســتاڵ لەپێ و جاشــی خائینی کورد و کوردســتان خاکــی ئــەم دەڤــەرە ئــازاد کراوەمــان گلاو بکــەن، ئەمــە هەرگیــز نەبــووە و بــە خەیاڵیــش نایەتــەدی.
:-«خوا بەدەمتدا بڕوانێت».
- بۆیە داوا لەگەورە و گچکەتان ئەکەین ئەو بیرەی لە مێشکتان، کە بە قسەی ناحەزانەوە...
:- «ناحەزان لە من بترازێت کەسی دیکەی نییە یا شێخ».
- پەنگــی خواردووەتــەوە: کــەوا دوژمــن نیــازی وایــە پــێ بنێتــە ئێرەو منداڵتــان یەخســیر بــکات...
- «بەڵــێ قوربــان دێــت و زیاتریــش. ئــەوکات ئێمــە بــە گونــی کــوڕت دادەڕێیــن».

– بە یەکجاری دەرباوێن و بێخەم و خەیاڵ پاڵدەنەوە....
– «ئەوەیە کات لەمن و جۆت لە من تا بە ئاواتە شوومەکەیان دەگەن».
– لەم بارەیەشەوە جەنابتان شارەزان. لە وەتی پێمناوەتە ئەو ناوچەیە درۆتان لەمن بەرگوێ نەکەوتووە.
:– «قوربان گریمان فەرموودەکەت ڕاست بووایە ئەمڕۆ ئەو درۆیەت بە بارەبارِ بەسەر زار دا نەدەهات. یا شێخ نەک بە تۆ بگرە بە هیممەت و کەرامەتی باوکی باوکیشت ئەو بەرگریەی فەرمووت ناکرێت، بەڵان نازانم لە ڕاست ئەو درۆ دوو زەردێنەیەی جەنابت بڵێم چی».
ژن و منداڵ وعەقڵ قوندە و لە چۆکان، ئەوانەی لەدنیای سیاسەتەوە دانەڕێیەک دووربوون و کوێرانە دەیان پەرستن، بەم وتەیە دەلحاز بۆچوونەکەی حەمەڕەحیمیان:«
– نێرومێمان زندە بە چاڵ دەکەن و زندە ماڵ و مردە ماڵمان دەکەونە بەر ڕەحمەتی فەرموودەوە و بە کارێکی حەڵاڵ و ڕەواشی حسێب دەکەن». لە پەڕەکەی دڵیانەوە تووڕ دراو:
– مادام جەنابی شێخ فەرمووی براوە.
– فەرموودەی جەنابی بۆ ئێمە سەنەدە.
:– «ئـ.ھـ با بزانین، پاشەرۆژ دەبێتە سەنەد، یاخۆ سندان».
– ئەوە گوتنی ناوێت.
– ئەدی ئێمە چیمان ئەوێت.
– وەللا هیچ.
:– « نە عوزوبیللا قسەی خوایە!. دەوجا وەرە لەگەڵ ئەو تەرزە خەڵکە ساویلکەو بێ ئاگا لە دنیای مام شەهابەوە تێکە و فڕکە، لە

عەلبـەی ڕبـەی تێنەگـەن».
سەری دە غەزانی ماوەیەک بادا و:«
- خـاوەن ئـەو بیروبۆچـوون و هەسـتەین، بۆیـە هـەردەم وەک میزەحوشـتر بـەرەو دواوە دەکشـێینەوە وشێخیشـمان لـێ بووەتـەوە «بولقاسـم»ی زمانـە!».
وەک جەلعـە ئاوێکـی شـەوییان پێدا بکرێـت زۆربـەی هـەرە زۆریـان لـە مـاڵ تێکنـا تـا سـارد بوونـەوە و هێندێکیـان خێـرا لـە نێـو هـەزارە زیلەکـەوە، بـە دڵنیایـی یـەوە بەرەومـاڵ کزەکەیـان کـرد.
لەناخەوە بە تەوسەوەی گوت:«
- بڕۆنـەوە، بڕۆنـەوە نێرەکـەری حەسـاویی فەرموویەتـی و درۆی قـەت بەسـەر زمـان دا نایـەت. نەخێر نێرەکـەری........ن و درۆ!»
کەچـی هـزر تیـژو زەینـدار و دنیـا دیتـەکان، ئەوانـەی حەیامێـک بـوو بـە قسـەی لـووس و پـان پـان و درێژدادڕی سیاسـییەکان وەڕەس بـوو بـوون و بەکەیفـی سـەر ئاویـان لـە قەڵـەم دەدا و زمـان و کردەوەیـان سـاتە ڕێیـەک لـە یەکتـر دوور:«
- درۆ فەقیرە هەموو کەس پێیدەوێرێت».
لـە پەنجـەی دەستیشـیان ڕەت نەدەکـرد و لـە دڵـەوە مسـۆگەریان بـوو: ئـەو هـات و هاوارەیـان بـۆ ئەوەیـە:
- تـا کـو ئاقایـی یەکـەی هـۆی بژێو ڕابواردنیانـەوە چـۆل نەکرێـت و زیاتـر لـە گـۆڕێ نییـە. جـا پاشـەڕۆژ درۆیـان لـێ سـپی دەبێتـەوە و میللـەت تووشـی هەڵدێـری ناگەهـان بـن و بـە گونیـان دابڕیێـن شـتێکی ئاسـایی یـە و لـە مەزەبـی ئەمـڕۆی ئەمانـدا ناچێتـە قالبـی سـتەم و تاوانـەوە.
لـە ڕوواڵەتـدا گشـتیان بـێ نقـە بـوون، کەچـی لەناخـەوە هـەر لەغەننـە کردنـدا بـوون.

حەمەڕەحیمیش مێشکیانی وا زاخاو دابوو گریانیان هەرگیز بەو نەرمە سەر دولکانە نەدەهات:«
- ئەوانە ڕاستیان لا کوفرە و هەرچییان لە ڕاست ئێمە بەسەر زاردا بێت تەنیا بۆ هەڵخەڵەتاندنمانە و بەس. ئەگەرنا ئەمڕۆ ئێمەی لێقەوماو و قوڕ بەسەر تەنیا نەکەوینە بەر کەلبەی تیژی گورگی ئەنفالەوە و چیدیکەمان ناوێت و بەوپەڕی تەوازووەوەش سەری ئەڤینی و ملکەچییان هەردەم بۆ دادەنوێنین، بەڵان ئەوان لە کوێ و گفتەکانیان لە کوێ!».
لەسەر دوانەکەی بەردوام بوو.. و:«
- هەتا ئەو ڕۆژەی لە شەڕە خۆترێنەکەی داگیرکەراندا خۆیان بێلایەن گرتبوو...و من بەخۆم گوێم لە ئەهریمەنی ئەم دیوە بوو:
- کوردەکان نیشتمان پەروەرن و مافی ڕەوای خۆیانە شەڕ دەکەن».
- کەچی لەوەتەی چەکدارانی داگیرکەری ئەودیویان بێ نان و زگیش کردە پێشڕەو...و سەرکردەی ڕزگارکەر، بەڕای من بەچاوێکی سووک و پڕ لە حیقدی زۆر خراپتر لە هێزی غەنیمەکەیەوە، سەیرمان دەکات:«
- ئێ ئێ با بۆتان بمێنێت هەتا ڕۆژتاندا دێت شەرت بێت بە دەردێکی واتان ببەم «با» بە دەواری شڕی نەکردبێت».
- هەر خراپەیەکی بە خەیاڵدا گوزەر بکات لەگەڵمان دەکات. لە دەستیشی دێت. چونکە ئەوانە هی بەرگری کردن نینە. هەتا باوەڕیان پێبکەین.
- بە خۆتان لەمن باشتر دەزانن زندە بە چاڵ کردنی (٨) هەشت هەزار زەلامی بێتاوان و چەک، هەر لەبەر ئەوەبوو چەکداران بۆ ئافەرینێک لە دەڤەری «........» بە پاڵپشت و ڕابەری داگیرکەری

ئەو دیو شەڕێکیان هەڵگیرساند، ئەمڕۆش حەوجە بە بەڵگە ناکات، لە قاری ئەوەی چەکدارەکانمان شان بەشانی داگیرکەری، ئەو دیو بەسەر شەریکەی نەفتیاندا دا، خراپتر بەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیەش دەهێنێت.

دەمێک بە سڕینەوەی کەفی لالێوی خۆی بوارد.

- هەروەکو بیستوومە دوژمن ناوچەی ((........))،((........)) بە قوڕ گرتووە.

- بۆ ئەوەی لە مێشکیان سەقامگیر ببێت، کە ئەوانە بە هیچ جۆرێک دەسەلاتی شەڕیان نییە، بە گوڕەوە بایداوە سەری و:

- ڕاستە چەکداریان زۆرە و چەکی باش و هەمەچەشنی بەرگریان لایە و زۆریش بەخۆیان دەنازن، بەلام لە هەموو لایەکمانەوە شاراوە نییە، دوژمنەکەمان هەتا ئەمڕۆی حازری، لەبەر خەریکی بەشەڕە دژوارەکەوە، نەپرژاوەتە سەر شەڕی چەکدارانی ئێمەوە.

کەمێک داماو باگوێداوە و:

- بە بۆچوونی من ئەویش ئەگەر لەغیرەتیان دابێت ئەوپەڕی یەک، یان دوو ڕۆژ چنگ قژکردنەوەیان لە دەست دێت و زیاتر نا. دەشبینین، ئەوکات نە شەعیری ماڵی وان و نە بەعیر ماڵی وان و ژن و منداڵ و کەس و کاریان لە هەندەرانن، وەک بەرزەکی بانان هەروەکو خۆیانە بەرەو کۆشی جوبە و میزەرانەوە تێدەقوچێنن و ئێمەی بێکەس و ئەنواش بەخاوخێزانەوە سووک و سانا دەکەوینە ناو داوی ئەنفالی دمۆرەوە.

ڕەمەزان لێیوەرگرتەوە و گوتی:

- کاکە قسەکانت لە کونی کارک ڕاستترن، بەلام کە چیمان لە دەست نێت.

دەیویست لە مێشکی زاخاو بدات و:
- چەکدارانمـان کەناویـان لەخـۆ نـاوە: «پێشـمەرگە»، فرپـان بەسـەر هەسـتی کوردایەتـی و نیشـتمانی نەمـاوە،
تاکو دڵی لەم ڕووەوەوە ئاو بخواتەوە و:
- هـەر ئەوان بوون لە گونـدی ((........)) منداڵی نـاو لانکێیان سـەربڕی و لــە دێــی ((........)) یەختیــاری حەفتــا ســاڵی و مــەلای بــە قورئانــی دەخالەتەوەیـان کوشـت و لە((........))بـە قەمـان ورگـی ئافرەتیـان دڕیـوە. ئاخـر ئـەو تەرحـە دڕندانـە کەینـێ جێـی بـاوەڕن و گـوێ بەتـاوان و بەزیـن دەدەن.
زۆری نەبـرد ئـەو چەنـد کەسـە قسـەیان کردەیـەک و گوێیـان بـە وتـەی شـێخ نـەدا و شروشـاتاڵیان بـەلاوە نـاو لـە سـەرایی هەمـووان حەمەرەحیم..لـە دڵـی ڕوون بـوو ئەنجامـی تەسلیم بوونـەوەی خـۆی و کوڕەکـەی بەدەسـت بەعسـەوە تیکـە بـە تیکەیە. کەچـی تاکـو نامووسـی نەکەوتـە بـەر کەلبـەی تیـژی بـێ ئەمانـی گورگـی دەشـت و بەنێ، کـەلای وابـوو پـاش چەنـد ڕۆژی کەمـی دی هێـزی ئەنفالـی داگیرکـەر، بـێ مـل گـەرم بـوون ئـەم ناوچەیـەش دەگرێتـەوە، بـە شـانازییەوە بـەرەو پیریـەوە دەچـوو:«
- با زەعیفەکان قوتار بن قیروسییا لە خۆم و کوڕەکەمەوە».
- هەرچەند چەکدارەکان تەقەلایاندا و داوایان لێکردن تایبـەت سـەفینی جێگری شێخ، لـە دڵـەوە پـێ پەسـت و و قـڕس بـوو بـوو..و:«
- لای خـۆی گیانـی خۆمـان لـە پێنـاوی خزمـەت و سەربەسـتی ئەوانـەوە کردووەتـە قوربانـی! ئا...ئەمـەش هەڵوێسـتیانە و ئەیانەوێـت لـە ژێرکەمەنـدی نوێنـەری ڕاسـتەقینەی خۆیـان دەربچـن!». بـێ سـوود بـوو:«

- ئێمە خاوەنی کەس و کاری خۆمانین نەک جەنابتان!».
- تەرەکتەرێکیان لە ئاوایی بە کرێ گرت، لەکاتی گڕدانی هاروهاج بوون و چاوی غەزەبییان چووە پشتەسەریان و لایان وابوو ئاسمانیان بەسەردا ڕووخا. ئەوە هەر نەبووەو ناشبێت، خەڵکی ڕەشۆکی ناوچەکەیان وا حاڵی حازر لە ژێر فەرمانییاندانەو.. هەروەکو مەزەندەیان خاوەن تاکە هەڵوێستی کوردایەتی و ڕزگارکەری گەل و خاکن و بێ منەتانە دەربچن.
- بەخوا بابە میللەتێکی دواکەوتە و بێ مێشکمان هەیە!.
ئەوجا وەرە لەگەڵ ئەو تەرزەکەسانە راستەڕێ ببە!.
ئەمەیان لا کوفرێکی لەڕادەبەدەر و تەحەمولی قەبووڵ کردنیان نەما و بەوپەڕی هەڵچوونەوە:
- ئێمەی پێشمەرگە هەرگیز. ڕازی نابین ماڵێکتان بڕوات. ناوەللا ڕازی نابین.
حەمەرەحیم، بە تەوسەوە، بێ ئەوەی بەر گوێی کەس بکەوێت:«
- ئەمنیش لە بریتی ئێوە بم خراپتر دەبم».
غیرەتی بزواو زاری بەمە کردەوەو:
- بۆ؟ خۆ ئێمەتان نەکڕیوە. مادام هەرکەس بەرپرسی خاو. و خێزانی خۆیەتی پێتان خۆشبێت، یان ناخۆش هەر دەڕۆیین.
گوللەیەک بوو ئاراستەی مێشکی کراو بە لووت بەرزییەوە:
- ئێمە دامانانابوو ئەم خوێریانە وەک بت بمانپەرستن، کە لە زەبری دوژمنمان ئازاد کردوونە و بەکەیف و ماشای خۆیان سەربەستانە ئەگوزەرێنن و منالێشیان عەسکەری بە زۆر ناکەن، کەچی وا. ئاوا بێ ئابڕووانە لەبەردەممان زیت ئەبنەوە.
- ئەبێ کێ ئەو گوو خواردنەی فێرکردبن خوایە!.

لەناخەوە بە زەردەخەنەیەکی تەڵخەوە:«
- لەمن زیاتر کەسی تر تاوانبار مەکەن هۆ با بینە».
بەوپەڕی قارەوە:
- ئێمەی پێشمەرگە یەکەم هێزی رزگارکەری کوردستان بڕیارماندا و براوە و خوامان لەو خوایە نایسەلمێنن.
«عەنتیکەیە خۆیان بە دیموکرات پەروەر دەخەمڵێنن و حوکمی قەرەقۆشیش دەگێڕن. کەچی لە ڕاستیدا وا ئاشکرایە هەموو شتێکیان لاتەنیا زمان و ڕووالەتە و ئاوێ بێنە و دەستتان بشۆ».
لەترسی شەرەف چووندا ناچار بوون و خۆشی و ترشی نەرم لێ بکەن و:
- کاکە گیان بۆ مانیع ئەبن؟ خۆ بەم سێ چوار ماڵە دنیا خراپ نابێت.
بە بەرەواژی ئەوان و دەنگی حیلەوە:
- بڕیارێکە و بۆ بەرژەوەندی ئێوەمان داوە و ئەگەر تەنیا ماڵێکیش بێت هەر ...ڕازی نابین.
«ترحێو، بۆ تەڕەماشی ئێمەیان بڕیارداوە، ئەوجا هەر ئەو منەتە مابوو!».
بڕیاری قیادەشیان بوو..
«ئـ. هـ. سەرە گلۆرەکە ئا. لێرەیە!».
- هەرچی ڕۆیشت بێ سێ و دوو بیکوژن.
«گچکە ئاو دەڕێژێت و گەورەش پێی لێدەخشێنێت. ئا..ئەوەیە هەستی کوردایەتی و مرۆیاتی تێکۆشەرەکانمان! نە عوزوبیللا بڕیاری خوایە! . کە ئەوەندە مەردو خاوەن بڕیاری خۆتانن. سەرتاسەری کوردستان بۆنی بێگانەی لێدێت و میللەتە نەدارەکەتان بیلبتوون وا

لە ژێر چەپۆکی ستەمی داگیرکەرانەوە زیرەیان دەگاتە کەشکەلانی حەواوە، ئەدی بۆختان لەو کونەشاخە تەنگەبەرە، تەنیا ئاسمانتان لێوە دیارە حەشارداوە و ناچن شارێک لە شارە داگیرکراوەکانتان، بەیەکجاری رزگار بکەن هۆ بابینە. ئـ. هـ ئەوەیە لە ڕاست ئێمە مانان شێرن کەچی لەڕاست دوژمن چێڵن!».

هاتە سەر زاریان و:

- باشە گریمان پاشەڕۆژ هێزی ئەنفال گەیشتە ناوچەکەمان؟.

حەمەرەحیم لەدڵەوە منگاندی و:«

- ئەگەری ناوێت کاکی برا. بەس ناوێرم ڕاستییەکەتان بۆ هەڵڕێژم».

ئەمە قەبرغەی گرتن و بەوپەڕی کەف و کوڵی غەزەبەوە:

- مادام تێناگەن چیتر پێویست بەلەوچەو گووخواردن ناکات و بیبڕنەوە.

دوا بەدوای سەفین زەفتییەکان تێیان هەڵکردەوە و:

- ئێوە دواکەوتە و مێشک بەتاڵن.

- هڕە لە بڕە دەرناکەن.

«نەخێر ئەوەی سەر بە کورێتی جەنابتان نەبێت هڕە لە بڕە دەرناکات، بگرە هەر بنیادەمیش نییە».

- ئێمە خاوەنی ئێوەی گاوکەرین، کە جگە لە قوون قوچ کردنەوەی مزگەفتان چیتر فێرنەبوونە، بۆیە هەتا ئەمڕۆی حازری نەبووین بە هیچ.

«هەرچۆنێک بێت ئێمە مانانی ڕەش و ڕووت بە هیچ نەوعێک پشتمان لەخاکی خۆمان نەکردووە و ئێوە ئاسا لەسێبەری گونی داگیرکەرێک بلەوەڕێین و داوای مافیش لە داگیرکەرە دۆستە خۆشەویستەکەی بکەین. بەڵێ مانەوەمان لە ژێر پۆستاڵی ستەمی دوژمنەوە گەلێک

له‌و خه‌باته‌ی جه‌نابتان شه‌ریف و ڕه‌واتر ده‌قه‌بڵێنین».
- هه‌تا ئێواره‌ش بۆتان بڕێسین به‌لاشه‌.
- به‌سه‌ بیربكه‌نه‌وه‌ و چاو هه‌ڵێنن، شۆڕشی ئه‌مجاره‌مان شۆڕشی میلله‌ته‌.
- شۆڕشی زانست و ڕۆشنبیریه‌.
- شۆڕشی چینی ڕه‌نجده‌ر و چه‌وساوه‌یه‌.
- ئێمه‌ هێزی ڕزگاركه‌ری كوردستان، له‌ناخی میلله‌ته‌وه‌ هه‌ڵقوڵاوین.
- له‌ئه‌وانه‌ش نین هۆ بابینه‌ ختوخۆوڕا بڕیار بده‌ین.
- بڕیاری ئێمه‌ قانوون و ده‌ستووره‌ و له‌ناخمانه‌وه‌ چه‌كه‌ره‌ی كردووه‌.
«ئـ هـ بڕیاری خوایه‌ و به‌ڕپه‌رچدانه‌وه‌ی كوفره‌ و له‌خۆشتان بترازێت له‌كه‌سی دیكه‌مان به‌رگوێ نه‌كه‌وتووه‌».
- پێتان ڕاگه‌یاندرا، تازه‌ دوژمن ئه‌و باوكه‌ی مرد جارێكی تر بتوانێت پێ بنێته‌ ئه‌و ناوچه‌ی ئازادكراوه‌یه‌. ئه‌وجا باوه‌ڕیش ناكه‌ن!.
«ئه‌وه‌ی حه‌ز نه‌كات، یاخوا لێلایی دابێت. خوا به‌ ده‌وتان بڕوانێت. ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی ده‌ڵێن ڕاست بێت ئێمه‌ میلله‌ت ده‌بێ شه‌و و ڕۆژ پێنج فه‌رزه‌ له‌جیاتی نوێژ و ڕۆژی كڕنووشی شانازیتان بۆ به‌رین و ده‌ستی ته‌وازوومان ڕاگرین پێتان له‌سه‌ر دابنێین به‌س...»،
له‌گه‌ڵ هه‌ڵكشانی ئاخێك قووتی داوه‌.
حه‌مه‌ره‌حیم له‌ ناخه‌وه‌ شاده‌ی پێده‌هێنان ئه‌گه‌ر ئه‌و توانایه‌ی ده‌ڵێن هه‌یان بێت كه‌چی له‌ حه‌یفی ئه‌و درۆ دوو شاخانه‌یان سه‌ری ئاوسا و چه‌شنی فێی لێهاتووبێت ئاگای له‌خۆ بڕاو پاشدان:
- نازانم ئه‌و درۆ قه‌به‌ قه‌بانه‌ له‌كێ فێربوونه‌و چ مامۆستایه‌ك ئاوای حه‌ملاندوونه‌.

لە زگ بوو بەتوندی لەلەوچەیان بداتەوە، کەچی دوای قلپ هاتنەوەی دەغەزاوییەوە هۆشی تەواو هاتەوە بەر و زانی و:«
- حەق لای ئەو نامرۆیانە، بارگەی تێکناوەو ئەگەر گوێیشی پێبدەن زیانی لە قازانج پتر دەبێت».
هەننۆب لەهەناوی پەستاوە، بۆ هێوربوونەوەی قارەکەی لەمەش پتر دەسەلاتی نەبوو. لە دڵەوە دایە بەرێ و:«
- پیسایی هەرچەند داری تێوەربدرێت بۆنی زیاتر دێت. ئەگەرنا خەڵک و خواش دەزانن نێوانی عەردو ئاسمان لە تێکۆشانی کوردایەتی ڕاستەقینە دوورن و فریان بەسەریەوە نەماوە و، تەنیا زەبری کوتەک ئەمڕۆ هەموو شتێکی حەشارداوە».
دێدەوان و هاوڕێکەی بیرهاتەوە و بە ئاخەوە:
- سەت حەیف، ڕێوی لەجێی شێرە دەکا گێرە! کەوا بە خوێنی گەشی خۆیان هاوڕێکانیان لە مردنی موحەقەق دەرباز کرد».
وتە بە نرخەکەی هاتەوە یاد.«
- ئێمە بۆیە پێشمەرگەمان پێدەگوترێت چونکە گیانی ئازیزی خۆمان کردووەتە قوربانی گەل و نیشتمان و هاوڕێکانمان. ئەگەر نا پێشفیتنەینە»
وەبەر گوێی ڕەمەزانی چرپاند و:«
- مەسەلە ئێمە نینە و هێدیکەشی بە دوادا دێت، ئەوانەش مردەی ئەوەنە»
خۆی بڕیاریدابوو:«
- ئەگەر ئەوانە بۆشییان بسەلمێنن من نامووسی خۆم لەدەشت نەدۆزیتەوە و بۆ خاتری ئارەزووی ناو((........)) ئەو زۆلانە بچووێنم تاقە ماڵ ڕێدەگرم»..

لەنێو دڵی گشتیان چەسپیبوو قسە و بەڵگە هێنانەوە لە کن ئەوانە بە زیان بەسەریاندا دەشکێتەوە. ناچار پێویستی حەزیان و مرتە لێوەهاتن خۆیان بوارد و هەر هێندەیان دەسەڵات بوو بەسەرلەراندنەوە ناڕەزایی خۆیان دەرببڕن. تەنیا دەنگێکی نزم و نەناسراو بەس ئەوەی لەنزیکیەوە زانی دەنگی حەمەڕەحیمە:«
- بشمانکوژن هەر دەڕۆیین».
هۆپێکیان لە خۆزانی و قسە نەبوو، گوللە بوو ئاراستەی هەڵوێستیان کرا. کەچی خاوەنەکەیان نەناسی و بەسەر خۆیان نەهێنا و گوێیان لێکەڕ کرد و ئەمەیان گوت:
- ئەوا فەرمانی ئێمەی پێشمەرگەتان پێدراو دوا ئەنجامیشی ئەبیننەوە.
«وا دیارە ئێمەی ڕەعیەت بەخاو و خێزانمانەوە خزمەتچی و خوبزەیانین و کوفرە ئەگەر لەژێرداری فەرمانیان دەربچین».
لەشروی نامووس چووندا پشت گوێیان خست و بە «وسو»ی شفێریان، پیاوێکی رەقەڵە و ڕەنگ خوڵاوی، وریایی پێوە دیاربوو. ڕاگەیاند، با ژوات.
-:هەرچییان لەدەست دێت با بیکەن».
ئەو لە سکۆڵەی چەپی دڵیەوە چەقێلەی دەرکردبوو، دنیا چ باسە و خواخواشی بوو سەعاتێک زووتر نامووسی خۆی لەدەمی گورگی بێ ئامانی ئەنفالەوە قوتار بکات. بەخاوەلیچکەی دڵە مەلەرزە و سێ چوار مەتر زیاتر نەڕۆیشتن، نەک ڕیسەکانیان بە گوللە لێکردنەوە و خوری و تایەی عارەبانەی تەرەکتەریەکەیان تەقاندەوە، بەڵکو جوێنی زۆر بێزەوەرو ناهەمواریشییان دەقەبەڵ کردن و:
- گەوادینە، بێ شەرەفینە، بێ نامووسینە، بێ غیرەتینە، ئێوەکەرن، وەحشن چین؟. ئەوا سەت کەرەتە پێتان ڕاگەیاندرا: مەڕۆن، مەڕۆن

ئەوجا وەک لەگەڵ ئێوەمان نەبێت، یاخۆ ئێمە بە هیچ دانەنێن هەر وەڵامیشمان نادەنەوە.

- دیارە ئەتانەوێت بەخۆتان و ژنەکانتانەوە بچنەوە سەر«.....» بەعسییان.

«نەخێر قوربان ئێمەمانان لە ژیاندا یەک ملین و ژنەکانیشمان بیست و چوار سەعات لەکاتی زێن و شێنیدا لێدا نابڕێن و مێشی غەوارەیی پێ هەڵنەگەڕاوە، نەک وەک جەنابتان هەر ڕۆژە لەسەر کۆشی داگیرکەرێک و ژنەکانیشتان خواو خۆتان نەبن کەس نازانێت لە هەندەران، دوور لە چاوتان چۆن ڕادەبوێرن».

زۆر نەمابوو بە قۆنداخان شفێرەکەش بکوتنەوە.

- دەبێ چ مامۆستایەک ئەو دڕندانە بەناوی هەستی نەتەوایەتییەوە پێگەیاندبێت؟ خوایە؟. خواعالیمە لەسێ بەندایەتییاندا شەیتانی لەعینیش ڕێ بەدییان ناکات. ئەوە سوختەکانیان ئاوانە. دەبێ مامۆستا و موستەعیدەکانیان چۆن بن خوایە!.

* * *

«هێزە بکەن لە ڕاهی خوا لایەکی ڕیشتان تاشیبێت و لایەک مابێت، تا زووە خۆتان و منداڵتان ڕزگار بکەن. ئەو دەنگ و باسەی بڵاوبووەتەوە، دوژمن زۆر بە وردی و ڕشتییەوە جێ بەجێی ئەکات و هێزێکی گەورەی بۆ ئەم نیازە ئامادە کردووە».

حەمەرەحیم لەناخەوە:«

-پێش هاتنی جەنابت ئەوەی کەمێک زەیندار بێت پێ حیسایە، بەس لە بەختماندا گورگی خوێی وا لێمان بووەتەوە بەڵای سەر».

چەکدارەکان وەک ئاویان بە کون وەربووبێت پێ هاروهاج بوون و چاویان تاری و ئیمانیان لە قالبدا فڕی و:

- ئەوجا هەر ئەوە مابوو بەو دەنگ و باسە درۆیە دێیەکە چۆڵ بکرێت!.

«سوڕدەزانم مردەی چنە بۆیە دنیاش بێتە ڕجایێ جگێکی پووزە ناهێنێت».

هەتا کەس بەپیرهاوارەکەوە نەچێت ویستیان مێرد منداڵە (قاسید) ەکەی، لەلایەن خزم و کەسانی خەڵکەکەوە، لە شارەوە ناردرابوو، لە بریتی پاداشتی شەکەتی ڕێگا نەهاتییەکەیەوە پاش دارکارییەکی زۆرەوە لە زندانی بپەستن.

- خوا عالیمە بۆ جاسووسی هاتووە!.

- خۆ. لە گینە و سەروسەکوتی وێدەچێت.

- پێویستە هەتا زووە حەدێکی بۆ دابندرێت.

خزمەکانی سوێندیان خوارد:

- تەنیا بۆ سەردان هاتووەو ناشچێتەوە.

هەتا لە کۆڵ «ئاسۆ»ی پازدە ساڵ ببنەوەو «وسو»ی خاڵی کەفالەتی گڵدانەوەی کردو:

- بابەر ئەنفال بکەوێت سەت قات باشترە نەک ئەوانە بە پەندی لەناوبەرن و ئەوجا توومەتی خیانەتی خەفیاتیشی بدەنە پاڵ.

«ئـ.هـ لە هەموو لایەکەوە هەر کورد قڕکردنە. جا چ بەناوی بەعسیاتی بێت، چ بە ناوی کوردایەتی».

حەمەرەحیم لەلایەک لە زوڵم و ستەمی ڕێنەدانەدا زۆر بە قاردا چوو.. و:«

- قەت بووە پێشمەرگە ڕێی قوتاربوونی میللەتی خۆی لەگەرووی ڕیسواکردن و مردن بارینەوە بگرێت و ئەوجا بە ئەرکێکی پیرۆزی نەتەوایەتی دابنێت!».

لەلایەکی دیکەوە پێش هاتنی ئاسۆ لە دڵی ڕوون بوو: ڕاست ناکەن و لەو موحەمەدانەش نینە سەلاوەتیان لێ بدرێت و بتوانن بەرگەی هێزی ئەنفال بگرن و ناوچەکە نەدەنە دەست. نەخاسمە سەکردە شێخ بێت.
- لەوەتی بەبیرم دێت شێخ کارو پیشەیان هەر دژی کوردایەتی بووە. ئـ.هـ شێخانی «قادری» هەردەم هەوڵیانداوە و هەوڵیش دەدەن میللەتی کورد ببێتە کۆیلەیەکی زەلیلی بەردەستی داگیرکەر و زۆرداران. کەچی شێخانی «نەقشبەندی» کڕنووش بردنی کوردە بۆ داگیرکەرانی تورکەوە.
- «زەمانی زوو عوسمانلی داگیرکەریان ناونابوو «امیرالمومنین» بۆ ئینگلیزیش هەمان تاس و حەمام بوو. بەس ڕاستەوخۆ بۆیان نەدەگونجا ئەولەقەبەی دەقەبەل بکەن. ئەمڕۆش وا زۆربەیان، نە خەسەلە خاوەن تەکییەکان جاش و خەفیە و ئامیر فەوج وموستەشاری بەعسی داگیرکەر و قەسابی کوردن.
ماوەیەک لێی گرتەوە و:
- دوژمنەکەشمان ژیانی سەرتاپا درۆ بێت کەچی دەرحەق لەناوبردنی ئێمەی کورد قەت درۆی بەسەر زاردا نایەت.
ڕووناکی لە دەروونییەوە بارگەی تێکناو کەوتە نێو دەریای دامان و بیرکردنەوە. هەرچەند سەری دەهێناو دەبرد نەیدەزانی ڕووی تەکبیری دەربازبوونی لە مردنی موحەقەقەوە لە کاملا بکات:«
- خوایە هاوار بۆ کێ ببەم کەوا تۆزێک ڕوحمی پێماندا بێتەوە!».
ناحەقیش نەبوو نامووس چوون گۆترە نییە و هەموو دڵێک بەروەستی نایەت « گورگی دامێن برسی بیابانان بە زندوویێتی چاوان پڕکێشی بکات».

ئەو شەوە هەتا بەترێکی بەسەرچوو لەنێوان چاڵان و ماڵانی ترس و نامووسەوە دەستەو ئەژنۆ حەیرمابوو. و:«
- چ بکەم خوایە. تووشی چ قوڕبەسەریەک هاتووم!».
دوای بێنەو بگریەکی زۆری ئەم دووانە لەناخەوەیدا خنکەملانێیان بوو. دواجار ئەمیان زاڵ بوو، بڕیاریداو:«
- ئەگەر گیانیشم تێ بچێت گوێیان هەرگیز پێنەدەم. هەرنا پاش نەمانم لەگینە ڕوخسەتی منداڵەکانم بدەن».
بە هەناسە هەڵکێشانەوە:«
- سەت خۆزگە بۆ ئەو ڕۆژە دەخوازم!».
دەمێک لەبەرخۆیەوە داماو تەرزی گاڕدانێکی دەروونییەوە:«
- من لە درەندەی ساڵی حەرەس قەومییان نەترساوم، لەئەوانە ((........،........)) چۆن دەترسێم. مردنیش هەر جارێکە و دەبڕێتەوە».
ئەمە سۆزی خۆشەویستی نیشتمانی پێ بەخشی و:«
- کەسێک دەسوەکەری بەقەدەر توانا لە خاکی داگیرکراوی خۆی نەکات فڕی بەسەر هەستی مرۆڤایەتییەوە نییە».
دوای چۆڵ کردنی «کەندێناوە» و داگیرکردنی ئۆقرەی لێهەڵگیراو لە هیچ شوێنێک نەیدەتوانی تۆتکەی ئۆخە بگرێت:«
- من لە ژیاندا بم و خاکیشم داگیربکرێت!».
ئەمە بڕیاری بەسۆزەوە پێداو «بڕنەو»ێکی درێژ و خۆرجەیەک پڕنان و داندۆک، لەگەڵ دێمکە ئاوێک، شەوێک سەڵتە زەلام هەیپەی لێکرد و کێوی «قەرەچۆغ» خۆت بگرە وا هاتم:«
- بەلکی خوا دەکات قیچێک گڕی دڵم دامرکێتەوە. بۆ مەفتەنی باب و باپیرانم هەر هێندەم لە دەست دێت و شانازیشی پێوەدەکەم».
لە منداڵییەوە چی کون و کەلەبەری چیاکەبوو جارێک و دووان و

سێیانی دیبوو، هەرکە ڕۆژ دادەهات خۆی لە پەسارگەیەک، ناوچەیەک دادەنووساند و بەدووربین سەیری دێیە داگیرکراوەکانی نکارکێوەکە دەکرد و:«
- دەبێ ڕۆژێک دابێت وەک جاران بە گوندەکانمان شاد ببینەوە!؟».
پاش سەراو بنکردنی هاتە سەر ئەم رایە:«
- زۆر ئاسانە گریمان جلەوداری ڕاستەقینەمان هەبێت. ئەگەرنا بەتەمای کوڕە شێخ و سەرەک هۆزان هەتا ماوین لە ژیاندا هەر دەبێ لە گوپی خۆمان بدەین».
هەرکەسێک یا شوانێکی «بەدو» داگیرکەری بدیتبووایە، لە ئاوایی دوورکەوتووەتەوە خۆی لە پەنایەکی نەدیو لێی نزیک دەخستەوە و بە نیشان تەق گوللەیەکی ئاراستە دەکرد. ئەگەر پێکابووایە، یەکتاو دەگەیەشتەسەری و لوولەی تفەنگە کەی لەدوڕدەمی دەناو دەیگوت«
- بگرە ئەوە لە تۆڵەی داگیرکردنی کەندێناوەیە!».
ئەگەرنا خۆی هێدی هێدی دەدزیەوە. هەتا چوار بە دوانی پەلەواژ نەکردەوە دڵی ڕێگای نەدەدا بگەڕێتەوە:«
- ئۆخەی خوایە خۆگرە بڵێسە دارەکەی سکۆلەکانی دڵم تۆزێک هێور بووەوە!».
بەهەندێ باش بوو کە نانی لێدەبڕا شەو خۆی دەخزاندە کەلاوەی دێیەکانی بناری ئەو دیو:«
- ئەوانە ئەگەر جاشیش بن لەبەر ئەوە تەرحی شێخەکان غەوارە نین و لەبابەلبابیاوە نیشتەجێی کوردستانن گۆشتیشم بخۆن هێسکم ناشکێنن». لەبەر ئەوە چۆل بوون هێدی هێدی بەرەو دامێنی شارۆچکەی «مەخموور» خشی. چەند کەسی ناسراوی ئاقایی «قەڵاتەسۆران»ی مەرزانی دیت. تایبەت «هادی ئەحمەد»ی

کۆنەدۆستی شەو بەنهێنی سەردانی کەلاوەکانیان دەکرد. زۆر پێ خۆشحاڵ بوو. ناخەسمە هەرکە هۆی هاتنەکەی زانی و بۆ گارِدانی لەسەر کارەکەی و گوتی:

- هەتا لێرە بیت خواردنت لەسەرە من..

لەو ساتەوە رێککەوتن، لە نێوان دوو شەوان لەسەر چیاکە و لای «کانی خەزەرەان»یەکتر ببینن.

هادی هەرجارێ پێیدەگوت:«

- ئێمە لەو رۆژەی دەگەرِێین، ئەوەی بەسەری کۆت و پێخواسییەوە، یارمەتیت نەدات مسۆگەر کورد نییەو بێژییە».

هەرکەچوارەم بەدوی کوشت شوان بوو...و کاورێکی زۆر قەڵەوی کوشتەوەو ئەوەندە گۆشتەی پێهەڵگیرا بەسەر کێوەکەی خست و شەو هادی گەیشتە لای و هێندە گۆشتیان برژاند. هادی رووی تێکرد و گوتی:

- ئەو ئاگرەی کردمانەوە باشنەبوو، دڵنیام سبەی حکومەت بە هەلیکۆپتەر دەگەرێت و بە گوێی من دەکەیت لە هەنووکە زووتر نییە ئێرە بە جێ بێڵە.

عەقڵی بۆچوونەکەی گرت و هێندە گۆشتی برژاو و نانی هەڵگرت و دوورانە گۆشت مابوونەوە بە هادی سپارد و پاش یەکتر ماچ کردن شەو بەترێکی بەسەرچوو بوو لەیەکتر دابران.

لەسەر تۆقەڵەی زۆر گەزراو دنیا روون بووەوە و لە ترسی ئاشکرابوون لە زورگەکە مایەوە.

دوای بەرزبوونەوەی خۆر دوو هەلیکۆپتەری دیت وا لەسەر چیاکە و نکاری ئەم دیو و ئەو دیوی ئاست شوێنی ئاگرەکە سەفا و مەرِوایان بوو.

شەوی دووەم ماوەکەی تری بڕی».
بە ئەمەش زۆر شکور بوو، بۆ بەیانی تاقەماڵ وەپێش منداڵەکانی کەوت. بریتیبوون لە ژن و دوو کچ و کوڕێک ودوو کوڕەزا. ئەمەش تەنیا ئەو لەو ئاوایی یە چل، پەنجا ماڵە و لاییدەش لەپەنجا پتر. زاتی کرد و لە لێژایی یەکەی بەرماڵانڕ بەرەو دۆڵە قووڵەکە شۆڕ بوونەوە و:«
- نامووس چوون لەهەموو شتێک گەورەترە».
چەکدارەکان هەرچەند بە توندییەوە تێیان ڕاخوڕین و:
- کوڕە بگەڕێنەوە!.
- بۆخواتان پێ ئەڵێین بگەڕێنەوە.
لایان وابوو هەرلەگەڵ ئەوانیشیان نییە و:
- ئەو گەوادە مل پانە ئەجەلی هاتووە، بۆیە وا نانی شوان ئەخوات.
ئەمەیان گوت و دوو سێ تەقەی بووەکانەیان بەسەردا هاویشتن.
- ئافرەتە گەنجەکان بەترس و سلەمینەوە گوتیان:
- ئەیرۆ. بابان وێران!. خۆ گوللەیان پێوەنایین.
- بە حەقی خوا دەمانکوژن.
-: «بەعسیش هەر ئاوای دەکرد!».
لە جێگەی خۆیان وەک سینگ چەقین و بە چاوی ئەبلەق و دڵە مەلەرزەوە هەرکە لەسەروسەکوت و ڕاگرتنی چەکەکانیان ڕا ڕەمان ترسی زیاتر بەسەریاندا زاڵ بوو. کەچی بە فەرمانی حەمەرەحیم و تاندانی گورجی ورەی هەنگاونانیان هاتەوە بەر و بەردەوام بوونەوە و چەکدارەکانیان لە دین دەرچوواندن مرازیان وابوو گوللەکانیان ئەمجارە ئاراستەی لە پشتێن بەرەو خوارەوەی حەمەڕەحیم و کوڕەکەی بکەن، کەچی کت و خوا سەفین هاتە سەر زاری و گوتی:

- جارێ با بەژێر پێیانەوە نێین.
جا بە دەنگی حێلەوە گوتی:
- خـوا بۆمانـی چـاک بکات، کـە لـە ژیانـدا تووشـمان بـە تووشـی ئـەو نامـرۆ. و قەلـە زراوانـە بـووە و ئەوجـا بتوانیـن بەسـەر گشـت کۆسـپ و تەگـەرەی تێکۆشـاندا زاڵ بیـن و سـەر بـە دوژمـن دا بنوێنیـن.
«بـۆ ئێمـە مانانانـی هـەژار و بێ خـاوەن هـەر بـە ڕبـەی تەقتەقـە. ئـ.هـ کاتـی خـۆی بەعسـیش پیاندەگوتـی، وەلـەک جەبـان».
ئافرەتـەکان، تایبـەت کوردسـتان و ناسـکە هەترەشـیان چـوو...و بـە زرووکانـدن چـۆکاو چـۆک کەوتـن.
- ئەی هاوار سەراو قەت کەسمان نەما.. هە یشـ. ش!.
- هیزە بگەڕێینەوە!.
- باپیـرە چاوەکـەم بـە گوێیـان بکـە ڕووی چەکیـان وا لـە ئێمەیـە و دەمانکـوژن.
قەشمەریانە هەتا لەسەر پشت کەوتن پێیان تریقانەوە.
حەمەڕەحیـم بـۆی واژی بـووەوە کەسـانێکن مەگـەر گوللـە دەنـا هیـچ شـتێک کاریـان لێناکات. ناچـار بووبێ خوایشتی حەزیـەوە خاوبپێتـەوەو بەڕوویانـدا پسـکاندی و:«
- بـا لەگـەڵ سـەیان نەکەوینـە چاڵـەوە و خـوا عالیمـە شـەقاوێکی تـر باوێیـن ئیشـمان تـەواوە».
ملی پەشیمانی بە دڵساردییەوە، وە چەخاندەوە و:
- میللەتێکی بێ یەغیار و هیرمـان هەیـە. بێجگـە لـە ئـەوەی ڕابـەر شـک نابـات ئەوجـا ئـەو جاشـک و گوڵکانـە وا بەنـاوی پێشـمەرگەی خەباتـەوە ڕنەیـان لـە دوڕ هەناوییـەوە ختـم کـردووە و کـەم کەسـیش دەتوانێـت دان بـەو ڕاسـتییەدا بنێت و بەڕوویـان هەڵشـاخێت.«

- ئێوە دوژمنی میللەتن و دۆستی داگیرکەرانن».
ئەوسا لە گینەپەتی ڕیسوایی لە هەوگ بکەن و منداڵە ورتکەی ئاواییشی بە چەپڵە و پلووکە بەرد و فیتەی نەفەرتەوەی دوا بخەن و:«
- هۆی.. ها... هۆی.. ها... حەمەڕیقلاو هۆی.. ها...
- بەرەی ڕووتان هۆی. ها... نەوەی گزگلان هۆی.. ها....»
ڕێنەدانیش هەر هیچ.
- لە عەمری خۆم ئاوقای دڕندەی ئا..وا. کەلبەتیژ نەبوومە. مەگەر بەعس.
بەسەر لەراندنی قەبزییەوە:«
- ئـ..هـ. غێر.......».
لەگەڵ ئاخ هەڵکێشانێکی درێژ و قڵپدارەوە:«
- هەتا خوێندنەوەکەشمان، لەبەر ئەوە بە زمانی داگیرکەرانە زیان بە هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتیمان دەگەیەنێت. بۆیە ئێمە هەرچەند لە خوێندندا شەهادەی بەرزە وەست بهێنین بەرەو هەڵوێست و ئارەزووی داگیرکەران هەنگاو داوێین. هەر میللەتێکیش خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی ئاوابن موستەحیلە ڕۆژێک دابێت، بە ئاوات بگەن و پاشەڕۆژ بسێینەوە».
ئەو شەوە هەتا کازیبەی بەیان وەنەوزی نەدا و چاوی بۆ سونەتیش لە ڕۆنتکی خەم و کەسەری بێدەسەڵاتییەوە وشک نەدەبووەو ناوەناوەش لەژێرەوە ساواری سەر ئاگری گڕ ئاسا دەکوڵی و بلقی دەداو:
- عاجباتی لێرەدایە: زۆربەی خەڵکەکە نازانن بە درۆ. و دڵەسان هەتا بەر ئەنفال بکەوین دەمانخافڵێنن. ئەگەر هەنووکە بۆیان هەڵدەڕێژم

مسۆگەر بێ قەید و شەرت بە توومەتی خیانەتەوە لەناوم دەبەن. نەیدەزانی بە چ ڕێگایەک، فێڵێک لە نەگبەتی ئەنفالی بەدناو خۆی و خێزانەکەی دەرباز بکات. دەرگای ڕاستیشی بۆ کەوتە سەر پشت و:
- دەبێ دڕندەی وەک خۆیان لەدنیادا سەری هەڵدابێت؟.
مام ڕەمەزان لەتەکییەوە بوو، لێیوەرگرتەوە وگوتی:
- زۆر. زەحمەتە.
- بەڕاستی بەعسی میللەتن.
- ئەگەر ئەویش نەبن ئاویان لە چالاوکی ئەو خواردووەتەوە.
-: لە ئەوانەش نینە بە هیچ تەرحێک پشتیان پێ ببەسترێت.
- پشت بەکێ ببەسترێت؟. جگە لەتاوان و کاری نامرۆیانە و کێلەوەژە و شێواندنی خەباتی کوردایەتی بەملاوە چیدیکەیان لێڕەچاو ناکرێت.
- ئەوەی لە ڕاست میللەتەکەیان مەبەست نەبێت کردەوەی چاک و سوودبەخشە.
- ڕزگاربوونیش لەژێر چەپۆکی کوشندەیان زۆرگران دەوەستێت.
- کاکە ئەوە گوتنی ناوێت و هەر خوا بۆمانی چاک بکات.
سەری لێیان ئاوسا و حەیرمابوو..و نەیدەزانی چ هۆیەک، مامۆستایەک گاڕی داون. ئا..وا بەشانازییەوە لە قاوخی بنیادەمی دەربچن و دژی میللەتی خۆیان بووەستن.
- بە بیری من بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە سەروچاوەکەیان لێڵە.
- بەزم لێرەدایە: بۆ لە خشتەبردنی نەتەوە کۆسکەوتوو. و بێ خاوەنەکەی خۆیان بە بۆیەی ڕەنگاوڕەنگی قەشەنگ و شۆڕشی نوێ و سۆسیالیست و دیموکرات پەروەر ئارایش داوە و بێ ئاگاشن کە بە کردەوە بەریان هاوێشتووە و خۆیان خزاندووەتە نارچەی دژایەتی میللەتەوە..

- ئەوجا بە زەبری چەک و درۆی زل و زلیان خەڵکی دەڤەرەکەیان، کەوا بیست و چوار سەعات وەک بەندە دڵسۆزانە لەخزمەتیان وەستاون. هەتا کۆڵ و خۆشوشتنیش، سووک و سانا بێ ئەوەی نەختێک هەستی مرۆیاتیان، لە ئاستیاندا ببزوێت گشت بکەونە گەرووەمەی ئاشی دوژمنە کوردخۆر و داوێن برسییەکانەوە.

- ئەوانەی شەو و ڕۆژ، بۆ ئەم مەبەستە عەودالن، پاش ڕابواردن بە کیژوئافرەتەکانەوە، بەزندوویتی چاوان دەنێو چاڵی نەمانەوەیان سەر گوم بکرێن.

- ئەوجا ئەو تاوانە لە ڕادەبەدەر شووم و قەڵپە، کە بەهەموو ئایین و مەزەبێک خیانەتە وا لەدڵی خەڵکە بێ ئاگا و دوورنەبینەکەیان سەقا داوە: ئەرکێکی پیرۆز و نیشتمانپەروەر و مرۆڤایەتییە. گوایا بە درۆی بە کلک و گوێییەکانیان نایێلن ئەزیەت بکێشن و هەتا دوژمن ماوە حەدی نییە بە هیچ جۆرێک ئەو ناوچە ئازادکراوەیان گلاوبکاتەوە.

- ئ.هـ. با ئەوان ڕێمان بدەن خەمی ئەزیەت کێشانی ئێمەمانیان نەبێت.

- کوڕە هەنجەتی ترێ نانەجۆیە؟. ئەگەرنا ئەزیەتی چی و تەڕەماشی چی.

- ئەو خەفەتە من دەکوژێت، لەسەتا نەوەت و نۆی دانیشتووان بە خوایشتی حەزیان لەناخی دڵیانەوە، بە پێشمەرگەی ڕاستەقینەو ئازادکەری کوردستانیان حسێب دەکەن و سەری ئەوینی و تەوازوویان لە ئاستیاندا هەردەم نەوییە و لە ژێر فەرمان و ئامۆژگاریان دار لە خۆ نادەن.

- ناحەق نینە کاکە ناحەق نین، لە ترسی دڕندایەتی بەعسی

داگیرکەرەوە ناچار بەدۆستی دایکیان بڵێن، خاڵە و سەری بچووکیان بۆ دابنوێنن.
حەمەرەحیم لە خۆش باوەڕی و ساویلکەیی نەتەوەکەی حەیرمابوو، قاری لەژێرەوە زۆر لێدەخواردن و:«
- دە کەمێک بیربکەنەوەو چاوتان هەڵێنن و ڕەش و سپی لە یەکتر هاوێرن و بزانن ڕۆژ لە کێهان لا هەڵدێت!».
ئەگەر شورەیی و نەبووایە لەشروان تێروپڕ جوێنی زۆر ناشیرینی پێدەدان.
- کەواتە ئێمە حەقە مستی هەموو تەرزە چەوساوە و زوڵمێکن.
تەنیا بە مام ڕەمەزان و منداڵەکانی دڵی تۆزێک هێور دەبووەوە. لای بەڵگە نەویست بوو گریمان تەکانێک لەخۆی نەدات و دەستەوەستان بووەستێت سبەی وەکات پەلی هەر یەک لە کچ و بووک و ژنەکەیەوە لەدەست سەربازێکی عەرەبی بێویژدان و درندە و ئاودالی جێ بەجێ کردنی ناوەڕۆکی ئەنفالەوە دەبیندرێت:«
- ئەوەش لە هەموو قەباحەتان قەباحەتترە».
لەملانیش زۆر سووک نییە چاوەڕوانی پێ و قدوومی ئەو تەرحە هێزە بەدناوە ببن و کفتایی دڵی چەتە بێمرووەتەکانی خۆیان پێدا بکەوێت:«
- ئافرەتەکانیان بکەونە بەردەستی داوێن پیسی دوژمنەوە».
هەوڵەکەی بە پێویستێکی گرنگی ئەستۆی خۆیدادەنا. ئەگەرنا خیانەت و ڕوورەشییە و وێڕای ئەوەش هەتا نووزەی لەبەروەمێنێت لەژێری باری تانە و نەفرەت و سەرکۆنەی ویژدانەوە دەرباز نابێت:«
- بابە تۆ ئێمەت تووش کرد و ئەگەر بە دڵسۆزییەوە هەوڵت بدابوایە قەت نەدەکەوتینە ئەو ڕۆژە ڕەشەوە».

ئەمەش لەبەروەستی هەموو دڵێک دا نییە. هەننۆب بڕیاریداوە: بەهەر ڕێگایەکەوە بێت دەبێ خۆی تەسلیمی دەستی بەعسی عەرەبی داگیرکەر بکاتەوە. سەت قات ڕەواو لەبارترە. نەک ویستی بەعسی کوردان کە گیرۆدە بوونی تۆڕی ئەنفالە، چاوشۆڕانە ببینێت:.
- هەرنا ئەوکات ئافرەتەکان لە پڕکێشی دڕندان دوور دەکەونەوەو قیرسییا لەخۆم و کوڕمەوە.
ئەمە گۆڕی ئومێدی وەبەرناوە هەر ئەو ڕۆژە بە باوەڕێکی پتەوەوە کەوتە خۆ:
- شەو قەڵای مێردانە.
سەرگرتنی نەخشەکەی تێدا ئاسانە و:
- تڕی خۆمان، سڕی خۆمان.
ئەمە خۆشییەکی وای پێ بەخشی لە دووورەوە هەست پێدەکرا:«
- ئەوەی سەری بگرتبووایە کۆز و شەش بوو».
کەچی زۆر بە نهێنی گرتبوو. لە منداڵەکانی بەملاوە کەسی دیکە پێنەدەحەسیا. ناحەقی نەبوو.. و:«
- با ئەوجارەش ڕیسەکەمان لێنەکەنەوە خوری».
ئەوانیش بۆ جێ بەجێکردنی کەل وپەلی پەڕینەوەیان لە ڕووبارەکەوە بوو:«
- خوا عەقڵ و بیری پێبەخشیوین هەتا لە ڕۆژی ئاوا تەنگانەدا لەمشوور خواردنی تایبەتی خۆمان نەکەوین»
ڕەمەزان ئەو ڕۆژە لەقاروکەسەری دەروون و داڵغەی دۆزینەوەی چارەسەرێکی بێ سەرئێشە:«.
- ئەبێ لە دەست ئەو گورگە دوو پێیانە قوتار ببین؟. مەگەر کلکی حوشتر بگاتە سەر زەوی».

سێ چوار جار سەری بەماڵیانیدا داگرت و:«
- تەکبیر مەگەر لای ئەوپیاوە بدۆزرێتەوە».
لە پەیداکردنی چوپ و پرباکردنی و گەڕان بە دوای داری تەژەوە شەقرە و دەستەک، کە لە پەناوەی دەدیتن و دەیانبردە نێو ناندێنە جزرییە بچووکەکەی نزیک دەرگای حەوشەوە و دەیڕوانییە ژووری ماڵەوە، نیازیانی خوێندنەوە و:«
نەمگوت!».
زۆری هەوەست پێهات و:«
- لە چاوی منت کەوێت، دیارە هێشتا لە تەکبیری خۆت نەکەوتیت!».
ئەم ڕێگایەی بە خەیاڵیشدا گوزەری نەدەکردو:«
- بە خوا قەسەم تۆ. لە هەموو شتێک لە ڕەشادەتی و زیرەکی تەکبیرکردندا لە ئێمە بالاتریت!».
هەر زوو. وەبەر گوێی پسکاند و:
- ئەگەر رازی بن ئێمەش هاورێیتان ئەکەین. ڕەنگە لەبەر ئەوە خۆم و هەرسێ کوڕەکانم مەلەوان زانین و لە پەڕینەوەی منداڵان، لە ڕووبارەکەوە سوودمان بۆتان ببێت.
گەلێک کەیفی پێهات و:
- من لەو ڕۆژە دەگەڕێم جەنابتم لێدا نەبڕێت.
- خۆی مەلەی نەدەزانی و لە پەڕینەوەی ڕووبارەکە، بە هۆی کەڵەکی دەسکردەوە دوو دڵ بوو، هەم نابەڵەدی دەڤەرەکەش پێویستی زۆر بە ڕێبەرێکی شارەزای وەک ئەوی هەبوو، کەچی تەنیا لەبەر ئەوەی بوو: هەنگی برایەکی دایک و باوکی خۆشدەویست، بۆیە هەر زوو بەڕوویەکی بافرە دارەوە ڕەزامەندی بەم تەرزە دەربڕی و:
- ئەوا خۆت زانیت و چ منەتی منی تێدا نەما. ئەگەرنا بەتەما بووم

شەو لەکاتی ڕۆیشتندا خەبەرتان بدەینێ.

* * *

لە ئاقاییدا پاش ئەوەی بە زەبری گوللە حەمەرەحیمیان گێڕاوە، لەوغە لەنێو خەڵکە بێ چەکەکە بەرپابوو..و بیلبتوون ئەویان لا تاوانبار بوو، کەوا سەر بەگێچەڵ و لاملە و لەوەتی پەنای هێناوە مەرامی تەنیا ئاژاوە نانەوەیە و بەس:

- ئەگەرنا کەسمان بەناوەڕۆکی ئەنفاله نه ئەحسیا.

- کوڕە هەر نەشمان ئەزانی ئەنفال چییە. هەتا خۆمانی پێ گورگە هەڵبخستبووایە.

- وا چەند ساڵە لەم ناوچەیەدا بەهیممەتی بازووی پێشمەرگانەوە حەواینەوە.

«گەلحۆینە شەڕە خۆ ترێنەکەی داگیرکەران ئێوەی لێرە گیرساندووەتەوە، نەک دەست و قامی ئەوانە!».

- ڕاستە واوەکی پاشایان ئەگوزەرێنین و نە وجوودی بەعس ئەزانین و نە عەسکەریشی بۆ ئەکەین.

- ئەدی ئێمە چیمان ئەوێت.

- ئەوجا. وا لەزگە ئەم ژیانە بە سەویەت و خۆشەمان لێ تێک بدات.

- وا پێشمەرگە جارێک نییە و دە جار نییە ئەڵێن: مەڕۆن ئێمە ئەتان پارێزین. ئیتر ئەو ڕۆیشتن و ڕۆیشتنەی لەچی!.

- کوڕە هەر لەژیاندا لاسار و ملهوڕە و تاکو بڵێن بەرەبابێکی ئازا و بەجەرگن هەردەم وایان لە مل خۆشە ڕکابەری کاربەدەستان بکەن.

- دەم خۆش: بنی قسەت هێنا.

«ئـ هـ سـەلاو لـە عەقتان خـاوەن ئـەو زەيـن و هۆشـەنە بۆيـە هەتـا ئێسـتا هەسـت ناكـەن كـەوا گورگـی خـۆی و دەشـت و بەنـێ كەلبـەی تیژیـان لەهەناوتـان ختـم كـردووە!».

شـەو بێ هەست و خۆست یەكەڵە و دووكەڵە ئاوایی یان بەجێهێشت و پشـووی ئۆخەیـان بـۆ یەكەمجـار دوای بڵاوبوونـەوەی دەنـگ و باسـەكە خـواردەوە. كـەوا لەڕنـەی درنـدەی هـاری خۆیـی و ئەنفالـی نەگریسـی عەرەبـی داگیركـەرەوە رزگار بـوون و:

– دەبێ ئەوە ڕاست بێت خوایە!.

كەلەكیان درووست كرد و پێش سـەگ و گورك لەیەكتر هاوێركرێن دوو سـێ ئافرەتیـان پەڕانـدەوە. لـە نـكاو غەنیمەكانیـان، دە دەدوازدە چەكدار بەسـەركردایەتی شـوانەوە تەرحـی بچنـە غـەزای داگیركـەران، بەهەڵەداوانـەوە گەیشـتنە سـەریان و گوتیـان:

– نەمانوت ئەوانە جاسووسن و زانیاری ئێمە بۆ دوژمنان ئەبەن.

– زۆر ڕاستە. ئەگەرنـا بـە حوكمـی نوێنـەری ڕاسـتەقینەی خۆیـان قایل ئەبـوون.

ئافرەتەكانی ئەو بە ریشیان بە زەبری:

– ئەگەرنەگەڕێنەوە پیاوەكانتان یەكەیەكە ئەكوژین.

ناچار گەڕانەوە و چووپەكانیشیان تەقاندەوە.

– چـاك بۆمـان ئاشـكرا بـوو ئێـوە جاشـن و پەیوەندیتـان لـە ژێـرەوە بـە دوژمنـەوە هەیـە.

پیاوەكانیان هەتا دوڕ ئاواییدا بەر سالدرمە و سیخوڕمان. لە بەراییدا كوڕەكانی مام رەمەزان، بۆ پەڕاندنەوەی خۆیان ڕووت كردبووەوەو چاك داركاریان كردن. جوێن و قسەی تڕووهات وبێزەوەریش هەر هیچ.

- گەوادینە، مەنگۆزینە، ئالچاخینە، بەدڕەوشتینە ئەزانین ئێوە گەوادی بەعسن هەر چیتان پێ بڵێین شەرمتان بە خۆتانەوە نییە.
جگە لە سەگە بۆری مام ڕەمەزان، لە دواوە بە چەکدارەکان دەوەڕی، کەسی دیکە نەبوو، لە دڵەوەش بەزەیی یان پێدابێتەوە.
«دەبێ میللەتێک لەسەر ئەو گۆی زەوییە هەبێت بۆ خۆخۆری دڕندەی ئاوایی لێ ئیجا دبووبێت!؟». چ بڕوام نایەت ناوللا.
حەمەرەحیمیان کەلایان وابوو سەری هەموو بەلاو نسکۆیانە وەک کۆسەبەبە لەنێو ئاواییدا گێڕاو منداڵانیان بە چەپڵە و فیت و هۆڕەوە دواخست. دەردێکیان دایە با بە دەواری شڕی نەکردووە. بە ئامان و زەمانی خوا لە کۆلی نەدەبوونەوە..
- هۆی ... ها.. جاسووسی بەعس هۆی.. ها...
- هۆی.. ها.. خەفیەی داگیرکەران هۆی.. ها...
- هۆی ...ها.. بەکرێگیراوی دوژمنان هۆی...ها...
- هۆی.. ها.. غەوارەی ڕەوان کراو هۆی.. ها...
- هۆی.. ها.. دوژمنی شۆڕشی نوێ هۆی.. ها...
- هۆی.. ها.. دوژمنی کورد و کوردستان هۆی.. ها...
بەردە وردکەی منداڵانیش کە تۆ بات پێیدەکەوت و ئازاری دەدا سەربار.
حەمەڕەحیم لە تاوان زۆڕەزۆڕ دەگریا و کافری حەوت دینانیش زگی بە جەستە لاواز و بێ نموودەکەی دەسووتا و فرمێسکی بەزەیی بۆ دەباراند.
لە دەسەڵاتی کەسیش دانەبوو:«
- ئەرێ ئەم ئیهانەتان لەسەرچییە!؟. ئـ هـ. هەر لەبەر ئەوەیە لەناخەوە ڕازی نییە ناموسی بکەوتە بەردەستی دوژمن و. وەلەکە عەرەب سواریان ببن!؟».

- ئەم گەوادە مل پان و تیراز. تازەمان لە کوێ بۆ هاتووە خوایە!.
- بەڕاستی گۆڕدەو چەورە و مەنگۆزی زەمانەیە!.
- بە فیتی بەعسی فاشییەوە هاتووە و راپۆرتمان لەسەر بنووسێت..
- ئـ. هـ لەبەر نەزانین و خەشیمی خۆیدا هەتا ئێستاش بیری بۆ ناچێت، کە ئێمەی پێشمەرگە لە ئاغاکەی بەهێزترین و بە سەتان گەوادی مل شۆڕی وەک ئەو نابەزین.
کەسێک گلۆرەی کەوتە لێژێ کەس خاسی پێنابێژێ:
خەڵکەکە ما دیسان سەرکۆنەی بکەن. کە لە پێودانی خۆی داناسەکنێت:
- حەقە مستە.
- ئەرێ وەللا حەقە مستە و زیاتریش .
- خۆ. تۆ لەو عالەموللایە زەریف تر نیت.
- سابیلی ئێمە مانان دانیشە و لە شین وشایی بە دەستەوایی هاوبەشمان بکە و بڕاوە.
شێخ سەدرە خێرا گەیشتە لایان و لە پەیڕەوکردنی ئامۆژگاری و نسحەتی ئەحمەدە گولە، بە ئەندازەی مرتەیەک لاگر نەدەوەستاو:«
- من ئەوی بەسەرداری خۆمی ئەزانم و ناتوانم بەهیچ جۆرێک لە ژێر فەرمانی بەڕێزی دەربچم». هەر زوو خۆی هەڵچوواند، هەرکە حەمەڕەحیمی بەم چەشنە دیت زۆر قسەی تەڕاوزانەی ئاراستەی چەکدارەکان کرد. تایبەت سەفین و شوان:
- سەت جار عەمرتان نەمێنێت، داوەشێن. سەگ غیرەتتان بخوات کەس نەما غەدری لێ بکەن تەنیا ئەم پیاوە ڕیش چەرموو.. و نیشتمان پەروەر و خاوەن ڕابردوو پاک و مەردانە، نەبێت. کە هەردەم قۆندەرە بە گووەکەی لەسەری گشتتان پیاوترە..

« ئـ..هـ نەمگوت بە شەکراو دەم خنکێنێت!».
بەسـەرهێنان و بردنی پەستییەوە وارە وارە بۆ لای خشی و بەدەست لـە ملوەراندنـدا چەنـد جـار مـاچ کردنـی و بـۆ دڵدانـەوەی گوتـی:
- بەشەرەفم، بەناموسم، بەکوردستان کەم و زۆر ئاگادار نیمە.
«سـوێند خـواردن لای ئێـوەی چەکـداری لەیاسـا و ڕەوەشـت بـەدەر قلەتەسـبیح ئاواکردنـە هـۆ بـاب».
- بەداخــەوە ئەبووایــە هــەر زوو منــت ئــاگادار بکردبووایــەوە. هەتــا نەمهێشــت بووایــە بگاتــە ئــەم ڕادەیــە.
« ئەوەشــی نیشــانەیە کــە مــن بــە کــەودەری تێــدەگات. ئەگەرنــا کەتنکــەرەکان وا لەبەرچــاوت حریتەیاندێــت. هۆبــاب».
لە ناخی عـەرەب و عەجەمـی خەڵکەکە ئاشکرابوو لەمەڕ سـەری خۆیەتی ئەگەرنـا لەبریتـی قسـەکانی مەراقەکـەی ڕوخسـەتدانە دادەمرکانـدەوە.
دوای پشـت تێکردنـی شـێخ، یەکسـەر لەبەرچـاوی عەشـاماتەکەوە، کـە شـلەژانیان پێوەدیاربـوو تـاس و حەمامەکەیـان، بـۆ هـەردوو بنەماڵـە دامەزرانـدەوە.
- ئاڵچاخینـە، بێ شـەرەفینە، ناپیاوینـە، ئێمـە خاوەنـی ئێوەی گەجـەر و گوجـەر و ئاژەڵیـن، بۆیـە دوای هەڵگیرسـانی ئـەم شۆڕشـە مەزنـە، ئـەم شۆڕشــە پیــرۆزە، کــە لــە ســۆزی ناخــی میللەتــە چەوســاوەکەمانەوە هەڵقـوڵاوە و لەسەرتاسـەری جیهانـدا بـێ هاوتایـە و. واش بنکـی داکوتـاوە هەتـا کوردسـتان لـە خائیـن و دوژمنانـەوە، یـەکلا نەبێتـەوە بـە هیـچ هێزێـک جێلـەق نابێت. ئەوجـا چمـان بـە چ نەکـردووە.
- بەڵـێ تاکـو خاوەنـی دەمـاخ سـز و مێشـک «کا» تێکـراوی ئێوە بیـن دەسـتمان لـە هیـچ پنجکێـک گیرنابێت. بەڵکوسـاڵ بەسـاڵ میـزە حوشـتر ئاسـا بـەرەو دواوە ئەکشـێینەوە.

- لە ترسی تانە و تەشەرەی پاشەڕۆژ نەبێت و جەنابی شێخیش ڕێگا بدات، گەورە و بچووکتانمان، کەوا فریزی کێوی ڕێبازی خەبات و پێشکەوتنن لە ئێستا زوو تر نییە ئەتۆپاند.
لە دەروونەوە پێکەنینی تەڵخی بەو فیشاڵە ڕازاوانەیان دەهات و:«
- ئێوە و هەست کردن بەتانە و عەیب و شورەیی کوجا مەرحەبا!».
- ئەوا ئێمەی پێشمەرگەی کوردستان چەند ڕۆژە وەبەر گوێتان ئەخوێنین: دوژمن ئەو باوکەی مرد جارێکی تر بەفڕۆکەش بتوانێت چاوی بەم ناوچەیە بکەوتەوە.
- ئەوجا ئێوەی نەفام و کەودەری لە هەموو بارێکەوە باوەڕتان نایەت و هەردەم لەخۆدزینەوە دانە و هەوای (٨٥) هەشتاو پێنج دیناری خیانەتی جاشاتی لە سەرتانی داوە و بەوپەڕی مەراقەوە، ئەتانەوێت بچنەوە قوونی خۆتان لە سەر کێری بەعسیان دابنێن و کچ و ژنە سۆزانییەکانتانیان پێشکەش بکەن.
حەمەڕەحیم چ گوللەیەکی لێ بدرابووایە، چ پێی بگوترابووایە، «جاش» کەچی هەر جارێ لەخەفەتی بێدەسەڵاتییەوە دەیکردە خێزیک و قووتی دەداوەو:«
- ڕۆڵە ئەگەری ئێمە جاش بوونایە هەرگیز بەتەوازووەوە بۆ ناوچەکەتان نەدەهاتین. بەڵکو هەروجوودیشتانمان نەدەزانی.
-: خەڵک و خواش ئاگادارن ئێمە فێرە گۆردایەتی نەبووینە هەتا بە دووڕوویی بگوزەرێنین، لەسەرەوە نیشتمان پەروەر بین و لە ژێرەوەش جاشی خائین».
- بەڵێ دڵتان بەم جۆرە نەبێت داناکەوێت. وا بۆشی سەرخۆش بوونە و لاشتان گەلێک پیرۆز و ڕەوایە.
- نەک لەسایەی ئێمەی پێشمەرگە و جانفیدای کورد و کوردستاندا، بەخۆشی و سەرفرازی بژین.

- ئەو سەرفرازییەی ئەمڕۆ هەتانە، کەوا بەرهەمی ڕەنجی تێکۆشانی ڕاستەقینەی ساڵەهایساڵی ئێمەی شۆڕشگێڕە حاڵی حازر هیچ پارچەیەک لە کوردستانی گەورەدا تامی نەچێژاوە. ئەوجا لە بریتی سوپاس و ستاییش و ڕێزگرتنمان بە هەموو هێز و تواناتانەوە دژ وەستاون و هەردەم لێی لووت و دڕدۆنگن.
- ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە چاوتان بەم شۆڕشە مەزنە بێوێنە و دەسکەوتەکانی هەڵنایەت و خواستتانە مل بەرەو هەڵدێر بنێت.
«ئـ هـ عەنتیکەیە، بە هەموو عەقڵیانەوە باسی دەسکەوت دەکەن!. وا دیارە کوردستانیان سەرتاسەر لە ژێر پۆستاڵی تورک وعەرەب و فارسی داگیرکەرەوە پاک کردۆتەوە».
ئەمەی لە دەروونەوە، بە تەوسەوەی گوت.
- خەیاڵتان خاوە: ئەو ڕۆژەی وەک ساڵانی ناوەڕاستی حەفتاکان ڕۆیشت، کە بە دەستی ئەنقەست و کون فەیەکونێک ئاشبەتاڵی لێ بکەین.
«لەبەر ئەوە سەرکردەکەتان تەرحی سەرکردەی ئەوسا کوڕە شێخە هەمان تاس و حەمام دەبێت، گریمان گەرمایی یەکی بە ئاستەم بگاتە گیانە پیرۆزەکەتانەوە نەشمرین بەچاو دەیبینین».
- شۆڕشی ئاشبەتاڵ نییە هۆ بابینە.
- شۆڕشی ڕاستەقینەی جەرگ سۆزانی میللەتە.
- شۆڕشێکە بنکەی کوردایەتی لە چوارچێوەی کوردستان وا دا کوتاوە بووەتە دڕکێکی تیژی دوڕ چاوی ئێوەو جاش و دۆستە دڵسۆزەکەتان. دوا ڕۆژیش ئەگەر نەمرین بەچاوی خۆتان ئەیبینن..
«بەڵێ وەکو گوتت، بێگومان ئەگەر عەمر بمێنێت بەچاو دەیبینین. ئێوە هی ئەوە نینە بتوانن سەر بە دوژمن دابهێنن و شتێکی لێهەڵکڕێنن.

ئێستاش لەگەڵ دابێت بەو نیمچە حوکمە زاتییە کارتۆنەی ڕەفزکراوە مەمنوون دەبن ئەگەر دوژمن بێزی بێت پێشکەشتان بکات».
تەڕلووس و بەرتراش و دەست وپێوەندەکان لە حەواوەیان قۆستەوە.
- ئەوانە بە کرێگیراو و داردەستی دوژمنانن.
«بەڵێ لەبەر ئەوە ئێمەی ڕەش و ڕووت بڕبڕەی پشتی میللەتین نەک لە ڕاستە بیروبۆچوونی ئێوە بگرە لە ڕاست بیروبۆچوونی ڕژێمی بەعسی داگیرکەریشەوە داردەست و بەکرێگیراوین».
- بەڵێ کرێگرتەی دوژمنانن.
- تایبەت ڕەوان کراون.
- داخوا هەتا ئەمڕۆ چەند راپۆرتییان لەسەرمان نووسیوە.
- ئاشکرایە و.. وتنی ناوێت.
- بۆیە پاشەڵی نهێنیمان هەردەم هەڵدراوەتەوە.
- ڕاستیان وتووە دار تا کرمی لەخۆی نەبێت نارزێت.
- بنی قسەت هێنا.
- بڵێین و نەڵێین، هەموو لە ژێر سێبەری گەمبولی گەورەدایە.
- حەوجە بەبەڵگە ناکات و منداڵیش ئەزانێت.
- گەر جەنابی شێخ ڕێگەمان بدات بە گوللەیەک لە کۆڵی ئەکەینەوە.
« بەڵێ، لەبەر ئەوە هەست بە مەسئوولیەت ناکەن دروشمتان بەعس ئاسا تەنیا گوللەیە و چیتر فێر نەبوونە».
- هەزار ڕەحمەت لە خۆت و باوکت.
- پێشتریش جنابیمان ئاگادار کرد و:
- ئەو پیاوە بەکرۆکەیە و ڕەوان کراوە هەتا تووشی سەر ئێشەیەکی ترمان نەکات پێویستە حەدێکی بۆ دابندرێت.

«تەنیا لەبەر ئەوەی هەڵوێستم لەگەڵ هەڵوێستە چەوتەکەتان یەک ناگرێتەوە و حەقە مستی کوشتنم»
- کەچی لەبەر پیاو باشی و بەروحمی خۆی گوێی پێنەداین و نەداین.
- «ترحێو، پیاو باش و بەروحممان شێخی خوێنڕێژ و ((....... )) بێت، دەبێت پیاوخراپمان چۆن بێت خوایە!».
شێخ ڕکی ئەو دنیایەی لێدەبووەوە، بەڵام نەیدەویست بە ئاشکرا دەخلی بکات. نەخاسمە لەم دەم و دەستەدا، مەبەستی بە زندوویتی چاوان دەردە ئەنفال کەوا زەندەقی لێچووبوو بچێژێت. ئەگەرنا لە ئاستیدا دارێکی ئەوەندە بەرز نییە هەتا دەستی نەیگاتێ، بە مەزەبیش شەو ڕۆیینەکەی، بێ سێ و دوو شایەنی لەناوچوونی بوو. کەچی لە ژێرەوە بڕیاریدابوو سایەدو چاودێری بکەن و نەیێڵن بە هیچ تەرحێک لە ئاوایی جیابێتەوە. هەر ئەمەش بوو شەوڕۆیشتنەکەی ئاشکرا کرد.
حەمەڕەحیم لە حەیفی لێدان و ڕیسواکردنەکەی بەرگەی نەگرت و توانای هەنگاونانی نەماو زانا و کچەکانی خۆیاندا بن پیلی و بەحاڵەحاڵ گەیاندیانەوە ماڵ. ئەو ڕۆژە شەویش بەسەر تێپەڕی وەک تەڕک لە ماڵەوە کەوت. لەسێ چوار جێگا پشت و ناوشانی لەزەبری قونداخان شین و مۆڕ هەڵگەڕابوون. ئا. لەو ساتەدا ئاخی خەفەتاوی بۆ نەتەوە چەوساوەو چارە..ڕەشەکەی خۆی هەڵدەکێشا و گینگڵەی لەهەناوەوە دەدا:«
- خەبات و تێکۆشان وماڵوێرانی و کوشتن و برین و ژیانی عەجەمەرگی، لە پێناوی سەربەستی و خۆشیدا وا لەزگە پاڵ بە سی ساڵ بدات گشت بەفیرۆچوو، هێز نییە لەو هەڵدێرە ناهەموارە پەلی

بگرێت و قوتاری بكات. سەت خۆزگەی دەخواست هەر لە ئیجادەوە بەرپا نەبووایە. هەرنا ئەورۆ ئەو گورگە هار و دەو بەخوێنانە، بەناوی كۆشان و هەستی نەتەوایەتی نەدەهاتنە كایەوەو میللەتیش ئاوا.. لێزانانە، نەدەخرایە بەردەمی بەرداشی نەمانەوە».

ئەمە لە پەڕەكەی دڵیەوە زاخاودرا بەهیچ هێز و بەڵگە و سەر دولكان نەسڕێتەوە:

- شۆڕش لەو پارچە نیشتمانەدا پەردەی ڕەشی دەقەبەڵ كراو دایەوە كەندێ و گریمان سەت (١٠٠) ساڵی تر، بەو نەوعەی حازری بەردەوام بێت، لە زیان بترازێت، سوودی جگێكی كرووزی نابێت، مەگەر((........ ........)).

سەرەداوی ئەو بۆچوونەشی دوو سێ ساڵ لەمەوبەر لەدڵغەی سەرهەڵداندابوو. كەچی ئەڤینی و پیرۆزی شۆڕش و پێشمەرگایەتی، لەناخەوەی وا سەقادرابوون و نەیاندەهێشت تۆتكە بگرێت و دەستبەجێ توریان هەڵدا:

موختار و حاجی سەعید بەتەقەتەقی دەرگاوە لەژێر پێخەفیان ڕاجفراند و بە واق وڕمانەوە:

- ها. خێرە بەو شەوە ناوەختە!؟.
- ئەوەی ڕاستی بێت لە دەست دڕندان هەڵاتووینە.
- ئەو دڕندانەی دەڵێن كێن!؟.
- پێشمەرگەنە.

هۆپێكی لە خۆزانی و بە هەشتاوییەوە:

- چما پێشمەرگە وای لێهاتووە ئەو ناوەی بە دوا بكەوێت!؟.
- تاهوو. تاهوو.. لە بێ خەبەران كەشكەك سەلاوات.
- ئەو پێشمەرگانەی پێشترت دیبوون نەماون قوربان.

حاجی سەعید گوتی:

- بە بارەبارِ هاوار دەکەن ئێمە لێمان تێکچووە با ئێوەش لێتان تێک بچێت.

موختار گوتی:

- ئەورۆ گوندێک بە هۆی تێک گیرانیان لەگەڵ دوژمندا کاول دەکرێت، وەنەبێت چەند ڕۆژێک تەقییە بکەن و بەرژەوەندی خەڵکەکە بخەنە بەرچاو. بۆ بەلاش لێیان تێک بچێت، کە جێگەی نان خواردن و حەسانەوەیانە، ڕۆژی دوایی بە ئاشکرا و ئەنقەست دەچنەوە گوندێکی نزیکییەوە. هەڵوێستیان لەخەڵک و خوا دیارە لەگەڵ هەڵوێستی دوژمن تێکدانی دێیەکانە یەک دەگرتەوە.

دەمێک پاش ئەوەی زۆری لەبەر دڵ بوو سەری ژ بەر خۆی بە کزی شۆڕ کردەوە و:

- پێشمەرگە و ئەو تەرزە. عەمەلانەیان نەگوتووە.

لە ناخەوە دەراندی و:

- چ بڕوام نایەت!.

بە چاو لە چاوبڕین و:

- ناحەقت ناگرین: ماڵت لە شارە و ئاگات لە مەحموودی بێزەوادی دنیای ئەو دڕندانە نییە و لەناویان ناژیت و خۆشەویستیت لە ڕاستیاندا وەک خۆشەیستی سەردەمایەکی ئێمەیە و بە هەوەنتە لەدڵت ڕەش نابێتەوە، بەڵام چاک بزانە و هەتا مردنیش بیکە گوارە. ئەو پێشمەرگە نەخوێندەوارە و ساویلکانەی کە لە خوو.. و ڕەوشتی کوردەواریدا دەرنەچووبوون و هەرکە دەهاتنە ماڵت پێڵاویان لەپێ نەدەکردەوە و چەکەکانیان لەسەر ڕانیاندا دەنا و دەیانگوت:

- توخوا پارە نانێکمان بدەنێ، هەتا زووە بەرچاوتان بەربدەین و

با بە سەبەبی ئێمەوە تووشی گیروگرفتێک نەبن. ئەگەر شەویش بمابووانایەوە لەمزگەفت دەنووستن، نەک لە ماڵان، جارێکی دی بەخەونی شەوانیش نایانبینینەوە.
موختار وەریگرتەوەو:
- نەخێر نایانبیننەوە.
نەیهێشت تەواوی بکات، بەردەوام بووەوە و:
- ئەمڕۆ دێنە ماڵت، لای خۆیان خوێندەوار و رۆشنبیرن بێ منەتانە کەشخەت لەسەر لێدەدەن و بە تۆبزی مریشکت پێدەکوژنەوەو حەمامیشت پێ گەرم دەکەن و....
موختار لە هەوەڵەوە نیازی بوو خۆی بیگێڕێتەوە، قسەی پێ بڕی و گوتی:
- هەر ئەوەتە، بە ئاشکرا داوای ژنەکانمان ناکەن.
- ئەوجا دوای تێربوون و سانەوەیان، بەئەنقسەت هەتا لە خەڵکەکە تێک بچێت دەچنە سەربان و هەر ئۆتۆمبێلێک ببینن ڕووی لەئاوایی یە، یان بە تەکیدا تێدەپەڕێت تەق چەند گوللەیەکی بووکانەی بەسەرداوێن.
- وێرای ئەوانەش هەر دەم عوودە لەهەرچی داب و نەریت و ڕەوشتی چاک و خراپی کوردەوارییە دەکەن.
- بەکورتی: دەیانەوێت ئەو ئەخلاقە پەسندانەی ئەمڕۆ هەمانە و لەباب و باپیرانمانەوە، لەسەری دەڕۆیین و شانازی پێوەدەکەین بن بڕی بکەن.
حەمە ڕەحیم لەمە خۆی بۆ نەگیراو:«
- وا دیارە ئەوانە لە دەواری بەعسی و داگیرکەران ئاودەخۆنەوە».
لە دڵەوە گوت و جا دەنگی هەڵبڕی و:

- ئەوەی میز بە ڕابردووی خۆیدا بکات لە میزەکە کەمترە.
ئاخێکی خەفەتاوی لە پەڕەکەی دڵیەوە هەڵکێشا و ئەو پۆستەیەی هاتەوە یاد، کە دوژمن مەرامی خۆی تێدا دەربڕیبوو:«
- ئێمە هەرگیز لە خەڵکی ناوچەکە بە ئاوات ناگەین هەتا تۆی نەخوێندەواری و دواکەوتوویی و بەدڕەوشتی و دووبەرەکی لەنێوانیاندا نەڕوێنین. ئەمەش پشووی درێژ و سەبری ئەیووبی دەوێت».
بۆی والا بووەوە:
- ئەوانە ئەگەر بەعسیش نەبن مسۆگەرە پەروەردەی بیروباوەڕی عەفلەقین و بە مووێک لایان نەداوە و ئەوجا مرازیشیانە ئاواتە گلاوەکە، کە توانانەوەی هەستی کوردایەتییە، بەعس خۆی بە هەموو تەرزە پلانێک بۆی کۆشا و مردو سۆت ڕنۆکی لێگیرنەبوو کەچی وا ئەو خوبزانەی خۆی بەوپەڕی مەراقەوە، بەناوی کوردایەتی و پێشمەرگایەتییەوە پێ لەجێ پێیدا دەنێن و دەیانەوێت لەم ڕووەوە باری بۆ ڕاست بکەنەوە. ئەمەش بە مەزەبی کەسانی نیشتمان پەروەر و شۆڕشگێڕان گەورەترین خیانەتە بەرەنگاری بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتی بووەتەوە.
هەتا ئەو ساتە خۆی لاچەپ گرتبوو..و بە ئاشکراو ڕووبەڕوو مرتە چییە لێوەی نەهاتبوو، هەرکە بەم جۆرەی لێیدەترسا ڕیسوا کرا بۆی کەوتە سەر پشت:
- ئەو دیمەن مرۆڤ و دڕندانە، تەنیا بۆ کەیف و سەیف و کات بەسەر بردن و دامرکانەوەی خروشتی نێو «...... » بە چەند...... ئاقایی مەرامیانە ئەو دەرفەتە چەند ڕۆژە کەمەی دەرباز بوون ماوە لە کیس بچێت، وا لەزگیشە لەکیس بچێت».
گوێ بیست بووبوو: «سوپایەکی زۆری بەعسی داگیرکەر بەرەو

ناوچەکـە بەڕێوەیـە».
- ژن و منـداڵ و پیرانـی ئـەو چینـە ڕەش و ڕووتـە بێدەسـەڵاتە، بـە سـانایی بکەونـە بـەر بالتـەی ئەنفالـی دمـۆرەوە.
شـارەزای سـوخەتی سـوپاکە بـوو، لـە ئاسـت میللەتـی کـوردی هـەژار و بێ سـەرکردە تەنیـا ئیهانـە و کوشـتنە و بـەس.
خەڵکەکە هێندێکیان ترسنۆکانە خۆیان بوارد بوو. و چەند کەسانێکیش بە زەبری چەک لە لەوچەیان دراوە و:«
- ئەگـەر ئەوانـە کەمێـک هەسـتی مرۆڤایەتیـان لا چنـگ بکەوتبووایـە، دەبووایـە بـەلای کەمیـەوە، تاکـو دەنـگ و باسـەکە لـە دەڤەرەکـەدا لایـەک بەلایـەک دەبـوو هانـدەری سـەرەکی ڕۆیشـتن بوونایـە، بـەڵام بەداخـەوە:« ....... « بـە تەگەیـان لابیـر و بـاوەڕ و کوردایەتییـە و بـە مەزەبیشـیان لەخـاک و میللەتەکەیـان پیرۆزتـرە».
هەر ئەو سات ئەمانە لەناخی «جمجمەیەوە» جمان:«
- ئـ. هـ. بەعسی داگیرکەر لەنێو شارو ئاوەدانی دەمانگێن، ئەوانەش لـە کێو و هەڵەتـان».
تانیدا بەر هەڵوێست و غیرەتی خۆی و:«
- ئەمـن بەدەسـتیانەوە هـەر تێچوومـە و دارێکیشـە هـەر دووسـەری بـە پیسـایی یـە و کێهـان سـەری دەگریـن بـۆ ئێمـە مانـان هەریـەک حسـێبە. کەواتـە مـردن مردنـە و لینـگ وەشـاندنم لـە چـی!. زۆر زۆر دەمکوژن. خۆ هەرنا بە چاوان کارەساتی ئەنفالی بەدبۆمی عەرەبان نابینـم». چیـدی بەخـۆی نەوەسـتاو بەیانـی زووی سـێ ڕۆژ پـاش ڕیسـوا کردنەکـە بێباکانـە چـووە سـەر بەرزایـی گوفەکـە گەورەکـەی ناوڕاسـتی ئاوایی کـە دەیڕوانییـە حەوشـەی ماڵەکانی دەوروبـەر، قیت وەسـتاو گەرچـی جەسـتەی زۆر بێ هێـز و بـە ژان بـوو، بـەڵام گوێـی

پێنەداو هەتا دەنگی لەبەردابوو دەغەزە زۆرەکەی دەروونی بەم چەشنە هەڵڕشت و سورپیش دەیزانی کوشتنی بە دوا دادێت، کەچی بەلایەوە ڕەوا تربوو نەک ئافرەتەکان بە زەقە زەقی چاوان بەر ئەنفال شووم بکەون و ببنە جاریە و کارەکەری سەربازی عەرەب پێیان ڕابوێرن و:

- هۆ.. خەڵکینە هۆ.. هۆ.. خەڵکینە هۆ.. تکایە گەورە و گچکەتان هەتاکو لێدەبمەوە، خێرا وەرن گوێ لە قسەکانم ڕاگرن، قسەکانم.. هۆ.. خەڵکینە هۆ..

- پشوو سواری و بێهێزی چەند سانییەکی ڕاگرت و:

- بە پێویستی سەرشانی خۆم دەزانم لەو ساتە خەتەر و ترسناکەدا، هەتا کار لەکار نەترازاوە، پێش ئەوەی...... خۆمان و ژن و منداڵمانیان نەخستوونەتە بەردەستی وەلەکان و خۆشمان نەکراینە.......

دووبارە پشوو سواری وەستاندی و پاشدان:

- «ئەبوو حەشیش»ی زەمانە و گەوادێکی ڕەسمی دەمەوێت ئەو ڕاستییەی لە ژێر بەڕەدایە.......

تۆزێک لەبەر بێ شنگی بێنیدا و هەرزوو با گوێداوە:

- بۆتانی خڕ هەڵڕێژم و لە دوا ڕۆژیشدا هەرچی بەسەرمن دەهێنن مەجبوور نیمە و بێ منەتم.

بەهۆی دووبارە کردنەوە و دەنگ بەرزییەوە ئەوانەی لە دوڕ ژوورەوەش بوون تەنگەتاو هاتنە دەرەوە و بە قولاخییەوە، لەهەرلاوە بەسەریدا قژقژان و چاوەچاوبوون بەم سۆرەسبیانە چ شەکرێک دەشکێنێت. لەنێو خۆیان کەوتنە کێژەنی خوێندنەوەی نەزیرۆکان:

- ئیللا بیللا بۆ شتێکی گەورەیە!.

- ئەوە وتنی ناوێت و. وا دیارە.

هەركـە دیتـی عەشـاماتێكی زۆر گەمارۆیانـداوە و چاوەڕوانـی زارینـە هەڵیدایـە و:
- بەڵـێ وەك نوێـژ و ڕۆژی لەسـەرم فـەرزە پێتـان ڕابگەیەنـم، ئایـا دەزانـن ئـەو پاڵەوانانـە، ئـەو تێكۆشـەرانە، ئـەو كوردپەروەرانـە، لەبەرچـی بەوپـەڕی سـۆز و مەراقـەوە نیازیـان وایـە و. ....
پشوو ڕایگرت دوای قیچێك سەربەخۆ دا شۆڕكردنەوە:
- بەجدیـش هـەوڵ دەدەن گـەورە و گچكـە، ژن و پیـاوی ئێمـە ڕەش و ڕووت و بێتـاوان و قوڕبەسـەر بكەوینـە نێوچاڵـی ئەنفالـی بـێ ئامانـەوە......
هەننوب پشووسواری وەستاندی و:
- ئـ. هـ لـە منـداڵ و عەقـڵ قۆڕانیـش ڕا دیـارە، كەچـی بـە داخـەوە ئێوە زۆربەتـان لەبـەر سـاویلكەیی و بێ بەزەییتـان هێشـتا هەسـتتان پێنەكـردووە و هەسـتیش پێناكـەن.
هەتـا بـە چـاو نەبینـن ئەوسـاش پەنجەگەسـتنی پەشـیمانی هەرگیـز دادتـان نـادات. بۆیـە دووبـارە و.. دەبـارە تكایـە هەتـا چـاك لەژێـر زارم حاڵـی دەبـن گوێـم بـاش بـۆ ڕاگـرن.
خەڵكەكـە لەبـەر ئـەوە تـا ئـەو سـاتە نـەدرۆ و نـە قسـەی فشـقیات و لاترقەوچیان لێبـەر گوێ نەكەوتبوو، وتەكانیش بۆنـی خوێنـی لێدەهـات بـە بتوونـی، لەهـەر لاوە بەسـرك و چرپیـەوە گەمارۆیانـدا.
بە دەنگی قاییم ترەوە:
- تەنیـا بـەس لەبـەر ئەوەیـە هەتـا ئـەو چەنـد ڕۆژەی هێـزی ئەنفالـی دوژمن پێدەنێتە ئـەو ناوچەیـە و پەلی ژن و خوشـك و كچمـان دەگرن و بـە زێـڕ و هـۆڕەوە لـە دەسـتمان ڕادەسـتێنن و لـە دوای خۆیـان بكێشـیان دەكـەن..

بێ شنگی کەمێک هەڵوێستەی پێکرد و بەتەوسەوە گوتی:
- هێندێک لەو پێشمەرگە گیان لەسەردەستانەماندا گرێ...... بە......
دادەمرکێننەوەو زیاتر لە گۆڕێ نییە.
دیسان هەڵوەستەی کرد و:
- سوێند بە هەرچی موقەدەساتە، بەسۆزەوە دەخۆم لای خەڵک
و خواش شاراوە نییە، ورد و درشت و ژن و پیاومان بە قوربانی
((........)) دەکەن و بەس.
خەڵکەکە یەکسەر تێکڕا عاجباتیان بە چەسارەتەکەیەوە هات و
زۆربەیان خەیاڵیشیان بەلای ئەمەی گوتی دانەدەوەراوە و چۆن
تاسای کرد بەم تەرزە دامێنی...... لەبەرچاوی عەشاماتی خەڵکەکە
و هەڵداتەوە.
کەفی لالغاوانی بەهۆی قاییم قسەکردندا سەری هەڵدابوو سڕینەوەی
بێنی پێداو:
- کەچی ژن و منداڵی سەرزلەکانیان، کە هەردەم لەژن و منداڵانی
ئێمە مانان ماقوول و خانەدانەتریاندا دەنێن، هەتاکو ئەزیەت نەکێشن
و تۆزی پیرۆزی شەکەتی خەباتی کوردایەتییان لێنەنیشت وا لە تاران
و هەندەرانەوە، بەوپەڕی حەز و خوایشتیانەوە، لەبارِ و کەنار دەریا
و شوێنە گشتییەکاندا دەگوزەرێنن و هێندێکیشیان «...................»
دەمێکی بۆ پشووودان لێگرتەوە و:
- هۆ. خەڵکینە هۆ.. خۆ چاک حاڵی بوون چم گوت: ئەگەر نا بە
چاوان دووپاتی دەکەمەوە. ئەوەش بزانن لە ڕاست ئەوەی پێویستی
سەرشانم بوو، ویژدانی خۆم، کە شەو و ڕۆژ مەراقم بوو تەواو
داکەواند. ئەوجا ئێوە، یان خەڵکانی تر بڕوا ناکەن و پێ قولاخ نابن
بە گونی کوڕمەوە.

دەیزانی میللەتەکەی بە هەموو بارێک دێنە بەرێ تەنیا نامووس نەبێت، وەڵامی دەدەنەوە. لەناوەڕاستی خەڵکە تێک قژقژاوەکەدا رەمەزان بە دەنگی بەرز و تاسانەوە لێیوەرگرتەوە و:

- دەگ دایک و باوکم بە قوربانی ئەو زارە بە غیرەت و بێباکەی نەوەی ڕووتان بن.

ئەمە هەستی زۆربەی خەڵکە ساویلکەکەی، کەوا بە قسەی شێخ و سەفین و شوانەوە باوەڕیان هاتبوو جۆشدا و:

- کوڕە وەللا لە کونی کارکیش ڕاسترە!.

پشووی ئۆخەی دڵداکەوتنی خواردەوە و دیسان بەو پەڕی گوراح خۆشییەوە:

- بەس تکایە، تکایەکی دۆستانە، تکایەکی کوردانە، تکایەکی بێدەسەڵاتانە لەو چەک لەشانانە دەکەم، کەوا هێشتا هەستی مرۆڤایەتییان لە دەروونندا ڕەش نەبووەتەوەو شەرەف و جەسارەتی کوردایەتی و پێشمەرگایەتیان لەناخی قەپاخی مێشکیان نووزەی ماوە، لەڕاهی خوا، لە ڕاهی ئەو بیروباوەڕەی خۆشییان دەوێت، نەیێڵن ئەو هەزارە زیلە پەپوولە بێتاوانانە، بۆ خاتری دووچاوی ئەو........، ...... ناگەنە پەنجانی دەست بە فەتارەت بچن.

هیلاکی چەندسانییەکی وەستاند و تێیهەڵکردەوە و:

- هۆ. کوڕە بە جەرگ و جەسوور و خاوەن قۆناخی گەرمیان و دەشتی هەولێر و ساڵەیی یان هۆ.. دەستم داوێنتان و. وەک عەرەبی بەری بەغداییتان دەخیل بم، وەک خوبزە و خزمەتکاری دەست و پێڵاوەکانتان ماچ دەکەم تۆزێک غیرەتێک، بڕە مەردایەتی و هیممەتان بزوێت و بەرپەرچی ئەوتاوانە، بێ ئامانەو ئەو خیانەتە گەورەیە کە بە عەمری باب و باپیرانەوە نەماندیتووە، مەردانە بدەنەوە و مەهێڵن سەربگرێت.

دەیزانی میللەتەکەی بە هەموو بارێک دێنە بەرێ تەنیا نامووس نەبێت، وەڵامی دەدەنەوە. لەناوەڕاستی خەڵکە تێک قژقژاوەکەدا رەمەزان بە دەنگی بەرز و تاسانەوە لێیوەرگرتەوە و:

- دەگ دایک و باوکم بە قوربانی ئەو زارە بە غیرەت و بێباکەی نەوەی رووتان بن.

ئەمە هەستی زۆربەی خەڵکە ساویلکەکەی، کەوا بە قسەی شێخ و سەفین و شوانەوە باوەڕیان هاتبوو جۆشدا و:

- کوڕە وەللا لە کونی کارکیش ڕاسترە!.

پشووی ئۆخەی دڵداکەوتنی خواردەوە و دیسان بەو پەڕی گوراح خۆشییەوە:

- بەس تکایە، تکایەکی دۆستانە، تکایەکی کوردانە، تکایەکی بێدەسەڵاتانە لەو چەک لەشانانە دەکەم، کەوا هێشتا هەستی مرۆڤایەتییان لە دەروونیدا رەش نەبووەتەوەو شەرەف و جەسارەتی کوردایەتی و پێشمەرگایەتیان لەناخی قەپاخی مێشکیان نووزەی ماوە، لەراهی خوا، لە ڕاهی ئەو بیروباوەڕەی خۆشییان دەوێت، نەیێڵن ئەو هەزارە زیلە پەپوولە بێتاوانانە، بۆ خاتری دووچاوی ئەو........ ....... ناگەنە پەنجانی دەست بە فەتارەت بچن.

هیلاکی چەندسانییەکی وەستاند و تێیهەڵکردەوە و:

- هۆ. کوڕە بە جەرگ و جەسوور و خاوەن قۆناخی گەرمیان و دەشتی هەولێر و ساڵەیی یان هۆ.. دەستم داوێنتان و. وەک عەرەبی بەری بەغداییتان دەخیل بم، وەک خوبزە و خزمەتکاری دەست و پێڵاوەکانتان ماچ دەکەم تۆزێک غیرەتێک، بڕە مەردایەتی و هیممەتتان ببزوێت و بەرپەرچی ئەوتاوانە، بێ ئامانەو ئەو خیانەتە گەورەیە کە بە عەمری باب و باپیرانەوە نەماندیتووە، مەردانە بدەنەوە و مەهێڵن سەربگرێت.

ماندووبـوون هەننـۆب ڕایگـرت و زۆریشـی حـەز لێبـوو زوو چـی لـە هەگبـەی دەروونیدایـە بۆیـان خـڕ هەڵڕێژێـت و:
- حـا.. هــ دە هەوڵێک، تەقەلایەک بدەن. خۆ چ لە مەزەبتان وەرناگەڕێن. هەرناوا بکەن ئەو ئافرەتە خۆشەویستانەی تایەن، با خڕیان بگێڕنەوە، یـان خـۆ دنیـا کاول نابێت و کابـە ناڕووخێـت تـخ........، ....... بکـەن و ڕوحمێکیان پێماندا بێتەوە و بە بنیادەممـان لـە قەڵـەم بدەن.
هیلاکی سـەری پێ شۆڕکردەوە و لـە بەرزکردنەوەیدا خەڵکەکە حسیان ڕەنگـی لەحیدەتـان تـەواو پەڕیـوە. تاکـو بەرپەرچـی نەزیرۆکەکانـی نەدەنـەوە، ئاواتـی بـوو هـەر زوو تـەواوی بکات.
- هەتـا کار لـەکار نەترازاوە و نەکەوتووینـە بـەر کەلبـە تیـژی گورگـە ڕووتـەی بیابانانــەوە ئـەو سـاچارە لەدەسـت دەڕوات و ناگەڕێتــەوە، مەردانـە ڕێگـەی ڕۆیشـتنمان بـدەن.
تەرحـی گاڕدان و هانـدان. ئێـ هـ بەڵکـی لەکەلـی شـەیتانی بێبەزەیـی دادەبـەزن لێینەگرتــەوە و.
- دەی لەوچاوەتانـە و بـە قوربانـی دەسـت و تفەنگتـان بـم. بەقوربانـی هـاژەی هاوەنتـان بـم. کـوڕە تـەرزی ژنـان بەلاگێـڕی نەعرەتـەی مەیدانتـان بـم. ڕێ مـەدەن. ڕازی مەبـن ختوخـوڕا ئـەو هەمـوو خەڵکـە کەسـک و سـۆر و نازدارانـە ببنـە قۆچـی قوربانـی ((........، ........)) تـەڕ و بێویـژدان و دڕنـدان.
ئەو قسـانە لـەو سـاتە پڕ مەترسییەدا گۆترە نەبوون. یاخـی و دەربڕینی هەسـتی تووڕەیـی و ناڕەزایـی و دەروونـی و هەڵگەڕانـەوە و دژایەتـی بـوون. کـە تـا ئـەو وەختـە کـەس بـە خەیاڵیـش خـۆی لـە قەرەیانـی نـەداوە، بـەم چەشـنە هێرشـیان بکاتـە سـەر و پرتۆخیـان بـە بـا هەڵدات. زۆربـەی ئـەو چەکدارانـەی کـە خـۆی دەخیـل کـردن بـۆ سـونەتیش

قـوڵاخ نەبـوون و هەسـتی مرۆیاتـی لـەم ڕووەوە تەكانـی كـەم و زۆریشیان پێـەدان و لەبـەر ئـەوە جلەوداره‌كانیـان، بێ قەید و شـەرت لا هەمـوو شـتێك بـوون و خۆشـییان دەرویێشـێكی حارگرتـووی جـێ بەجێ كردنـی فەرمانیـان، كەلایـان ئایـەت و حەدیسـی قودسـی بـوون، بـە خـڕەی گوێژیـان شـوبهاند.
كەچـی زۆربـەی خەڵكەكـەی هەڵچوواند و پفدان و كردنیانـی بـە دوو بـەرە و زۆرتریـان لایەنگیرێكـی وا لەسـەر دەسـتانیانی راگرن، ئەوانـی دی دژ و بـۆ ڕیسـواكردنی بـە حـەوا هەڵبچـن. هـەر بابـا بـوو، بـە گوێـرەی حـەزی دڵیـەوە دایـە بـەرێ و :
- قسـەكانی هیچی خیلاف نین، بـەڵام بە مەزەندەمـان خراپ بەسـەریدا دەشكێتەوە.
- ڕاست و حەقن، حەقیش ئەمڕۆ، نەخاسمە لە ناوچەكەماندا تاڵە.
- ڕەنگە كوشتنی بەدوا دا بێت.
- ئـ.هـ ڕەنگەی ناوێت هۆ باب.
- ئێمـەش ئـەو قسـانەمان ئەزانـی، بـەڵام نـاكات عاقڵـی دەسـت لەدەمـی گورگـی هاروەربدەیـن.
- ئـەو كابرایـە عەنتیكەیـە!. لەوەتـی پێیناوەتـە دێیەكەمانـەوە خـۆی هـەردەم دوورەپەرێـز گرتـووە و نقەچییـە بـاش و خـراپ لـەم بـارەوە لێینەبیسـتراوە، كەچـی نازانیـن چـۆن وا ئەمـڕۆ. تاسـای ئـەو جـۆرە قسـانەی هەیـە!؟.
- فەرموودەكەت زۆر. ڕاستە.
- ئەزانن بۆ!؟.
ئەو وتە قاییمەی مام ڕەمەزان بووە سەرنج كێشی خەڵكەكەوە.
- مـن ئـاگادارم: ئـەو سـوڕ دەزانێـت ئەوپـەڕی دوای دوو سـێ ڕۆژی

تـر ئاوەڵکراسـی ژن و کـچ و بووکـی ئەکەوێتـە دەسـت دوژمنـەوە. تاوانەکـەش تەنیـا لـە ئەسـتۆی ئەمانـە دایـە و ئـەوەی لێشـی ئەترسـا کەسلاح شکاندنە لـە نێو ژن و منداڵـە ورتکـە ئاوایی بەسـەریان هێنـا، بۆیـە هەنووکـە بـە کوشـتنیش دێتـە بـەرێ.

- جا ئەوەی جەنابت فەرمووی چارەیە؟.

- نەخێر. تەنیا گوللە لای ئەوانە چارەیە...

زۆر بەهێدیەوە وەی گوت.

- بەڵام ئەم وەک ئێمە حیز و ترسنۆک نییە، هەتا لە هەموو ڕووێکەوە گـوێ بـۆ تـاوان و غـەدران شـۆڕ بـکات. غیـرەت و جەسارەتیشـی لـە گشـت لایەکمانـەوە شـاراوە نییـە و لـەم دەم و دەسـتە حەرەجەشـدا پێویسـت بـە وتـن ناکـەن. کـەو تـراش بـەردی ڕووتـان ئەبڕێتـەوە. دڵـی هەرگیـز تەحەمولی هاتنی ئـەو کارەساتەی چاوەڕوان ئەکرێـت نـاکات. بۆیـە بـە مەراقـەوە بـەرەو پیـری کوشـتن هەنـگاوی نـاوە و ئەنێـت، نـەوەک بـە زیندوویتـی چـاوان ببینێـت. یـان هەرنـا پـاش کوژرانـی ڕەنگـە ڕێگـەی منداڵەکانـی بدرێـت، سـەر بـۆ لایـەک هەڵگـرن.

خـاوەن وتـەکان لایەنگرانـی بـوون و نەبـادا بـەو گەرمـا و گەرمـە زەربەیەکـی لێبـدەن، بەنـاوە خۆیـان گـرت.

هەرگیز بەخەیاڵیش بۆینەدەچوون شێخ نیازی کوشتنی نییەو نەبووە. دژەکان بـە جارێـک پـڕ هەڵمـان و پەنجـەی دەغەزیـان لێدەکرۆشـت. بەوپـەڕی هەڵچوونـەوە لەپێکۆڵـی هەڕەشـە و گوڕەشـەی کوشـتن وئـازاردان، کـە زیاتـر فێرنەکرابـوون دابـوون و:

- ئەو کابرایە ئاگری ژێر «کا»یە.

- کوڕە بە کرێگیراو و خەفیەی ڕژێمە و تایبەت ڕەوان کراوە.

- ئاشکرایە و حەوجە بە ئەنگوست ناکات.

- ئەگەرنا چۆن زاری دژی کەسانی ئەم شۆڕشە مەزنەمان پچڕا ئاوا گووان بخوات.
- بۆیە پێویستە توندترین سزابدرێت.
- بەڵێ پێویستە تاکو یەکێکی تر لە ئاست پێشمەرگە و شۆڕشە مەزنەکەمانەوە پەتکی ئاوا بەرنەداتەوە.
بەتێک قژقژاوییەوە بەرەو ئەو شوێنەی حەمەڕەحیمی لێوەستابوو تەکانیاندا بەرخۆیان و جگە لە قسەکانی پێشوو دوو سێ کەڕەتی بەرگوێ کەوت پێیدەڵێن: «جاش». ئەویش بە مردنی خۆی دەهاتە بەرێ، نەک بەم ناوە. چەند جاری دیکەشی بەر گوێ کەوتبوو، بەڵام وەک ئەو ساتە بۆی نەڕەخسابوو پڕ بە پێست وەڵام بداتەوە. چەندی کردی و کۆشا توانای زارگرتنی نەماو کە تا ئەو دەمە لێیگرتبووەوە. بە دەنگێکی بڵند هاواری کردو:
- نەخێر عەفووتان فەرموو: ئێوە قیاس و نەفس دەکەن. خەڵک و خوا دەزانن من جاش نیم و هیچ ڕۆژێکیش لە ژیانمدا جاشایەتیم نەکردووە و ناشیکەم، بەڵان جەنابی تێکۆشەرتان چەند ساڵ و حەیام جاشی دوژمن و داگیرکەری هەردوو دیو بوون، نەخەسە لە ئەمڕۆ جاشێکی بە تەنتەنەی داگیرکەری ئەو دیون. کە بە خۆتان لەمنی باشتر دەناسن، لەوەتی چاوی لە دنیای ڕوون هەڵێناوە فرچکی بە دوژمنایەتی گەلی کوردی گرتووە. ئەوجا لەلاتان بووەتە پێغەمبەری ڕزگارکەرتان و لەکاتی شەڕو تێقوچانتاندا ئا...... تایبەتیتان لە ژێر لاتەکی جوبان بۆ ڕازایتەوە. هەردەمایەکیش ترسی گیانە شیرینەکەتان غەزەرەی دەرکرد تەنگەتاو و موشتاقەوە خۆتان لە میللەت پڕ زەبراوەکەتان هەڵداوێرن و سەری زیارەتی کڕنووشی پێدادەگرنەوە و پشووی ئۆخە و ڕەحەتی تێدا دەخۆنەوە، کەوا

پێشتر خەڵکتان پێتاوانبار دەکرد و خیانەتتان دەدا پاڵ و سوێندتان دەخوارد:«
- ئێمەی شۆڕشگێڕ هەتا ماوین ئەو خیانەتەی ئەنجام نادەین و بگرە ........، ....... میللەتی خۆمان دەژێنین و نە یارمەتی لەداگیرکەری ئەو دیو. وەردەگرین و نەخۆشمان دەخەینە کۆشییەوە».
- نەک وەک ئێمە مانانی ڕەش و ڕووتی بێ خاوەن جێی پشووی سانەوەمان دوڕ ژووری ماڵەوە و کونە فیرار و بەند و سێدارە.
دۆستە تازەکانی بە پێچەوانەی غەنیمەکان دەوروبەریان بەرنەداو لە نێو ئەو هەموو لەوغە و هەللایەدا چاک لێیحاڵیبوون و ئەم کەڕەتە ترسی نەک ئیهانە، بگرە کوشتنیان لێ نیشت و هاواریان بەرز بووەوەو:
- دە بەسە بیبڕەوە ماڵوێران!.
- بە زەمانە ڕەپەکەی خۆت بووەستە کاکە گیان.
- ڕاستە ئەڵێن: زمان بەڵای سەرە..
- بەهۆی ئەو قسە زلانەت خۆت ئەخەیتە نێو گڕی ئاگرەوە و ئەوجا داشناکەسێیت و ئەتەوێت بەنزینی پێدا بکەیت.
تەنیا مام ڕەمەزان نەبێت هەرکە دووبارە ئەو جورئەتەی لێ بیستەوە:«
- مەڕ تیلک بە گورگەوە دەکات» زۆری کەیف پێهات و خۆشەویستیەکەی لە دڵی پتر چەکەرەی کردو بە چاوی شانازییوە دەمێک سیرەی لە دیمەنی گرت و. ویستی هەنئۆب ئافەرینی لێبکات، کەچی لەم ساتەدا حسیا گیانی لەم مەترسیدایە وگێڕایەوە و بە خەڵکەکەی هەرچوار ئاڵی ڕاگەیاند و چڕتر دەورەیاندا هەرکە گوتی:
- کوڕینە بە قوربانە و لەو چاوەتانە مەهێڵن غەنیمەکانی بگەنە لای.

لەوە بێ ئاگا بوون کەوا دە هێندەی تر جوێن بدات شێخ سەدرە، لە ژێر فەرمانی ئەحمەدە گولە بستێک لانادات. ئەگەرنا لە ژێرپەڕەکەی ئاسمانیش بووایە هەتا ئێستا پەلەواژی دەکردەوە.

* * *

چینە چەکدارێکی کەمی تری دەڤەرەکە، وەک دەست بەسەر وابوون. لە هیچ شتێک سەربەست نەبوون سەرکردەکەیان «خەلیل»ی برازای مەلا سمایل، بە شێخیان ڕاگەیاند کە تازە لەگەڵ سەفین لە خەو ڕابووبوون.

- ئێوە بە ئەنقەست ئەو گۆبەندەتان بۆخۆتان ناوەتەوە.

لە ئەوی چاکتر دەزانی بەس هەتاکو بڵێن، قسان لە خەڵک وەردەگرێت گوتی:

- چۆن!؟

ئەویش لای روون بوو لە فەردەی «کا» دەدات، بەڵام بە پێویستی سەرشانی بۆ دوا ڕۆژی دادەناو:

- ئەو خەڵکە بێ چەکە، لە دڵیان چەقیوە، هێزی دوژمن لە هێزی ئێوە ناگەڕێتەوە و دەشگاتە ناوچەکە، بۆیە زۆر بە پەرۆشی قوتارکردنی ژن و منداڵیانن. پێش کارلەکار ترازانی.

لە دنیای ئەوان بێ ئاگابوو، مردنی خۆیان لاڕەواتر بوو نەک جێبەجێ کردنی داواکە.

- ناحەقیش نین و مافی ڕەوای خۆیانە و لەسەر جەنابیشتان پێویستە لەم ڕووەوە بە هەموو تواناتانەوە یارمەتییان بدەن. پاشەڕۆژیش گەورە و بچووکیان بەسەر و ماڵ و قەردارتان دەبن و لە ژێر باری چاکەتان هەتا هەتایێ دەرناچن. کەچی ئێمە سەرمان لەقەدەغەکردنیان شێواوە و هەرگیز نازانین هۆیەکەی چییە.

ئەمە جار لە جار شێخی پەست تر دەکرد.
- هەرکە بۆچوونەکەشیان ڕاست دەرچێت تاوانەکە تەنیا دەکەوێتە ئەستۆی جەنابتانەوە.
حەمەڕەحیم لە دەروونەوە:«
- مادام جلەودار شێخ و سەرەک عەشیرەت بن لە مەزەبی ئێمەی کوردەواریدا «لەمەچێترن» و سەتان جاریش خیانەت بکەن بۆیان هەرگیز بە تاوان نانووسرێت. ئەگەرنا دەبووایە لە خیانەتی یەکەمەوە نەهێڵدرێت بێنەوە مەیدان».
شێخ بەبۆچوونەکەی پشکی دەهێنا و لەسەری بە داخزانی سام و هەیبەتی لەنێو دڵی خەڵکە بێ ئەنواکە دەشکێتەوە. سەریش بۆ هەموو شتێکدا بنوێنێت بۆ ئەمە هەرناو، بەوپەڕی هەڵچوونەوە گوتی:
- خۆ ئەوان لە ئێمە زێتر نینە وا لە پێناوی ئازادی ئەواندا گیانی خۆمان هەردەم لەسەردەستمانە.
غەزەب بەسەریدا زاڵ بوو، لە دەگ دەگ و شەیتان بە لەعنەت کردن گەڕاوە، ئەو دە دوازدە کەسەی بێ سێ و دوو بدەنە بەر ڕێژنەی کلاشینکۆفانەوە.

* * *

هەر سێ دەستە گشت لەم هەللاو زەنایەی دەبێت و نابێت و چۆن دەستیان لە حەمەڕەحیم گیر ببێت و بۆ هەتا هەتایێ تەمبێی بکەن و بەرپەرچدانەوەی بە گوڕی دەستەکەی تردا بوون، لەنکاوڕا بە خەونی شەوانیش بۆی نەدەچوون گڕەی فڕۆکە و نرکەی مەترەلۆزی دوژمنان بەرگوێ کەوتن.
خەڵکەکە لێکرا: گەورە و بچووک، چەکدار و بێچەک، بە جەرگ

و قەلـەرزاو هەڵوێســتدار و عولعولــی، لــە ترســانا چۆکــی ورەیــان دەلحـاز قوچـاوە و دۆخینـی غیرەتییـان پسـاو کێشـە و خنکـە ملانێیـە بەهێزەکەیـان، کەداروبەردیـان دەکرۆشـت، لـە ناخـەوە تـوورِ هەڵـداو نەخاسـمە ئـەو چەکدارانـەی دەیانکوشـت و نەیاندەشـاردەوە تـەرزی شـەکرۆکە بەسـەربووکەوە دابگرێت، دەلحـاز بێ ئـەوەی کـەس ببێتـە بـرای کـەس گەنـم گـرد و جۆبلاوەیـان لێکـرد. بـە چاوقوچێنێـک ئاوایـی یـە قەوغەکـە دەتگـوت ئـاوی تیـوەردراوە، بـۆ سـونەتیش چەکدارێکـی لێنەمـا و بوونـە ئـاردی نێـو دڕکـەوە و:«
- ئـ هـ کوتەک دەزانێت قۆناخ لە کێیە!».
پێشتریش لە نێو ژن و منداڵان سینگی شانازیان بستێک هەڵدەکێشاو:
- تـازە ئێرە بووەتـە مەڵبەنـدی سـەربەخۆیی هەتاهەتاییمـان و داگیرکـەر هەرچـی تـۆپ و تەیـارەی هەیـە و بەکاریـان بهێنێـت زەڕەیـەک کارمـان لێنـاکات.
حەمەڕەحییـم سـوڕ دەیزانـی بـەو رۆژەیـان دەگەیەنـن. گریـان هەوگـی گـرت و هەتـا چەنـد دەقیقەیـەک تاسـا و مرتـە چییـە لێـوەی نەهـات و بـە حاڵەحـاڵ توانـی ئەمـەی لەناخـەوە بدرکێنێـت:
- ئەمەیـە هێـزی خەبـات و کوردایەتیـی ئـەو سـەرکردانەی کـە ڕەگیـان لـە خیانەتـدا. داکوتـاوە.
چەکدارەکان بیلبتـوون، بێ ئـەوەی خەمێـک، مشـوورێک لـە دەربازبوونـی عەشـاماتی خەڵکـە بێدەرەتانەکـە بخـۆن، یـان ڕێ و شـوێنێکیان بەزاریـش بـۆ پێشـینار بکـەن، یاخـۆ هەرنـا بەرپەرچـی بۆچوونەکـەی حەمەڕەحیمـی ناحەزیـان بدەنـەوە، تەکانێکـی مرۆیانـە لەخۆیـان بـدەن و دەری بێخـن کـە بەڕاسـتی پێشـمەرگەی ئـەو میللەتـە پـرزە براوەنـە. پاشـدان ئاخـی پەشـیمانی و بێدەسـەڵاتی و حەسـرەت لەبەردەمیـان هەڵکێشـن و بڵێـن:

- چیمان لە توانا دابوو، بۆ ئێوەمان ئەنجامدا.
تەرحی نە بایان دیبێت و نە باران چەکی فەخفەخەیان، کە هەردەم شانازیان پێوە دەکرد لێبووە قەزا و بێ نقە لەبەروەهاتندا بەخۆیاندا شۆڕکردەوەو وەک پێشتر خۆیان بۆ تەیار کردبێت، بێ ئەوەی دووکەڵ لە لوولەی تفەنگیانەوە دەربێت بە موشتاقەوە ئەو دیو بەرەو...... ڕازاوەکەیانەوە خۆت بگرە و واهاتین. بەماوەیەکی زۆر کەمی چاوەڕوان نەکراوی هەرگیز ناوچەکەیان چۆل کرد.
حەمەڕەحیم پاش ئەوەی لە ناخەوەی سەقادرا، بوونە گزرەی بەر هوڕەی ئەنفالەوە، ماوەیەک سەری قاروخەفەتانی بادا و هەناوی تەژی و دەرد و کەسەر، بۆ بێکەسی خۆی و خەڵکە مەزلوومەکەوە، لە دەروونەوە کورکایەوە و فرمێسکی بێدەسەڵاتی لە دیدانی دوو ڕیز قەتارەی بەستاو دەلحاز چاوانی سووڕ هەڵگەڕان و ڕووی دەمی غەزەبی لەو کەسە بێ چەکانەی لەدەور و بەری بوون کرد و گوتی:
- ها.. قسەکانم دەرحەق ئەو پاڵەوانە بەزیوانە ڕاست دەرچوون، یان درۆ؟!.
بەئاخێکی دەهریی درێژدادڕەوە:
- مانگ لە چواردەیە و هەنووکە حەوجە بە ئەنگوست ناکات و لە دڵانییان چەسپاند: کەوا ڕێککەتنێکی نهێنی بۆ گیرۆدە بوونی ئێمەمانانی بێتاوان و چەک لە نێوان هەردوو هێزدا بووبێت:«
- هێزی داگیرکەر و هێزی خۆخۆر».
ماوەیەک خۆی بە سڕینەوەی فرمێسکە درشتەکانی خەریک کرد و:«
- تازەش مەگەر خوا دەنا هێز نییە لە گەرۆمەی مردندا قوتارمان بکات».

ڕەمەزان لێیبوەرگرتەوە و:
- ڕاست ئەکەیت!. تا نەماننا لە تەبەق نەمانگوت: ئەڵلاهو. سەدەق.
بەڵگەی بەهێزیشیان بۆ واژی بووەوە لە دوای ڕۆیشتنی چەکدارەکان، لە دەڤەرەکەدا هێزی ئەنفال دەلحاز لە هەر لاوە گەمارۆی ناوچەکەی وادا باڵندەش توانای دەربازبوونی نەبێت.
خەڵکەکە ئەوکات زانیان کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە و بۆچوونەکانی حەمەڕەحیم لە کونە کارک ڕاستتر دەرچوون. نە خەسەلە هەرکە بە چاوی خۆیان دیت ڕێگای دەربازبوونیان بە بارەبار، لەلایەن هێزەکەوە هەتا دوا کەسیان درا. زۆربەیان کە تا ئەو ساتە بە درۆ...و بوختانیان لەقەڵەم دەداو لە ژێرەوە تف و نەفرەتی غەزەبیان حەواڵە دەکرد و:
- پیاوێکی بلح و ئاژاوە چییەو بۆیە باوەڕی بە پێشمەرگایەتی نییە.
پێشتر لە پەناوە، لای هێندێکیان، کە لە زاریان ئەمین بوو زۆری لەم ڕووەوەی ڕستبوو:«
- بڕوا بکەن لەو ڕۆژەی ماڵی یەکتریان سووتاند و باجە پێشمەرگایەتییان، لە کەس و کاری یەکتریان ساند و بێ مەحکەمە دیلیان گوللە باران کرد بوون بە جاشێکی چەمووش و خوێنرێژی میللەتی خۆیان و هەرگیز ڕەوا نییە ناوی پێشمەرگەیان پێ لەکەدار بکرێت. بەڵکو یاجوج و ماجوج و پێشفیتنەی ئاخری زەمانن. بۆ ئەوەی خۆیان لەسەر. ورگی برسی ئێمەی بێکەس پێ بگەینن بەعسیانە، بەهەموو چەشنێک هەوڵدەدەن چی ئەخلاق و ڕەوشتی مرۆڤایەتی و کوردەوارییە، لە دەروونان ڕەش کەنەوە. ئەوکات بە سانایی دەتوانن و بە ئەرکێکی ڕەواشی دەقەبلێنن چەرمە سەرانێمان پێ بکەن و لە توانای کەسیش دانەبێت لە ئاستیاندا بڵێت «لەل».

بەڵێ مێشکی ئێوەی دوورنەبین و بێ غەلل و غەشیان وا زاخاو داوە، بە هاریان بە درۆ و زمانە لووسەکانیانەوە هێنابووە چۆکان و خەبات و تێکۆشانییان تەنیا بۆ هێنانەدیی ئازادی و پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی جەنابتانە و بەس. هەتا ئێوارەش بۆتان برێسین نازانین لەناخی بیروباوەڕەیە، یان لە ترسانا جگێکی کەنووش ناهێنێت.

ماندوویێتی بینێکی باشی پێداو:

- کەچی لە ڕاستیدا، دوا ڕۆژ بێجگە لەزەرەر و زیان و ستەم و زۆرداری، هەتا ئەمرۆی حازری چاکەیەکیان بۆ سونەتیش لێوەرنەگیراوە و لێشیان وەرناگیرێت.

خەڵکەکە دەم لەدەم زەینیان بە سۆزی باوەڕەوە ڕشتر بۆ ڕادەگرت.

- ئاخر کەسانێک بەرۆکی هەرچی داب و نەریتی بەجێ و مرۆڤایەتییە هەڵماڵێت ئەوجا بە پێشکەوتنی قەڵەم بدەن چییان لێڕەچاو دەکرێت. ئەوا چەند ساڵە، بەناوی شۆڕشی نوێوە، کوردستان جگە لە کوشتن و برین و ئاژاوە و دوو بەرەکی و خانووسووتان و سەرانەساندن و ئازار و ئەشکەنجەدانی خەڵکی ناوچە چ سوودێکیان وەبەرهەم هێناوە».

- پاش باران کەپەنک بەکەلک چیدێت. ئەمرۆ وا لەلایەن هێزی ئەنفالی وەحشی عەرەبەوە گەمارۆ دراوین هیچ شتێک دادمان نادات مەگەر عزرائیل.

گەورە و بچووک، ژن و پیاو، وەک خۆڵی مردوویان بەسەردا بکرێت کزو مەلوول و بێحدوورو چاو ئەبلەق و لێو بەباری تەتەڵە دار و دەروون تژی کە سەری وا بە دیتنیان زەندقیش ئاگری تێبەردەبوو. هەرچی ڕووناکی ژیان بوو لەسکۆڵەی چەپی دڵیانەوە بنەگەی

پێچاوه و چاوەچاوی مردن و زندەبەچاڵ بوون. لە زۆر ماڵ و کوچە و کۆڵاناندا زیڕوهۆڕی ژنان و بابە و براڕۆی پیاوان دەبیسترا.

- ئەی هاوار.. هەیشـ..ش لە خۆمان بێکەسێ ڕۆ....

- وەیڕۆ.. لە خۆمان سەربەهەشێ ڕۆ....

- وەیڕۆ.. لە خۆمان چارەڕەشێ ڕۆ....

- وەیڕۆ.. لە خۆمان قەلەندەرێ ڕۆ....

حەمەڕەحیم زەندەقی لەو ڕۆژە چووبوو. ودەشیزانی داوێکی مکوومە و سەری خیانەتەکەی بەدەست شێخی چەمەرییەو قوتاربوونیان موستەحیلە. کەچی تەنیا باڵ و بێ چەک چی لەگەڵ ئەو چەکدارە بێمرووەتانە پێنەدەکرا:«

- دەبێ بە ساخ و سەلامەتی لەدەست ئەو کۆرە بژ و بێویژدان و مرۆ نەناسانە دەرباز ببین و نەکەوینە تۆڕی ئەنفالی عەرەبی داگیرکەرەوە؟».

شەو و ڕۆژ لە خەیاڵیدا نەدەتۆرا.

لە حەیفی هاتنی هێزی ئەنفالی قڕانی کوردەوە هەر ئەوەتە هۆشی لەبەرمابوو. ودەست بەجێ تووشی ئیستیغراق و زەحیری بوو. ئەویان بە دەرمان و پارێزی زووبەریدا، کەچی ئەمیان بەهیچ کلۆجێکەوە چارەی نەدەکرا:«

- یاخوا بەخێربێت هەر تۆمان مابوو سووورە گوڵی باخان!».

خەڵکە بێ خاوەن و پرزە براوەکە، کەوا گەشی لە ڕوویاندا پەڕیبوو. و ڕەنگی مردوویان لێنیشتبوو...و فرمێسکی زگ بەخۆسووتان و بێ ئومێدیی هۆن هۆن دەباراند و چاوەچاوی گۆڕبەگۆڕچوونیان بوون. تاوناتاوێک وەک پەشیمانی دەربڕین و تەوازووخواستنەوە. ورد و درشت بۆ هەواڵ پرسین کە بەڵگەی خۆشەویستی و ڕێزگرتن بوو بەسەریان دەکردەوە و:

- بەڕاستی دەرت خست: تەنیا تۆ لە نێوانمدا مرۆڤیت و بە حەقیقەتی ئەو درندە بێ ئەمەک و ترسنۆکانە حسێبایت. نەک وەک ئێمەی عولعولی و توورِ توورِە بە جۆی بێ ئاگا و لە دنیا نەگەیشتە.
ئەمەی هاتەوە یاد و:
- کوڕینە هەرچەند لە بچمدا عانەیەکی سووتاو ناهێنم، بەڵان بڕوا بکەن لەبەر ئەوە سەراوو دەراوی دنیا دیدەمە و لەنێو دەیان واریقات و کارەساتان کوڵاوم چۆن دەزانم ئاسمان لەسەرەدەمانە، ئاواش دەزانم زاخی ئەو ژن پیسکەرانە، لە ئەوانە نینە بتوانن بەرگری لەهێزی ئەنفال بکەن.
یەکسەر لەبەردەمی زیت بوونەوە و گوتیان:
- بە بۆچوونی تۆ. وایە کەچی بەبیروباوەڕی ئێمە پێچەوانەیە و چیتریش مەڕپێسە.
سەری داخانی لێبادان و گوتی:«
- ئەوەی پێویستی سەرشانم بوو بۆتانم هەڵڕشت و دواڕۆژیش هەڵیدەگرنەوە و ئەوجا پەنجە گەستن دادێکتان نادات»

* * *

جوتە برا «عوتە و «قوتە» لەکاتی پەلەقاژەی داغمەدارەکان زۆر پێ دڵتەنگ و پەست بوون و چیشیان لەدەست نەدەهات و لە حەیفان پڕ بە زار نەڕاندیان و گوتیان:
- کوا مەردایەتییەکەتان؟.
- کوا جەسارەت و غیرەتتان؟.
- کوا خەبات و تێکۆشانەکەتان؟. کە چەند ساڵە شانازیتان پێوە دەکرد و ئێمەتان پێ هەراسان کردبوو، بۆمان ساغ بووەوە:
- ئێوە پێشمەرگە نەبوون و درۆزن و بێ غیرەت فەلەزرا و بێهەڵوێست بوون.

- کەواتە وتەکەی حەمەڕەحیم ڕاستە، ئێوەجاشن. جاشی داغمەدارن. جاشی داگیرکەرانن.

شوان هەرکە لێیان حاڵیبوون ئازاد و سامانی گاڕدان و دایانە بەر قۆنداخە تفەنگان و گوتیان:

- هەر ئێوەی شێت مابوون لافمان لەسەر لێبدەن.

* * *

خەڵکەکە دوای ئەوە بە سایەی پێشمەرگانەوە دەستیان لە هەمبانەی تەڕی ژیان بەربوو. چی هاتە سەر زاریان، دەرحەق سەرکردەکان، نە خەسە لە شێخ سەدرە کەم و زۆر لێینەسەگرانەوە.

- ........، ........

- ........، ........

- .........، ........

- .........، ........

- نەفرەت لە خۆت و ناوت.

- نەفرەت لەو کەسانەش کە بە پێشمەرگە ناوت دەبەن.

- ئێوە پێشمەرگە نەبوون، عزرائیلی میللەت بوون.

- بەکرێگیراوی داگیرکەرانن.

- ئێمەتان بە درۆ و دەلەسان هەڵفریواند.

ئەگەر زەڕەیەک هەستی مرۆڤایەتیتان لە بەدەن بوایە ئێمەتان نە ئەکردە قوربانی ........خۆتان و : ((........))

- ئامانجتان چاک دەرکەوت، پەڕین و لەوەڕان بوو. لەسەر ورگی ئێمەی بێکەس و برسی. ئەگەرنا بەرگرییەکی کەمیش بوایە لە ئێمە خزمەتچیتان ئەکرد.

- بەس ئەمڕۆ بۆمان والابووەوە، ئێوە گۆردەی سەرکردەکانتانن،

ئەوانیش گۆردەی داگیرکەران.
- ئەگەرچی نەخۆشییەکە دەلحاز شنگی لەبەر بڕی، بەڵام لە هێرش کردنە سەر چەکدارە بەزیو.. و بە خیلاف دەرچووەکان، کە سوودی فسە گورگێکی نەبوو، بەردەوام بوو. و:
- کوا. چیان لێهات بەرد خۆرەکان!؟.
- کوا.. کێوەچوون دوژمن بەزێنەکان!؟.
- ڕوویان ئەو جارە لە کێندەر کردووە پێشمەرگە کوڵنەدەرەکان.
ئەمانەی چەند جار بە تەوسەوەی دووپات کردنەوە. لە دواییدا تێهەڵکردەوە:
- کوا. چییان بەسەرهات کورد گێیەکان؟.
- بۆ. دەنگیان نایەت هەژار گێیەکان؟.
- کوا ڕووی ڕەشییان ئەوجارە لە چ ئاخوڕێک کردووە داغمەدارە بەزیوەکان؟.
- چەکی گۆردایەتییان چ لێکرد و تەسلیمی کێیان کرد؟.
- کوا. چییان بەسەرهات سینگ شێر و پشت........؟
- دەگ داوەشێن: داڕزێن ڕووتان لە دنیا و قیامەتدا ڕەش بێت وەکی بۆ حەزی ((........)) ئاوەڵکراسی کچانی ئابڕوومەندی گەلی کوردی ژێر چەپۆکتان پێشکەش بە گورگە ڕووتەی داوێن پیسی بیابانان کرد.
- ئەگەر بە ئەندازەی زڕنیخێک هەستی مەردایەتی و مرۆڤایەتیتان لە دەروونە ڕەش و بێ بەزەیی یە کەتانەوە هەبووایە هەرگیز پشتتان، لە ترسی گیانە پووچەکەتان لەو خەڵکە هەژار و بێدەرەتانەکەتان نەدەکرد. کە بەزاری خۆتان هەرێ و پەیمانتانـدا بوو بەرگریان لێبکەن. تەڕکردتان! ئێوەی دڕەندە و بێ وەفایان بە پێشمەرگە

و شۆڕشگێڕ دەخوێندەوە و لە چاوی خۆیان خۆشتر دەویستن و لە دوڕ ژوور و لەگەڵ منداڵی خۆیان دەنواندن. دەبووایە بەقەدەر توانا دەرتان بخستبووایە، بەدڵ و داو لەگەڵ میللەتن بۆ ماوەیەکی کەمیش بووایە چنگە پڕەیەکتان بکردبووایە. ئەوکات حەرەجمان کەم و زۆر نەدەما. نەک ئاوا. دێڵەحیتانە، چەکی کلکتان بە خۆتاندا شۆڕکەنەوە و بێدەست هەڵێنان تێ بتەقێنن. بەڕاستی لە دڵی ئەو خەڵکە ناگزوورەتان چەسپاند ئەنگۆ بنیادەم نین گورگن. دڕندەن. تێنووی خوێن و ناموسی میللەتن و دۆستی دڵسۆزی داگیرکەرانی هەردوو دیون. بە فیتی هەردوو لاتان دەستی ئێمەمانانتان لە قۆرتێ ناو سەرتان لە قورەشین ڕاکردین و دڵی دوژمنتان کە چەند ساڵە عەوداڵی بوو سووک و سانا داکەواند. کەواتە ئێوە بەهەموو مەزەب و بیروباوەڕێک مافتان بەسەر خەباتی کوردایەتییەوە نەماوە و تەنیا بۆ خوێن ڕشتن و((........)) ئاژاوە و دوو بەرەکی و لە یەکتر پچڕانی میللەتەوە چەکتان لە شان کردبوو. بەس.

ماندوو بوون و شلەژانی دەروونی ماوەیەکی زۆر سکوتی پێکرد و:

- بەرهەمی هەمیشتان حەوجە بە بەڵگە ناکات زۆر چاک واژی بووەوە قوڕ بەسەری و شلەژان و دواکەوتنی میللەتە و بەس. مام ڕەمەزان زیاتر لە خەڵکەکە هەستی خۆی توریندانە چەشنی موستەعیدێکی پەرۆشی وانە وەرگرتن ڕاگرتبوو. و قسەی خۆی تێکوتاو:

- ڕووی خۆیان لە مێژوودا ڕەش کرد و خۆیان خستە ژێربەرداشی نەفرەت و غەزەبی چینی ڕەش و ڕووت و بێ ئەنوای میللەتەوەو لەمەودوا لە جوێنی دزێو و تفی زارجووانە بەملاوە چیدیکەیان دەقەبەڵ ناکرێت.

خەڵکە مەرام براوەکەی دەوروبەر بەوپەڕی مەراقەوە گوێیان بۆ شل کردبوو..و بە شەوق و سۆزەوە بە بەرەواژی پێشتر. وشەیەک چییە بێهوودە لەمێشکیان تێنەدەپەڕی. ئەویش وەک سەرخۆشان جار لە جار بە قاڕوگوڕترەوە دەچووە دوێ. ئاخر گۆترە نییە و هەموو دڵێک بەردەست نادات و لەمێژووشدا رووی نەداوە یەکێک هەبێت بەم تەرحە نەتەوەی خۆی بۆ ئیهانە و کوشتن بداتە دەست دوژمنانەوە.

بە تەوسەوەی دەراند و:

- ئەوەیە نیشانەی کوردایەتی ڕاستەقینە، ئەوەیە ڕاستی نیشتمان پەروەری. ئەوەیە بووژانەوەی شۆڕشی نوێ. ئەوەیە ڕێبازی ڕەنجبەر و ڕەنجدەری و سۆسیالیستی و دیموکراتی و عەلمانییەت خوازی!. ئەوەیە ئەنجام و بەرهەم و دەسکەوتی خەبات و تێکۆشانی ساڵەهای ساڵی پێشمەرگایەتی!.

لەشروی کارەساتەکە هیچیشی لەدەست نەدەهات سێ چوار قڵپی درێژدادڕی دەرپەڕاند. دڵی هێشتا تەواو دانەکەوتبوو. خەڵکەکەش قولاختر.

- ئـ..هـ من حەیفم لەوە دەمێنێت دوای ئەوە کە ئێمە بەدەستی خیانەتی ئەو بەکرێگیراو و خۆفرۆشانە دووچاری ئەو نەهامەتە نەگریسە کراین، عەمر بمێنێت، پاش ماوەیەکی تر لەسەر....... و لە ژێر جوبەی مامۆستا و ئاغاکانی ئەو دیویان و لە پاڵ ئافرەتە شاران گەڕاوەکانیاندا قەڵەو ببنەوە، دیسان بێ ئەوەی گوێ بەحەیا و نامووس چوون و ئاشبەتاڵە شوومە یەکجارەکی و کورد قڕان و کوردستان وێرانەکەیان بدەنەوە، بەناوی پیرۆزی کوردایەتییەوە هەننۆب ساڵدانە ساڵدانە دەگەڕێنەوە و ئەوخەڵکە ساویلکە و نەزان و

خۆشباوەڕ و خێرلەخۆنەدیوەش قەلقەلاشک ئاسا بەدویان دەکەونەوە و بەسەرکردەی پێشمەرگەی ڕزگارکەریان لە قەڵەم دەدەنەوە و موریدانە سەری ڕیز و تەوازوویان بۆ لاردەکەنەوە و بەوپەڕی سۆز و مەراقەوە، بە چەپڵەی ئافەرین و هوتافی مەردایەتییەوە پێشوازیان دەکەنەوە. بەڵێ ئەوە من دەکوژێت و سیپلاکمی تەریفە کردووە. دوای ئەو کارەساتەی بە ئەنقەست درووست کراو ئەوان سەری سەبەبان بوون ئەوجا هەرنایان ناسین و عوودەیان لێناکەین.

ڕەمەزان وەریگرتەوە و گوتی:

- نا. نا تازە بوونە پەڕۆپیسی ئافرەتان و گای قەشی ئاخری زەمان و ئەو باوکەیان مرد جارێکی تر پێ بنێنەوە سەر خاکی کوردستان.

حەمەڕەحیم لە قاران ئازای بەدەنی نەما چرک وهۆڕ نەلەرزێت و چۆکەکانی تەق تەق بەیەکتر دەکەوتن و بەڕوویەکی تەڵخەوە گوتی:

- ئەوانە ئابڕوویان هەیە تاکو هەستی پێ بکەن کاکە گیان!

- خەم مەخۆ ئەگەر هەستیش پێنەکەن میللەت سیقەیان لەسەریان هەڵگیراوە و تازە بەتازە هەتا دنیا دنیایە ماوەیان نادەن بەهیچ جۆرێک جڵەو بەدەست بگرنەوە.

بەتەوسەوە گوتی:

- ئـ..هـ میللەت!

بە ئاخێکەوە گوتی:

- هەر ئەوان نەبوون کاکی برا چەند ساڵ پێش قەرەوری ((........)) و لەنێو ((........)) و ((........)) هوە خەبیری ((........)) و لە نێو شارەکاندا کوڕە کوردیان دەکوشت و لە حەپسخانەی تایبەتی خۆیان باوک و دایک و کەس وکاری یەکتریان دەست بەسەر دەکردن.

کەتا ئەو ڕۆژە دوژمن ئەو سوخەتە قەڵپەیەی بە خەیاڵیشیدا

نەدەهـات. ئەوجـا ئـەو میللەتـەی دەڵێیـن بـە ئاسـتەمیش بـە ڕوویـا هەڵنەشـاخان.
دەنگی بەرزتر کرد و گوتی:
- ئەگەرنـا ئەوانـە ورد و دروشـت و زێـن و شـێنیانەوە هـی ئـەوە نەبوون جارێکی تر بە هیچ جۆرێک بێنەوە سەر حەلەبەی کۆشانی کوردایەتییـەوە.
پشـووێکی هێمنانـەی خـواردەوە و هێشـتا کفتایـی دڵـی تـەواو دانەکەوتبـوو..و بەلـەز هۆیـداوە سـەری و:
- دەگ خەجاڵەت بن کە نازانن مانا چییە.
- دەگ گوو بە پێشمەرگایەتی بێت ئەگەر ئێوە پێشمەرگە بن.
- دەگ گـوو بـە خەباتتـان بێـت، بـە مێـژوو ...و هەڵسـوکەوتتان بێـت وەکـی ئـاوا حیزانـە، نامەردانـە لەترسـی گیانـە بـێ بەهاکەتانـەوە، کۆسـەبەبا ئاسـاو گەجـەر و گوجـەر لـە دواو بەپاشـەڵی ((........)) و شۆڕشـە چەواشـەکەتانەوە، بـێ پـەردەی شـەرمەوە لەنێـو گەڵانـی خۆتـان پێچـاوەو قەلـە زراوانـە ئـەو خەڵکە بێنازەتـان بـەلاش تەنیـا بۆ ویسـت و حـەزی ناحەزانـەوە خسـتە نێوتـۆڕی ئامادەکراوی دوژمنـەوە و فتراقـی دڵـە داخدارەکەتـان، کـەوا شـەو و ڕۆژ ئاودالـی بـوون. بەیەکجـاری داکەوانـد و مەدالیـای ئەڤینـی داگیرکەرتـان پـێ بەخشـرا.

* * *

«گوێـی بـە تـرس و کوشـتنی خـۆی بەدەسـت جەندەرمەکانی بەعسـەوە نـەدا و غەریبـی دۆسـتە دێرینەکـەی بـەرەو دێیەکانـی «ناوکـوڕێ» پەڵکێـش کـرد و:«
- پێویسـتە لەکاتـی تەنگانـەدا دۆسـت بەسـەرکەمەوە نـەک لەکاتـی شـێنەییدا».

کەریمە کۆر لەناخەوە ناڕەزایی خۆی بەم تەرزە دەربڕی و:
- کاکە لەو ڕۆژە مرۆ قڕانەدا هەرگیز وەختی سەردان و دیدەنی نییە و بگرە هەڵەو تاوانێکی گەورەیە.
بەڕووخۆشییەوە دایە بەر حوکمی:
- هەرچی خوانەکات نابێت.
ئەگەرچی دەنگ و باسی شۆڕش و پێشمەرگانی ڕۆژ بەڕۆژ دەبیست و لە دڵیشی چەکەرەی کردبوو. وجاقی نێو کانگەی شەڕی کێو..و هەڵەتانی وەک ئەو بگات و زاری کردەوە:
- کووی تێدەگەیت؟.
- لەچی؟.
- لە شۆڕشی ئەوجارە.
بەرگوێی کەوتبوو چەند حیزبی بیروباوەڕ و هەڵوێست جیاجیا سەریان هەڵداوە و هەریەکەیان بەجەم و جۆڵی خۆی دەڵێت:«
- شۆڕش».
دەمێک مڕ داماو و لە دواییدا ئەمەی بۆ هات و:
- نازانم بڵێم چی.
- ڕاستی بۆچوونی جەنابتم گەرەکە.
- ئەوەی ئەمڕۆ لە برەودایە، ئەوانەن وا یەک لایەنە، بەناوی موفاوەزات قۆڵیان لە قۆڵی دوژمن هەڵکێشاوە و لەگەڵ چینەکانی دیش وا لەبەرچاوانە و پێویست بە گوتن ناکات.
هەتا پێی بسەلمێنێت لەم ڕووەوە ئاگادارە و گوتی:
- لەعەرەب و عەجەم، بە بارەبارڕ دیارە. لە ڕوواڵەتدا بۆ مافی میللەتە، کەچی هەر دوو هێز مەرامیانە تۆی حیزبەکانی تر ببڕنەوە و مەیدان تەنیا بۆخۆیان بمێنێتەوە.

تۆزێک کپی بەسەرداهات و:
- لەلایەکی دیکەوە ڕژێم لەو کاتەدا بەهۆی شەڕەوە زۆر شپرزە و بێ هێز بووە، هەتاکو لەناو نەچێت و زەختی ناوەوەی لەسەر سووک ببێت ئەگەرنا بەعس و حەقدانیان نەگوتووە. ئەوەش بۆرە هاریکارییەکی نهێنییە و لە ئاست هەستی نیشتمانی و کوردایەتیدا بەسەریاندا خراپ دەشکێتەوە.
- ڕەحمەت لە مردووت چاک لە بنی کودیتدا، بەس هەموو کەس وەک جەنابت بۆی ناچێت .
بە زەردەخەنەوە:
- نا.. نا بەعس پاشەڵیانی وا هەڵداوەتەوە لای عەرەب و عەجەمان تەقیتەوە.
چی لەم بارەیەوە نەبیستبوو...و بە هەشتاوییەوە گوتی:
- حا. هـ..!؟.
- بەڵێ بە ئاشکرا و لە چەند کۆڕ و کۆبوونەوەدا و لە پێش دەیان دۆست و دوژمنی شارەکەماندا، بێ پەردەوە:«
- ئەوانە بێ قەید و شەرت هاتینەوە ڕیزی نیشتمانی».
- باوەڕی نەهات و بە دوو دڵییەوە گوتی:
- گریمان وا بێت هەر ئاخ هەڵکێشانی گەرەکە.
- کاکە ئەگەری ناوێت: چێڵ بەدزی کەڵ دەخوات، بەڵام بە ئاشکرا دەزێت.
هەتا پێی بسەلمێنێت:
- لەوەتی ئەو شەڕە وێرانکارییە بەرپا بووە ئێمە مانانی بێلایەن هەرگیز ناوێرین ڕووبەڕووی لایەنگیرەکانیان هێرش بکەینە سەر هێزی ئەم دیوە: دەست پێشخەری شەڕ بووە، نەک داگیرکەری ئەو دیو.

سەری سەلماندنی بۆ لارکردەوە و:
- وێدەچێت و ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت ڕژێمی بەعس دەرحەق ئەوانە باڵی تا ڕادەیەک قووڵ کردووە.
بە دەنگی بەرزەوە:
- ئاشکرایە یەک لە ئەوانە پێش ڕێککەوتنەکە ڕێگایاندرابوو تەرمی شەهیدیان ببەنەوە شار.
- ئەوەشم بیستبووە.
- من لەشاردنەوەی تەرمی شەهید مامۆستا «حەسەن هەولێری» پێشمەرگەیەکی پلەبەرزیان بوو...ولە کێوی «........» شەهید کرابوو بەشداریم کردو و دوای سێ ڕۆژ چووینە سەر قەبرانیش. کەچی لە هەمان مانگدا «غەریب»ی برازای مەلا سمایلی دۆستم سەر بەلایەنێکی دیکە و شەهید بوو، نەک هەر نەوێران تەرمەکەی بهێنەوە، بگرە نەیانهێشت بۆ سەرەخۆشیش کەس بچێتە لایان.
کپی بەسەر هەردوولادا زاڵ بوو، ئەمیان گێڕەکەی بەملایە گۆڕی و:
- من لەوە حەیرمامە ئەنگۆ...و ئەوان لەیەک دەراو ئاودەخۆنەوە، کەچی بۆ گۆڵمە خوێنێکی یەکتر بە حەوا هەڵدەچن.
لەبن زاری گەیشت و زەردەخەنەیەکی تەوساوی ڕووی داگیرکرد و گوتی:
- حەیرمەمێنێ ئەوەی دەڵێیت تەنیا هەر بە زمانە و بەس. کەچی لە ڕاستیدا قۆناخە ڕێیەک بە کردەوە لە یەکتر دوورین.
لە ئەوی چاکتر دەزانی و تەنیا ویستی حەزی وایدەخواست لە خۆی بەرگوێی بکەوێت و گوتی:
- چۆن!؟.
- لە گەورە و گچکەی میللەتی کورد شاراوە نییە، ئەوانە لە ڕووالەتدا

بۆ هەڵخەڵەتانی خەڵک خۆیان کردووەتە دوو هێڵی سەرەکی وا نێوان ئاسمان و ڕێسمان لە یەکتر جیاواز.
هەرکە حسیا لە بنترنەی واریقاتەکە گەیشتووە زۆری هەوەست پێهات و بۆ پاڵپشتی زوو لێیوەگرتەوە و:
- ڕاستت فەرموو: لە خشتەبردنی میللەتەکەیان بەملاوە، مەرامێکی دیکەیان نییە.
بافرەیەکی هاتێ و گوتی:
- ئـ..هـ ئەگەر کۆنەپەرستی و ئاغا وشێخ و برجوازییەتت گەرەکە فەرموو ئەوە ڕێبازو هێڵی ((........))، خۆ ئەگەر سۆسیالیست و مارکسی پەرستی و عەلمانییەتی توندڕەویشت مەرامە ئەوە ڕێباز و هێڵی ((........)). ئەگەرنا لە مێژووی سەرهەڵدانی سیاسەتەوە، هەتا ئەمڕۆی حازری، لەسەر گۆی زەویدا قەت نەبووە و ناشبێت مەڕ و گورگ و ئاگر و پووش بەیەکەوە هەڵ بکەن. ئەوەش نیشانەی ئەوەیە خەڵکەکەیان لا کەمفام و کەودەرییە، باوەڕ بکە ئەگەر لە دەوڵەتێکی پێشکەوتوو بووایە، چەپڵەی تان و قەشمەریان بەدوا دەکوتا.
ئەمەشی لەم ساتەدا بەبیریدا گوزەری کرد و گوتی:
- بەس نازانم بۆ لە شەڕ و جم وجۆڵی ناو شار و دەور و بەر زۆربەیان هەر ئەمانەن:.
بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:
- باشی بۆچوویت. ئەوان هەردەم بۆ جەلب کردنی دڵی خەڵکەکە لە چینە سیاسیەکانیتر سیاسی و لێزانترن.
بە پێکەنینەوە گوتی:
- وا مەڵێ.

- ئەدی؟.
- بڵـێ ئەوەندەیـان((........، ........)). لـەم بارەیـەوە زۆر لـە ئەوانـی تـر بەڵـەد و شـارەزاترن.
بۆ ئەوەی دوو دڵی لەم ڕووەوە نەمێنێت:
- وێـڕای ئـەوەش گوریسـی پەیوەندیـان لـە ڕاسـت دوژمـن هیـچ کات بەیەکجـاری نەپچڕانـدووە.
- هەرچۆنێـک بێت جەڕبـاون و چـاک دەزانـن هەسـت و سـۆزی دڵـی گەنجانـی ئەمـڕۆ بەوتەرحـە نەبێت نایەتـە ڕایـێ. هەربۆیەشـە بیسـت و چـوار سـەعات ئـەم ڕێبازەیـان کردووەتـە بنێشـتە شـینکەی سـەر زاریـان.
بە بزەیەکی سەیرەوە بۆی ڕووانی و:
- پێم بـاوەڕ بکە ئەوەشیان هـەر. ڕووالّەتـە و بـەس. ئەمانە بە بتوونی ئەڵقەی پەنجەی ئەوانن و هەتا پێویستیان پێیان هەبێت وەک مەیموون هەڵیاندەپەڕێنـن، پاشـدان هەرکـە بـە مـرازی خۆیـان شـاد بـوون وەک دەبدەبـە بـە حەوایـان دەبـەن.
- ئەوەی دواییت بۆ ناسەلمێنم.
- لەبەرچی؟.
- هێڵـی ئەمانـە تایبـەت دامـەزراوە و لای هەمـوو کەسـی زەینـدار، لـە کاتێکـدا بـووە، هێشـتا پرتۆخـی دوژمـن و خۆیـی، دوای ڕێککەوتنەکـە دەرنەکەوتبـوو.. و میللـەت ئەوسـا بـە هیـچ جۆرێـک پێویسـتی بـە ڕابـەری دیکـە نەبـووە.
بەمەبزەیەک دایگرت و گوتی:
- کەواتە هاتوویەوە سەر قسەکەی من لە پێناوی هەستی نەتەوایەتی نەبووە. بەڵکو کاتی خۆی دەستیان لە ((........)) ئەوان بە یەکجاری شل نەکردبوو.

ئەویش خواییشتی تەنیا واژی کردنەوەی ئەو ڕاستییە بوو.. و بەئاخێکی درێژەوە گوتی:
- هێڵی سیاسی کوردایەتییەک بەو ڕێگایە هاتبێتە کایەوە و دەبێ دوارۆژی کوردی قوڕبەسەر بە چ بگەیەنێت خوایە!؟.
لە دواییدا:«
- هەرکە زانیان بەعسی داگیرکەر و حەقدانیان نەگوتووە و تەنیا قەشمەری و خافڵاندنە، دەنا بەکەم شتێک دەکەوتنە دینای سەما و هەڵپەڕین»'وە
- باوەڕ بکە بەو ((........ ........))ڕەفزیش کراوە ڕازی دەبوون.
- ئەوەی من بزانم تاکو پاشەڕۆژ کەشخەی پێ لەسەر میللەت لێ بدەن زۆریان مەراق بوو شتێک لە دوژمن هەڵکڕێنن، کەچی من وای بۆ دەچم هێلکەی پیسیشیان بە نسێب نابێت.

* * *

شەوێک پێشمەرگە موختاری دەگرن و لەبەر ئەوە بووبووە موختاری بەعسی داگیرکەرەوە بەهۆی دارتێبڕینەوە برینی دووبرەی تەشەنە دەکات و دەیکوژێت. جاشیش بۆ بەیانی حاجی سەعید دەگرن گوایە یارمەتی پێشمەرگان دەدات، تەسلیمی دەستی ڕژێمی دەکەن.
دوای دە ڕۆژان سێ دیناری باجە ناشتنی تەرمەکەی لە منداڵەکانی دەستێنن.

* * *

دوای ماوەیەک کەریمە کوێر، بەناوی کاروباری پێشمەرگایەتییەوە هاتە دەوروبەری شار و هەنتۆب بەیەکتر شادبوونەوە و بابەتی تایەن لەسەر زاریان بووژایەوە.
- ئەوانەی کە تا ئەمڕۆ خۆیان بە میر پەنجۆ دەحەملێنن و قۆڵی

تەنیایی یان، لە قۆڵی بەعسی داگیرکەر هەڵکێشابوو هەرگیز وایان لێڕەچاو نەدەکرد:
بەعس دەستی یەکجار لەدۆستاتییان هەڵدەگرێت.
- عەنتیکە لێرەدایە، بۆ ئەوەی لای بیرتیژ و زەیندااران ڕیسوا نەبن، دوای ساڵێک چاوەڕوانی پاش ئەوەی دوژمنی داگیرکەر پەڕوباڵی، بەبارانی یارمەتییەکی زۆری دەوڵەتانەوە، بەسەریدا و خۆی تەواو گرتەوە و لە ڕووخان دوورکەوتەوەو هەر لەسەر حسێبی:
- هاتنەوەی ڕێزی نیشمانییەوە سەیر دەکران بۆ یەکەمجار پەیوەندی نێوانیان بە یەکجاری قرتا.
- بەڵێ هەرکە دەستی ئومێدیان لێبەربوو، نەیانتوانی دووررۆژ بێ ((........)) خۆیان لەمەیدانا ڕاگرن. پێشتریش مێشکی میللەتی خۆیان پوختە سواقدا بوو:«
- شۆڕشی ئێمە لە جەرگەی میللەتەکەمانەوە هەڵقوڵاوە و پشتی پێ بەستاوەو قەت وەک ((........))ی خائین خۆمان ناکەینەداردەستەی داگیرکەری ئەو دیو.»
- خۆیان تەنگەتاو، بێ پەردەی شەرم و قەید و شەرتەوە بەمەراق و قایش و قرۆشی نوێوە، بە پێچەوانەی هەڵوێستی پێشیان هاویشتەکۆشە نەرمەکەی گورینەوە و بوونە هاونیری ئەوانەی پێشەخۆیان.
- وێڕای ئەوەش بە کون فەیەکۆنێک خۆیان لەهەموو حزبەکانی دی، لێبانلێسانە، بێ پاداشتی نانێکی سووتاو. بەنان و زگی خۆیان قەلقەلاشکانە ڕەپێش کردو بوونە ڕابەڕو ڕێنیشاندەری ((........))ەوە.

* * *

**ئەنفالی دووەمی گەورە:**

کارەساتە کارەساتە، کارەساتێکی نەگریس و نامۆ...و دڵتەزێنی وایە لە مێژووی سەرهەڵدانی مرۆڤایەتیدا ڕوویندەداوە. بە دیتنی ئەوەی بە ئاستەم هەستی ویژدانی لەدەروونیدا شک ببردرێت خۆی بۆ ناگیرێت و بێ خواستی حەزییەوە لە براڕۆ دەدات. تەنیا کەسانی عەرەب و جاشە داغمەدارەکان نەبن.

- کارەساتێکی دەستکردی دوو زلهێزی دڵڕەش و چاوسوور و ئاوداڵی کوشتن و وێرانکاری.

- گۆڕیللایەکی نەقۆڵاو و چەتوونی غەوارە و داگیرکەرەو هەردەم تەقەلایەتی کێرمیز لەناوچەکە ببرێت.. ئەویتر گورگە ڕووتەی هارودەم بە خوێنی خانەزایەو بە پیکی ئەو لێدەخورێت.

- بەزەیی و هەستی مرۆیاتی لەناخی هەردوولادا بۆ دەرمانیش چنگ ناکەون.

- نەک هەر چنگ ناکەون، بەڵکو بە هەموو توانایانەوە دژیان وەستاون.

لەبەر هاژەی فڕۆکە و نەڕەی دەبابە و نرکە نرکی مەترەلۆز و تەق و هۆڕی دۆشکە و بێکسی و کلاشینکۆفان هەرچی زندەوەر و باڵندەی دەڤەرەکە بوون تۆقان و تەرەبوون.

خەڵکەکەش بە جارێک وڕوکاس وهەراسان نەخەسەلە هەرکە بە چاو دیتیان وا هێزی ئەنفالی کورد خۆر بە لێشاو و گوللەبارانەوە، ڕوویان لە دێهاتەکانی ناوچەکە کردووە و هەر ئاڤایی بوو مەشخەڵی ئاگری سووتانی خانووان تاقی ئاسمانی لە چەند لاوە داگرتووە. دووکەڵی غەزەبی داگیرکەران دووکەڵی خانووان لە ڕوواڵەتدا کەچی لەژێرەوەش دووکەڵی نەفتی کوردستان بوو.

لە ئاوایی «ش» دا حەشرە، قاڵوو بەڵایە و زیرو هۆڕ و. ڕۆ. ڕۆی ژن

و زارۆکانـە:

- وەیرۆ. بابەڕۆ...

- وەیرۆ. برا ڕۆ....

- وەیرۆ. دایەڕۆ....

- وەیرۆ. لە خۆمان ماڵوێرانیَ ڕۆ....

- وەیرۆ.. لە خۆمان سەربەهەشیَ ڕۆ....

قـۆڕەی چێـڵان و زەڕەی کـەران و حیلـەی ئەسـپان و حەپـەی سـەگان و باعـە و قـاڕەی پـەزان و قیـرە قیـڕی پەلـەوەران، لەهـەر لاوە شـادەیان بەپێنج مەزەبانیش دەهێنـا. تەرحـی گـورگ سـەراو دووی مـەڕان بنێت، خراتریش هـەر سـەرباز و جاش بـوون کۆمەڵە پیـاو و ئافرەت و منداڵانییـان، بـە هـات و هـاوار و قیژە و زرووکە و گریانـەوە:

- ویـ..یی. لە خۆمان بێکەسیَ!.

- ویـ..یی. لەخۆمان ماڵوێرانیَ!.

- ویـ.. یی. لە خۆمان چارەڕەشیَ!.

- ویـ..یی. لەخۆمان قوڕبەسەریَ!.

دەدا پێشـە خۆیـان و بـە زەبـری قۆنداخـە و سـەرە سـمک و پارەسـوان بـەرەو زیلانیـان لێدەخوڕیـن. لەلایەکـی دیکـەوە تـاڵان و فەرهـوود و فڕانـی زندەمـاڵ و مردە مـاڵ دەسـتووری پەیڕەوکـراوی سـەردەمی وڵات بـوو...و بەکارێکـی ڕەوا و مرۆیانـە لـە قەڵـەم دەدرا.

بـەرەو جاجم و لێفە و دۆشـەک و بالیف و لبـاد و مافوور و چوارشـەو و سـەرەناز و ڕایـەخ و دووگورد لـە سەرشـانی چەکداران هەڵتـەک هەڵتەکیـان بوو.

تەقە تـەق و خشـەخشـی کوچکوچەیی سـەندووق و کەنتـۆڕ و بـاول وجانتـا و لانـک و قەلوێران لـە دوورەوە دەبیسـتران.

لەکاتی خەناوکە و زنجیرە زێڕ لە گەردەنی کچ و شۆڕە ژنان دەپچڕێندران و گوارە لە گوێیاندا دەکەلێندران وبازن و ئەنگوستیلە و ئەلقەی پەنجان ڕادەماڵدران و زێڕوهۆڕ و هات و هاواریان دەگەیشتە کەشکەڵانی حەواوە.

- وەی هاوارە لە خۆمان.. بێکەسی ڕۆ....

- وەی هاوارە ناموسمان ڕۆ....

- کوڕینە بەهاوارمان وەرن و لەدەست عەرەبانمان قوتار بکەن.

- کوڕینە تۆزێک غیرەتتان ببزوێت و ناموسمان لە دەست عەرەبان بپارێزن.

لەلایەکی دیکەوە مەڕوماڵات و گاڕان و وڵاخ و گوێدرێژ کۆدەکرانەوەو مریشک و قاز و عەلەشیش و مراوی بە قەتارە جلە دەکران، ئەوانەی بەردەست نەدەکەوتن بە گوللە پەلەواژ دەکرانەوە.

هەرکە بگوترێت «عەرەب و فەرهوود» دەبڕێتەوە. ئاو لەسەرتاسەری ماڵەکان وەردرا و جا کرانە خۆراکی ئاگر، یان دەنەمێتیان قوربان کرا. مزگەوت و قوتابخانە و مستەوسەفیشی گرتەوە. بەم تەرزە دێ بێریان نەکرد.

خاوخێزانی حەمەڕەحیم و ڕەمەزان و...وسوو لەیەکتر دانەبڕان و بەیەکەوە بەرەو زیلێک ڕاپێچ کران.

ئەویان سک چووەکە بەرینەدابوو..و هێزی لەبەر بڕیبوو، هەر ئەوەتە بەلاکەلاک دەیتوانی هەنگاو باوێت. کەچی زاری لەکار نەکەوتبوو..و:

- گۆمرو خازری سپیمان لە کۆڵ بووەوە، کەچی بەداخەوە خراپتر لە پاش و شێروشەپاری ڕەش و سپی جێیان گرتنەوە. حاڵمان تازە قەت چاکتر نابێت، بگرە مەکرووف تریش لە دوایە و هەتا دنیا دنیاشە بەو مرازەی کەوا بە سۆزەوە بۆی عەودالین ناگەین. مەگەر خوا ئەویش موستەحیل سەرهەڵبدات. میللەتە چەوساوەکەمان ورد و درشت ڕاپەڕن

و هەرچی لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا هەتا ئەمڕۆی حازری جڵەوی گرتوو بێتە دەست قاو بدەن و ناویان لە مێژووی سیاسەتەوە ڕەشکەنەوەو سەرکردەیەکی نوێ دامەزرێنن، بە مەرجێک لە شێخ و ئاغا و سەرەک عەشیرەت و کرمانجە هەڵپەرستەکان دانەڕێیەک دوور بێت.
هەتا خەڵکی ناو زیلەکە تێبگەن، بە دەنگی بەرزەوە گوتی:
- جاشە داغمەدارە خائینەکان، بەئەنقەست نەیانهێشت خۆمان لە مردنی ئیهانە قوتار بکەین، ئەمڕۆش وا پشتیان، هەتا کەوتینە بەر کەلبەی تیژی گورگی هاری بیابان و جاشە سادە خائینەکان، نامرۆیانە تێکردین. ئـ...
هـ ئاواتی سەرەکیان کە پێشکەش کردنی گیانی ئێمەیە، بە مامۆستا و ئاغاکانیان هاتە جێ.
- ئەوانەی کە ((.......)) نن. ئەگەرنا کەمێک بە زەییان پێماندەهاتەوە و سەرمانیان بۆ حەزی ئەوان لەقوڕ نەدەنا.
لە دەروونەوە چەشنی نیسکی سەرغاز هەڵچوو...و هێور نەدەبووەوەو:
- ئەنفال پاداشت و دیاری ئاخروئۆخری سەدەی بیستەمە و بە ئاگاداری هێزەکانی جیهانی «خۆرهەڵات و خۆرئاوا» پێشکەش بە مەزلوومترین میللەتی سەر ڕووی زەمین کرا.
حەمەرەحیم ناوەناوە، ڕووی بەلای «ئاسۆ»دا وەدەچەرخاندەوە، کە بەهۆی و سووی خاڵییەوە، وەگەڵ زیلەکەی ئەمان کەوتبوو:
- ئاسۆ گیان تۆش بە کێری جاشە داغمەدارەکاندا ڕیاییت؟.
لەترسانا ڕەنگ پەڕینی لەدوورەوە پێوە دیار بوو. کەچی وەڵامی پێنەدراوە.
- تۆ هاتیت چاکە لەگەڵ ئێمەمانانی ئاژەڵی بێ خاوەن بکەیت؟. ڕازونیازی ئەو دوژمنەگلاوەمان بۆ شی بکەیتەوە.
لەم ساتەدا زگی پێچیدا و لە تاو ژان دەستی بەملاو بەولای تەڕۆکەکانییەوە

ناو دایگرتن و لەنگەری خۆی پێنەگیراو:«
- سی و سێ دەردم لێیە و تۆش سوورە گوڵی باخان سەربار».
خەڵکەکە لە تاو گیانی خۆیان، کە سەرخۆشی مردن بووبوون و ئاگایان لەو نەبوو، تەنیا گورجی نەبێت بە عەباکەی بەری پەنای بۆ کرد و جوانی سڕییەوە. لەو ڕۆژەوەی تووشی بووبوو گورجی نەیدەهێشت لە دیشداشە بەملاوە، چیتر لەبەر بکات. بۆ ئەم مەبەستە پەڕۆی زۆر لەگەڵ خۆی هێنابوو.
- دەزانم دایک وباوکت سەلەفی و عەشیرەتگەری و نەزان و دواکەوتوونە و ویژدان و هەستی مرۆڤایەتیان نەکەوتووەتە بەر باڵتەی خەبات و تێکۆشانی کوردایەتی و عەلمانییەتی ئەو دڕندە بێ مەزەبانە. دڵیان بەروەستی نەداون لەو بارەیەوە دەست لە چۆکان وەربێنن و خزم و خۆیش و چاوناسانیان بکەونە بەر هێزی ئەنفالی عەرەبەوە، تۆیان تاکو بەس بەهاوارمانەوە بێت، خستە داوی مردنی ڕیسوایی یەوە.
لەشروان دەمێک لەبەرخۆیەوە کوڵی و:«
- قەت لە دنیادا ڕووینەداوە شوان بەدەستی حەزی خۆیەوە مەڕان گورگ خواردە بکات. کەچی لەژێر پەردەی شۆڕشی نوێوە ئەوە یەک و حەرەجیشی کەم و زۆر لێناگیرێت».
بە هەوگی پڕ گریانەوە و ڕەنگی ناوە ناوە بە بارێک دەگۆڕا و لەدوورەوە پێوەی دیاربوو. هەرکە تۆزێک هێور بووەوە:
- وا دیارە هەستیان نەکردووە: چاکەی سەربەخۆ خراپ بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوە.
گریان وەستاندی و:
- ڕۆڵە دایک و باوکت لەم ڕووەوە سەر چیغ چوونە و نەیانزانیوە، ئەمڕۆ ڕۆژی خەباتی ڕەنجدەر و ڕەنجبەرانە، ڕۆژی هەوڵدانی عەلمانییەتە.

عەلمانییەتێک ئەو چەورە و تەڕلووسانە بەرزیان کردبێتەوە.
- هەرچی ڕەوشتی پەسند و مرۆڤایەتییە، لەنێو دڵاندا بسڕنەوە و قسە لەکەس وەرنەگیرێت. ئەوەی بە ئاستەم ڕوویان لێ گرژ بکات بە گوللە وەڵامی دەدەنەوەو بچنە هەر ماڵێک پاش تفەڕکی زاد و نووستن و حەوانەوە چاو ببڕنە ناموسی، عەمالەتی هەرچی دوژمنی میللەتی کوردە، بە شانازیەیوە. کردوویانە و دەشیکەن، تەنیا عەمالەتی میللەتی خۆیان نەبێت.
- ڕۆڵە ئەوەش چاک بزانە، ئەورۆ ڕۆژی کورد قڕان و کوردستان ویرانە. ڕۆژی بەئاوات گەیشتنی تەریقەتی قادری و نەقشبەندیانە.
دارقەڵشت، بەرد قەڵەشت ئاسۆ نقەی لەبەروەنەهات. تەنیا لەناخەوە منگاندی:«
- بەخوا ڕاست ئەکەیت منیش بە کێری داخمەدارەکاندا ڕیام. کەچی لە بێ دەسەڵاتییەوە ناچارم وەک جەنابتان مل شۆڕ بکەم».
خەڵکەکەش لەبەر شپرزەیی هۆش و ترسی کەوتنە تۆڕی دوژمنەوە لایان وابوو گوێزیان بۆ دەژمێردرێت.
ڕەمەزان نەبێت دەم نا دەم سەری پەسەندی بۆ دەلەقاند.
«ئێمە تاکو نەکەوینە ژێر چەپۆکی بەعسی دڕندە و داگیرکەرەوە هانامان بۆیان هێنا، کەچی سەت جار بە داخەوە نەمانزانی گورگی خۆیی پتر تینووی خوێنی ئێمەمانانی ڕەش و ڕووتن. ئ.هـ بریا بەعس خۆم و کوڕەکەمی لە قنارە بدابووایەن!. ئەو دەم سەت قات باشتر بوو. هەرنا ئافرەتەکان ئاوایان بەسەر نەدەهات. بەڵام تازە خۆشی وترشی کار لەکارترازاوە و بە هیچ هێزێک ناسلەمێتەوە».

* * *

گۆرانی کوڕە گچکەی ڕەمەزان و ئاوزەی زانا تۆزێک باریک و بەرزتر

لەشـەوێوە بەفیتی حەمەڕەحیم و ڕەمـەزان لەئاوایی دەرچووبوون.
«زاریێ»ی خێزانی ئەم ڕەنگ زەردە و هەناو قەپاوی باریەک وکەڵەگەت، نەیدەزانی جەرگ سووتان چییەو پێ سـەخڵەت نەبوو، کەچی گورجی لە حەژمەتان لەوکاتەوە لەبان سەر دەسووڕاو لە عەرد و بەردی خوا تۆتکەی نەدەگرت و هیچ کات لە یادی نەدەپەڕی.
هەتا لەمبارەیەوە یەخەی نەگرێت حەمەڕەحیم پێنە و پەڕۆیەکی سەرپێیانەی لەمست نابوو کەچی فتراقی دڵی تەواو پێدانە کەوتبوو...و دڵە گرگرتووەکەی دغدغەی لەم ساتە پڕ مەترسییە دەدا و تاوناتاوێک بەڕوویدا هەڵشاخێت.
- ئەرێ پیاوەکە خۆ من هەر دەردێکم نییە و دڵم هەر وەختا بتەقێت، تۆ هەتا ئێستا تەواوت حاڵی نەکردم: ئەو قوڕبەسەرەت بۆ کێندەر هەڵەتە کرد!؟.
بە هێدییەوە:
- حۆرمێ نەمگوت: «بۆ ترووسکایی یەکم ڕەوانە کرد ئێـ.هـ بەڵکی خواو ڕاسان دەکات قوتار بێت وتۆی ڕچەلەکمان بە یەکجاری نەبڕێتەوە.
عەقڵی بڕی نەدەکرد، پێشتر تێیگەیاندبوو:«
- ڕەنگە بە واسیتەی جاشە سادەکانەوە قوتار ببێت».
گوێی بە ئەوە نەدا، کەوا لەناو زیلی دوژمنن و چوار دەورەیان سەربازی داخ لەدڵن و لە هەنجەتێکی زۆر بچووک دەگەڕێن دارکاریان بکەن، یان بە جوێن و قسەی تەڕاوزانە بیانشۆنەوە و بە دەنگی بەرزەوە گوتی:
- چما تۆ پاش ئەو هەموو کەتنەی جاشان بە خەڵکی هەژار و پرزە براوانیان کرد هێشتا ئیمانت پێیان ماوە!؟.
- نەخێر، هەرکە گوتراش «جاش» خائین دەبڕێتەوە. بێجگە لە پەتی سێدارە شایەنی هیچی تر نین، بەڵان ئەوەی من بۆی دەچم وەکی جاشکە

قورەی کلک کەرتە مەشکەدارە بەزیوە داغمەدارەکان بەرگی عەلمانییەتی مۆزەیەفیان بەسەر خۆیاندا هەڵنەکێشاوە و هەستی مرۆڤایەتیان لە دەروونیدا وەک ئەوان تەواو نەڕویتەوەو بە ئاستەم لێیان ڕچاو دەکرێت و بۆیە بە دەستەودامێن و ناورانەوەی دەخیلەوە لەبەریان لەگینە ویژدان و بەزەیی مرۆڤایەتییان ببزوێن.
سەربازێکی ڕەش و دەم چاو لپرلپر و ئەوەندە ناشیرین گریمان بە ڕۆژ بتدیبووایە، بە شەو دەهاتەوە خەونت. سەری بەناو زیلەکە داگرت و بە توندییەوە سکتری بەم چەشنە لێکردن و:
- کوردی نەوەی کوردینە دەنگتان لەبەرەوە نەیێت دەنا زمانتان دەبڕم.
دەسبەرداری نەبوون کەچی لە ترسی «عەبد علیۆ»ی کەوا زەندەقیان لێچوو بوو لە دەنگ هەڵبڕینیان گرتەوە.
«ئەگەر بە بنیادەمانیش بچووبووایە حەقی بوو».
بۆینەسەلماند و بە نەرمە گریانەوە، پاش ئەوەی لە دڵەوە پرتاندی:«
- لە هەموو لایەکەوە هەشمان بۆ گیرایتەوە».
- جا دەنگی تۆزێک هەڵبڕی و:
- ئەگەر مرازت مانی بووایە، دەبووایە هەر لەهەوەڵەوە بە گەڵ پێشمەرگانت بدابووایە، ئەوکات دڵمان دەکەوتە عەردی و خەممان نەدەما. نەک بیدیتە دەست جاشان.
سەری دەغەزانی بادا و جاگوتی:
- سەت حەیف و مخابنە ئەم ناوە پیرۆزەیان پێ لەکەدار دەکرێت. ئەوانە جاشی داغمەدار و پێشفیتنەنە و بەدەستی ئەنقەست ئێمەیان تووشی ئەو نەهامەتە کرد. ئەوا سەت جاریشە دەڵێم: بێجگە لە زەرەروزیان چیدیکەیان لێرەچاو ناکرێت و بەچاویش دیمان.
- بۆ ئەوەی مەرامی بوو ڕووی بەلای مام ڕەمەزان وەچەرخاند و

گوتـی:

- تۆ خوا وانییە کاکە؟.

- هەناسەکی داخداری پڕ بەسییەکانی هەڵکێشا و گوتی:

- وایە زیاتریش.

- بەڕوو وەرگێڕاندا:

- خوشـکە گورجـی مـن و چەنـد ڕیـش سـپیی ئاوایـی زۆر لەبـەر ئـەو بـێ مـەزەب و رافزیانـە پاڕاینـەوە و هیـچ نەمـا لەگەڵیـان نەکەیـن. هەتـا دەسـت مـاچ کردنیـش:«

- کـوڕە پیـاوی چـاک بـن یەختیـار و ژن و منـداڵ نـا...، گەنجەکانمـان، بـۆ ئـەوەی نەکەونـە داوی ئەنفالـەوە لەگـەڵ خۆتانیـان ڕاپێچـن».

ئاخێکی کەسەراوی هەڵکێشا و گوتی:

- کەچـی لـە بریتـی بەزەیـی یـان پێمانـدا بێتـەوە، بەڕوویەکـی گـرژو عەبووسـەوە، لایـان وابـوو باوەکوشـتەیانین گوتیـان:

- تاهوو..تاهوو. ئێمە وا چەکی دەستی خۆمان لێ قەزایە........

- «یاخوا هەر لێتان قەزا بێت».

- ئەوجا هەر ئەمەمان مابوو ئێوەش بکەینە سەربار.

سـەفین لـە دڵـەوە سـەلماندی، هەرکـە شـێخ هەسـتی پێکـرد وە بـەر گوێـی چرپانـد و:«

- چدەکەیت ماڵوێران!. ئەگـەر ڕێگەیـان بدەیـن مسـۆگەر کـوڕە خوێڕییەکەی ئـەو شـەیتانە، بـێ ئامانـەش خۆشـی وترشـی وەگـەڵ دەکەوێـت، ئەمـەش دوارۆژ لای کاکـە ئەحمـەد ئـەو ڕەواجـەی ئەمـڕۆ هەمانـە لای دەڕوات».

مانگێ دوو سێ هەزار دیناری بۆ دەناردن.

* * *

چەندین زیلی عەسکەری تژی خەڵک و کەل وپەلی تالآنەوە ئامادەی بەڕێکەوتن بوون.
سەگە بۆر بە دیار ئەو زیلەی خاوەنەکەی تێدا بوو هەڵتۆتکابوو..و بێن نابێن بە سەیرکردنی ناو زیلەکەوە سەری دادەنواند و کلکی بادەدا.
خەکەڵکەی ناوی لەتاو دەردە ئەنفالەوە، کە نەیاندەزانی چییان بەسەر دێنن، هێنێکیان لەبەرخۆیانەوە دەکورکانەوە، هێندێکی تر دڵیان بووورابووەوە. هێندێکیش بەچاوی ئەبلەق و ڕەنگ پەڕین و بێزەینییەوە سێرەیان لە دەرەوە گرتبوو...و خەڵکەکەی تریش هەر ئاوا. زیلێکی تر لە نزیکیانەوە لە پڕو پاتاری فەرهوودەوە وا ئاخێنرابوو. وجێگەی دەرزییەک نەدەبووەوە. دوو سەرباز خەریکی ڕێکخستن و بەستانی شتوومەک و کەل وپەلەکان بوون.
سەربازەکانی ناو ئاوایی هەرکەلە نێو ماڵێکدا تالآنێکی باشیان چنگ دەکەوت لە خۆشیان ڕستەی کلاشینکۆفێکی بووکانەیان دەهاوێشت و خەڵکەکەش گشت پێڕا دەچڵەکین و دەترسان تەقەی ڕەمی کردنی خزم و کەسیان بێت.
عەرەب لەکاتی فەرهوودکردندا بەزەیی یان بۆ سونەتیش بە خەیاڵدا گوزەر ناکات و هەرچییان دەسکەوێت بە گەز و مازووی دەخەملێنن.
لانکێک لە دەستیان کەوتە خوارەوە، یەکێکیان چوست دابەزی و لەگەڵ دەست گەیاندنی سەگەبۆر تومەزدەیزانی بێشکەی خاوەنەکەیەتی، لە هیکەوەپڕیدایە و لەژێر خوێنا.
سەربازەکە لە حەژمەتان ئاگای لە لانکەکە براو پڕ بە زار:
– هاوارە هاوارە دەخیلتان بم قوتارم کەن هاوارە.
هاوڕێیەکەی تاسای نەکرد بە دەنگییەوە بچێت، کەچی «ئەنوەر»ە

جاش گوللەیەکی سرواندێ و بووە سەرنج کێشی خەڵکە بێ ئاگاکانی ناو زیلەکانەوە و لە دڵیان چەکەرەی کردبوو ئەوانیش بە دەردی سەگەبۆر دەچن. ناخەسمە زیلەکەی ئەمان. لەسەر حاڵی خۆیان بەزەییان پێدەهاتەوە. نەخەسەلە مام ڕەمەزان هەتا شل و کوت بوو بۆی کورکایەوە و فرمێسکی درشتی بۆ ڕژاند.

حەمەرەحیم هەرکە بەچاودیتی وا بە نوسکە نوسک برینەکەی دەلێستەوە و نۆباتیش لەسەر حاڵی شڕی خۆیەوە، کەسەری بەرز دەکردەوە و بۆ ناو زیلەکەی ئەمانی دەڕوانی و، وەک شکوای حاڵ بکات، بە کلک لەقانەوە قاییم تر دەنووسکاوە و بە سۆزەوە گوتی:

- دەگ هەرچی جاشە بە قوربانی برینەکەی تۆ بن. خوێنی هەرچی جاشی داغمەداری ئەمڕۆیە، بەلاگێڕی پشکە خوێنێکی تۆی بە وەفا و ئەمەک بن. ئەگەر ئەو خائینە بەزیوانە ئەو گۆردە بە کرێگیراوانە هەڵوێستی تۆیان هەبووایە ئێمە قەت حاڵمان بەو حاڵە نەدەگەیشت.

مام ڕەمەزان وتەکانی وەک حەدیسی قودسی بە پیرۆزی دەخەملاند و لە دڵەوە دەوری دەکردنەوە و:

- بەخوا قەسەم هەر تۆ ڕەچەڵەک و هەڵوێستی ڕاستەقینەی ئەو خائینانەت ناسیوە و بەس!.

ملازم «حوسێن عەیاش» زابتی بەرپرسی هێزەکە، کوشتن و تالانی کوردانی بە پێویستی دین و دنیایی دەژمارد و هەرچەند خەڵکەکەی ئازار بدابووایە، بەز دەکەوتە سەر پەراسووەکانی، بە دەنگی تەقەکەوە دەرکەوت و ڕووی لە ئەنوەرە جاش کرد و گوتی:

- ئەو سەگە بەرگری لە ماڵی خاوەنی خۆی کرد، بۆیە زۆر لەتۆ...و موستەشارەکانی ئێوەی کوردی یاخی و مەلعوون شەریفترە.

* * *

کاتێـک شـێخ سـەدرە و چەکدارەکانـی لـە قەوامـی تـرس دەرچـوون، لەسـەر شـوێنێکی زۆر بـەرز، بە دووربین دیقەتیدا ناوچەکە و دووکـەڵ دنیـای داگرتبـوو، هـەر ئاوایـی یـەک و چەنـد لوولـە دووکـەڵ.
کوردەکانـی نـاو شـار، بـە دیمەنـی دووکەڵـە زۆرەکانـەوە، لـە ئاسـمانی دەڤەرەکـەدا، تەرحـی هەورپاڵیـان بەیەکدابـوو، زانیـان خەڵکەکـە گشـت کەوتوونەتـە داوی ئەنفالـەوە. نەخاسـمە کـەس و کاری ئاسـۆی قاسـید لـە برارۆیەکـی وایانـدا زۆر لـە دوورەوە دەبیسـترا.
- وەیرۆ. رۆڵە ئازیزەکەمان رۆ...
- وەیرۆ. جوانەمەرگەکەمان رۆ...
- وەیرۆ. رۆڵە بە موراد نەگەیشتووەکەمان رۆ...
- وەیرۆ. رۆڵەی بەهاوار چووەکەمان رۆ...
هەرکـە سـیرەی شـێخ سـەدرە لـە سـەر دووکەڵـی ئاڤایـی «ش» کـە چەنـد سـاڵ مۆڵگـە و پێخوسـتیان بـوو گیرسـایەوە، لـە سـەرابیدا ئـەو ((........،........)) برانـەی هاتـەوە یـاد کـە هێنـدە شـەو تـا شـەبەق........، ....... ختۆکـەی حـەز حەزۆکێـی هەتـا ماوەیـەک بەنێـو گـەڵ و گوانیـدا مێرووڵـەی کـرد. دەمێـک بـە دەسـت هەڵیشـاوت و پشـووی ئۆخـەی خـواردەوە و بـە سـمێڵە خچکـەوە گوتـی:
- تراندن ئاوا. دەبێت هۆ بابینە.
سەفین لە ژێر زاری گەیشت و گوتی:
- ئەو مەنگۆزەی ئەڵێیت؟.
- بەڵـێ. بە دەردێکی وام بە فەتەراتدا نـاوی خۆی و بنەچە قەڵپەکەیشـم، بۆ هەتـا هەتایە ڕەش کردەوە. ئـ..هــ گریمـان بمکوشتبووایە هەروەکو ڕای هەمووتـان و قیـادەش وابـوو لـە ناوچەکـەدا دەنگـی ئەدایـەوە و بێگومـان ئەوسـا زۆر کـەس ئەبوونـە لایەنگیـری و سـەرکۆنە دەکـرام و

ناچار دەبووم ڕوخسەتی کوڕ و کوڕەزاکەیشی بدەم.
پێشوویکی سەرفرازانەی داو.. و بەڕوویەکی بافرەدارەوە گوتی:
- کەچی ماڵی کاک ئەحمەد ئاوابێت هەردەم بۆ ئەم مەسەلانە بیرتیژە و ڕێی بە کونەمار ئەبات. ئێمەش ئەمڕۆ لەم ڕێبازە پیرۆزەماندا هەرگیز دەسبەرداری ئامۆژگاری و پلانە ڕەنگینەکانی نابین:
- کاک سەدرە دەبێ لەو پیاوە چەتوون و بەدئەخلاقەی لەناوچەکەتان گیرساوەتەوە: «حەمەڕەحیم»ی ناکەس بەچە و زۆڵ بە حەزەر بیت و پێویستە بە ڕێگایەکی وا خۆی و نەوەکانی بتۆپێنیت نەخۆی و نە ژن و منداڵی، هەتا شەیتانیش پێنەحەسێن. ئەگەرنا بچێتە پەڕەکەی ئاسمانیش لەزەبری نەوەگیرە پیسەکەیانەوە دەرباز نابێت. منیش نامەوێت بۆ بەدیهێنانی ویستێکی خۆم جەنابت تووشی هیچ گێلەوەژەیەک بکەم.
کاغەزەکەی بە زەردەخەنەیەکی شانازییەوە خستە بان دیدەکانی.
- باش بوو لەتوڵەی ئەو هەموو یارمەتییەی بۆ مانی دەنێرێت نیازەکەیم کە ساڵەهای ساڵە ئاودالی بوو بە سانایی وەجێ هێنا. هەرزوو مژدەی بە فەتارەتدانی بنەماڵەی ڕووتانی بەسەر و بەر و بە قاسیدێکی تایبەت پێگەیاند و:«
- سوپاس بۆ خوای مەزن و بە هیممەت و پلانە ڕەنگینەکەی جەنابتەوە ئاجەراتی غەنیمەکەتانم، نێرومێ، سووک و سانا بە فەتارەت بردن».
لەخۆشییان شتاقە لینگانی زەوی نەدەگرت و لای وابوو دینا بووەتە موڵکی ئەژدادی و هەردەم پێوەی دیاربوو:«
- ئۆخەی خۆ نەمردم تۆی ئەو بنەماڵە قەرەجە خوێڕییەم بڕییەوە و لەکۆڵ خەڵکی شارە ئازیزەکەم کردەوە!».

- مەولوودێکی گەورەی لەسەر خوێندەوە.
- سەفین بەشداری فەرەحییەکەی کرد و کەچی لەلایەکی دیکەوە بە ساردییەوە گوتی:
- ئەوەی ڕاستی بێت لە شەکرم پێخۆشترە، بەڵام....
- ئەویتری کردە خێزێک و قووتی داوە.
یەکسەر لە مەرامی حاڵیبوو، ئەو دەم هەستی کرد پیلی لەتاوانێکی یەکجار گەورە و نەگریسی وا ڕووچووە بە حەوت خۆڵەسوور و ئاوان بسمیل نەکرێت، کەچی پشووی بە هەندێ خۆشبوو: خۆی یەک لەو سەرکردانەیە ئەگەر سەت خیانەتی گەورە و بێزەوەری ئاوا لە حەدیش بەدەر ئەنجام بدات، لەلایەن سەکردەکەیەوە حەرەجی کەم و زۆر لێناگیرێت. نەخەسەلە ئامۆزای ئەحمەدە گولەشە. هەرچی بکات ئاوی بێتاوانی بۆ . ڕژاوە.
- لە گەڵتدامە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی ناوچەکە بە دڵ و گیان لەگەڵ ئێمە دابوون. ئەوە نکووڵی لێناکرێت، بەڵام ئەوەی شیاوی باسە لەبەر ئەوە فکرییەن پێنەگەیشتبوون، خۆشت لەم ڕووەوە لەمن شارەزاتری هەروەکو لە ڕێبازی شۆڕشە نوێیەکەمانە هاتووە، تا میللەتەکەمان لەم جۆرە کەسانە پاک نەکرێنەوە ئێمەی کورد ڕۆژ بەڕۆژ لەئاواتە مەزنەکەمانەوە دوور ئەکەوینەوە. ئەگینا خۆ دێیەکانی تر ئەو قورمساخەی لێنەبوو.
باوەڕی زۆر پێ بوو..و بە وتەکەی تەگەرەی دوو دڵی فڕی و لە ناخی سەقا درا فەوتانیان لەمانیان ڕەواو هەموارترە.
شوان بە سینگ هەڵکێشانی کەیف و لێبانلێسیەوە گوتی:
- بەینم بەینەللایە بۆچوونەکەت لەجێیە!.

خەلیل لەشروی دەر دە ئەنفال و بەفەتارەاتدانی خەڵکە بێ تاوانەکە ختوخۆڕا، زۆرە زۆڕ دەگریا و خواردن و خەوی فڕین. چەندی کرد و کۆشا لەترسی گیانی کە سوڕ دەیزانی تێدەچێت تاسای بەرپەرچدانەوەی ئەو خیانەتە گەورە و دمۆرەی کەم وزۆر نەکرد. گریمان لەتوانای بووایە بە دەستڕێژێک ئەو تۆقە عزرائیلەی کە بووبووە مۆتەکەی هەوگی دەپچڕاند. لەمەی زیاتر لە دەسەڵاتی دانەبوو، لە دەروونەوە بە کورکانەوەو بداتە بەرێ:«

- دەوجا وەرە تێکە و فڕکە ئەو هەموو خەڵکە نازادار و بێ گوناحانەی تەسلیمی دەستی چەپەڵی عەرەبی داگیرکەر کرد، هەنجەتەکەش فکرییەن دواکەوتوونە و نەگەیشتوونەتە پلەی ئەو پێشکەوتنەی ئەو دەڵێت: واتە نەبوونەتە گورگی هاری دەم بەخوێنی کێو. و هەلەتانی وەک خۆی».

دەمێکی زۆر گریان بێنی پێداو:«

- ئـ. هـ بابە ئەوە گوتمان پیاوەکان هەر نەییسە و حەقەمست بوون ئەدی ژن و منداڵە نەبالق و ساواکان بۆ. ئەدی ئەو ئافرەتە((........،........، ........))

دووبارە گریان بەرسینگی لێساند و:«

- بەڕاستی بەرگریمان لە میللەت کرد و ناوچەکەمان پاراست!».

ئیمانی لەو ساکەوە بە خەبات و تێکۆشانی نەتەوایەتی نەماو:

- ئەوە قەت خەسڵەتی پێشمەرگان نییەو نەبووە کەواتە حەمەڕەحیم ناحەقی نەبوو ناوی نابووین:« پێشفیتنە و جاش داغمەداری خائین!».

بە حەقی خوا شایەنی خراپتریشین. بەس نازانم بڵێم چی:».

* * *

هێشتا دووکەڵ بەری ئاسمانی دەڤەرەکەی زەریف بەرنەدابوو تۆزی قەتارە بەستووی لۆری و زیل و جێبی عەسکەری مشتی کەسانی ئەنفال کراو...و شرۆشاتاری نەهیبە، بەرەو دواوەدەچووە پاڵ. سەرایی ئۆتۆمبێلان گەیشتە نێوشاری کەرکوک و دواییشی لەنزیک ناوچەکەوە بوو.
ئەنفال کراوەکان ئەو ڕۆژە ئاویش نەچووە سەر زاریان و زیڕەی زارۆکی کۆرپە و پارچەڵە، لە تینوان دەگەیشتە کەشکەلانی ئاسمانەوە.
- ئاو. ئاو.
- دایە ئاو.
- زۆرم تێنووە و ئاوم دەوێت ئاو.
- خنکام لە تێنوان خنکام.
- ئەی هاوار. ئاویشمان نادەنێ ئاو.
هێندێکیان دڵنیابوون داواکەیان قڕنەیەک ناهێنێت لەگەڵ پەنجە خستنە سەرزاریان و:
- وسبن و. وس. س.
- بۆ خواتان پێدەڵێین، دەنگتان لەبەروە نێت. دەنا عەرەبە ڕەشەکان بێن ئەوەی داوای ئاو بکات زمانی لە بنەوە دەبڕن.
هەرکە سەربازەکان سەریان بەناو زیل و لۆرییەکاندا دەگرت منداڵە تینووەکان لەترسانا چرچەیان لەخۆ دەبڕی.
خەڵکی شار زۆربەیان کەلەتوخمی ئەنفالکراوەکان بوون پێتاسان و گریان لەهەوگیان قەتیس ماو هەتا هێندێکیان ئەگەرچی ترسی زۆری لەدوا بوو، بەڵام ویژدان و بەزەیی و هەستی نەتەوایەتی بەسەریاندا زاڵ بوو.. و دەنگی هۆڕژنی گریان لە دوروەوە دەبیسترا.
هێندێکیان گوێ بیستی نووزە نووزی منداڵان بوون و:

- وەبیاوە خنکام لە تینوان.
- ئاوم ئەوێ ئاو.
- ئەرێ بۆ ئاومان نادەنێ خۆ ئاو بە پارە نییە.
دەلحاز بەرۆکی خەم و گریانیان بەرداو تانی منداڵ و مێردمنداڵیانیاندا و لە هەر لاوە، بە دۆلکە ومەسینە و جام و پەرداخان ئاویان بەسەردا باراندن. ئەوانی دی:«
- حەقە مستن هەرچییان لێ بکرێت. غێر کوردی یاخی چیاو چۆلانن».
سەربازەکان بیلبتوون لە ئاستیاندا وا حەملاندرابوون هەرچەند بەقسە قۆڕ و جوێن و سەر سمک و قۆنداخە تفەنگان ڕیسوایان بکەن بە خێروچاکە و پێویستی سەرشانیان دەژمارد.
ئەنفالکراوەکان، لە بێ ڕوحمی و چەمووشی غەنیمەکانیان زەندەقیان چووبوو. بە ئەمان بووایە هەرگیز بچمە دێزە و عەبووسەکانیان نەبینن. چ جای داوای شتێکیان لێ بکەن.
ئەگەر یەکێکیان ڕووبەڕوویان بووەستابوایە، وەک مەڕ چاوی بە گورگ بکەوێت ئاوا دەلەرزین و هەناوە کوتەیان پێدەکەوت و چاوی بیمیان ژ بەر خۆیان شۆڕ دەکردەوە.
حەمەڕەحیم هۆشی بەرەو کزی دەچوو، لەبەر سک چووەکەی لەو پەڕی بێ هوورەییدا بوو. کەچی گورجی لەسەرخۆ بوو. لەدڵی چەسپیبوو کوڕەکەی جارێکی تر نان دوو لەت ناکات، خەمی هەرە گەورەی لەم ساتە حەرەج و سامناکەدا، زەینی هەموو کەس بۆی هەرگیز دانە دەوەراوە، چارەیەک بۆ بۆرە ئومێدێکی کە بە «نەبەز»ی کوڕەزاکەی مابوو بدۆزنەوە. ئەگەرنا بۆ تۆخمەکەی ئاوێ بێنەوە و دەستان بشۆ. ماوەی چوارێکە سەعاتێک پتر دەگ

لەبەر گوێی چرپاند.
ئەو ڕۆژەش هەر لەمبارەیەوە دەرسی دابوو:«
- کوڕی من بووەتە پیاو و ڕێ و جێی باب و باپیرانی ئاوەدان دەکاتەوەو نایەڵێت کوێر بێتەوە!».
چەند دیناری لوولدراوی لەژێر کەزییە ئەستوورەکانی کە لەترسی جەندرمەکانی عەرەبەوەی حەشاردابوو دەرهێناو بە سپایی لە گیرفانی پەستاو بەهەردوو دەست سەری گرت و تێروپڕ کوڵمە خڕوکوپنەکنی ماچ کردن و جا بە بەرۆکی خۆیەوە نووساند.ویستی لەپرمەی گریان بدات، کەچی بەرژەوەندی بنەماڵەکەیان بەسەریدا زاڵ بوو...و پاش هەناسەدانێک بۆ گاڕدانی بەدەست لە پشتداندا و زەنگوڵە بەستانی فرمێسکە درشتەکانی و گوتی:
- دەزانم کوڕی من لەو ڕۆ. ڕا بوەتە پیاو. پیاوێکی ئازا و بەغیرەتی نەوەی عەولا ڕووتەی کەندێناوەو قەت نایدۆڕێنێت و چیم پێگوتووە بە جوانی و ڕێکی جێبەجێی دەکات. دەبرۆ خوا چەپاڵەت بدات.
کاروانەکە پێش گڕدانی «تالب» ڕاچڵەکی و هەرکە خەڵکی ناو زیلەکەی ئەمانی بە سەرکردەوە کە گوایە بە چاوی زەقی غەزەبەوە سەیری کردووە. وسووی دابەزاند و هەتا شل و کوت بوو بە کیرکە فیلانی داپەلۆسی.
گورجی بەخۆی نەوەستاو ڕووی زاری تێکرد وگوتی:
- ڕۆڵە سەرهەڵبڕە و خوا ببێنە خوا..
بەغەزەبەوە:
- .... بڕە بەک.
«بۆ ئێمەمانانی بێکەس و قوڕبەسەر هەر بە ڕبەی تەقتەقە» بێ پەردەی باکەوە گوتی:«

- ڕۆڵە چ خێرێکی خوایە ئا..وا. بێویژدانانە لەو پیاوە پیرە بێ وجوود و نەخۆشەی دەدەیت!. چاوهەڵێنە خوا ببینە خوا!.
ئەمەی کاتی دارکردنی حەمەرەحیمی لەلایەن شوانەوەی گوت.
- پیرێژن سەگانی خوا لە کوردستان باری کردووە و هەتا زووە لەبەرچاوم وەلبە، دەنا تۆش شاپ ترێن ئەکەم».
مەلازم حوسێن ئاگادار کرا:«
- سی و حەوت کەس (٣٧) ماون. ژن و پیاوەکان تەواون».
بەسەریانیدا قیژاند و:
- کوا. منداڵێکتان دیار نییە؟.
ڕەمەزان توانی بە نەرمییەوە زار هەڵبڕێت و:
- گەورەم هەر ئەوەندەین.
بەهەڵچوونی پترەوە:
- وەک سەگ درۆ دەکەن، ئێوەی کورد ڕێوینەو پشتتان بەهەوەنتە لە زەوی نادرێت و دەزانم منداڵێکتان ڕزگار کردووە، هەتا دەنگ و باستان بۆ یاخی بووە خائینەکان بەرێت.
دەنگی بەرزتر کردەوە و گوتی:
- قورتان بەسەر خەبەر بنێرن و نەنێرن هەریەک حیسابە. ئەویش زیندە بەچاڵ کردنتانە.
کەم و زۆر نەیتوانی چ شەکری دیکە بشکێنێت. تەنیا سەری ترسی بۆ بەردەمی خۆی دانواند.
گورجی لە دەروونەوە دوا:«
- بە هەموو دین و مەزەبێک کوشتنی ئێوەی دڕندە واجبە».
لە نێو هەمووواندا گەشییەکی ئومێد زایە ڕووەکز و مەلوولییەکەیەوەو بە بافرەیەکی شانازییەوە چاوی لە چاوی پیاوەکەی بڕی.

ئەمیش لە خۆشییان تەزووی کامەرانی لە تۆقی سەری پەیدا بوو..و ڕۆیینی مارەزیو ئاسا لە ژێرپێی دەرچوو. و زەردەخەنەی خۆشی ڕووەزەرد و بێحدوورییەکەی گەشاندەوە و بەسەر «زەحیری»یە بەردەوامداکەیدا. زاڵ بوو. بە دیدەی پڕ سۆزی خۆشەویستییەوە دەمێک بۆی خەنییەوە. لەگەڵ پشت تێکردنی ئەفسەرەکەوە گوتی:

- دەست خۆش، دەست خۆش!. بەڕاستی هەناومت فێنک کردەوە!. خوا هەناوت فێنک کاتەوە.

یەکەم کەرەت بوو لەوەتەی هێزی ئەنفالی قڕکردنی کوردان پێی نابووە دەڤەرەکە وە زەردەخەنەی ئاوقای ڕووە گرژەکەی ببێت.

- بڕوا بکە تازە ئەلەم لە بەدەنم بڕا.

بەدەنگێکی کەمێم حێل ترەوە:

- ئۆخەی خوایە لە کیسەت بە زیاد بێت نەوەمت بەو ئەنفالە بەدیۆم و عەرەب کردەنە بڕاندەوە!. لەمەودوا لەمردنی خۆم بێ منەتم تەنیا...

لەگەڵ ڕووانینی بۆ ئافرەتەکان و ئاخ هەڵکێشانێکی دڵتەنگییەوە، لە دڵەوە مرتاندی و:

- داخی ئێوە نەبێت کەهیچ شتێک پڕی ناکاتەوە.

لەگەڵ گریانێکی دەروونییەوە:«

- بریا بە بریایێ ئەنگۆش وەگەڵ کەوتبووانایە!».

زاری بە ڕوویدا هەڵێناو:

- خۆ پێت گوت: لەمەو دوا نە حاجی ئاغا و نە عەرەب و نە بەعس دوژمنمان نینە، ئەگەرنا خۆ گیانی لەگیانی دایک و خوشک و پلکی شیرین تر نییە.

بە ڕووێکی گەش و عوبابەوە: مەراقەکەی بەم تەرزە داکەواند:

- خەم مەخۆ واجبی سەرشانی خۆم لەم ڕووەوە تەواو بە جێ گەیاندووە.
زەردەخەنەی زیاتر دەرکەوت و:
- ئافرەت گەردم ئازاد بکە تازە، من ناتوانم ئەو چاکە گەورەیەت پڕ بکەمەوە.
ئەفسەرەکە هەر زوو لە لستەی ناوەکان ژمارەی یەک لە منداڵەکانی ناو زیلەکەی ئەمانی، هێشتا بۆ بارەگای فەوج نەناردرابوو کەم کردەوە و ناوەکانیان بە گوێرەی دەفتەر نفووس نووسی.
گورجی ئەنوەر جاشی بۆتیبووەو زاری بەڕوویدا کەیفدارانە کردەوە:
- ڕۆڵە هەتا ڕۆژی حەلاو..وەلایێ لەژێربار ی چاکەت دەرناچین و مەمنوونی پێڵاوەکانتم، شاللا خوای مەزن چەپاڵەت لە هەموو بەڵاو نسکۆیان دەدات.
بە بزەیەکی تەڵخەوە:
- یاخوا هەرچی جاشی سادە و داغمەدارە بە قوربانی سەعاتێکی تۆبن. ئەوجا تۆش بە قوربانی کەلاکی سەگە بۆر بیت.

* * *

لە دەرگای بانقەوە هەتا گەیشتە کەرخی چایەخانەی «سەید سەلیم» تاسای بانگ کردنی نەبوو. بەتان لە خۆدان، بەهێدییەوە دووجار لەسەریەک گوتی:
- پاکەت، پاکەت.
تەریقی ڕەنگی پەڕاند و لای وابوو عەشاماتی ئەمبەر و ئەوبەری شەقامەکە قەشمەریانە سەیری دەکەن، بە ئاوڕدانەوە دەمێک لە شوێنی خۆی قیت چەقی و پاشدان لەگەڵ هەنگاونانا ئەمەی بە یادا گوزەر کردو:

- ئێمە خۆ چ مەعاشمان نییە، بە چی دەژین!؟.
ئاخێکی درێژی لەبنەبانی سکیەوەی هەڵکێشاو جا بۆ دڵدانەوەی گوتی:
- ڕۆڵە دڵ لەدڵ مەدە خوا هەتا سەریدا بێت ڕزقیش هەر دەدات.
هەتا لەم ڕووەوە دڵنیا بێت و گوتی:
- من لیفکە و دۆخینان دروست دەکەم و دەیانفرۆشم تۆش لە خوا بەزیاد بێت تاقە پیاوی ماڵێیت و پارەت دەدەمێ وەکی مەردان پاکەت بکڕە و لە بازاڕدا بیفرۆشەوە.
هەوەستی پێهات، کەچی بە پاکەت فرۆشتنەکە نە دیتکانە واقی ورما و گوتی:
- عەیب نییە!؟.
بەسەرسوڕمانەوە:
- ئەیڕۆ. ڕۆڵە لۆ عەیبە!؟.
بۆ هاندانی دوای تۆزێک دامانەوە گوتی:
- ڕۆڵە ئەمڕۆ تەنیا دزی و حیزی و جاشاتی و دەست پانکردنەوە لەبەر خەڵک عەیبە. کاسبی و نان پەیدا کردن بەدەست و قام و ئارەقەی نێوچەوانەوە مەردایەتییە و لە کن خوا و پێغەمبەردا خۆشەویست دەبێت و خەڵکیش بە چاوی ڕێزەوە تەماشات دەکەن و دەڵێن:«
- بەخوا بابە نەبەز پشکی حەلالە و نەیدۆڕاندووە و بەو گچکەییەی خۆی و داپیری بەڕێوە دەبات».
هەننۆب بەملاوبەولایدا ڕووانی و:«
- ئەو ژیانی منی لە مردنی ئەنفال قوتار کرد. ئەگەرنا منیش زیندەبەچاڵ کرابووم، بۆیە هەقە هەتا مردن لە گوێی و ئەمری دەرنەچم».

«خۆی لە دەرگای زیلەکە شۆڕکردەوەو چارۆکە پڕ لە کەل وپەلەکەی کە هەنجەتی دابەزینی بوو لەداپیرەی وەرگرت.
عەبد بەهۆی برینەکانییەوە پشووی درابووێ و تالیبی هاوڕێشی لەم ساتەدا بۆ پاکەڕ کڕین چوو بوو، تەنیا ئەنوەرە جاش سایەدی زیلەکە بوو..و گورجی ئەو ساتەی بە هەڵزانی.
هەرکەچاوی پێکەوت دڵی داچڵەکاو ئەژنۆکانی لەرزین ڕەنگیشی زەعفەران زەرد.
پێشتر گورجی بەدزی و ناورانەوە:
- کاکە ئەنوەر بکە سەدەقەی سەری خۆت و منداڵەکانت لە پەنایەکەوە ئەو تفارۆکەمان بۆ قوتار بکە.
لە هەوەڵەوە بەهەڵچوونی زۆرەوە بەرپەرچی داوەو:
- پیرێژن ئەوجا هەر ئەمە مابوو بە کوشتنم بدەیت.
ئـ.هـ من جاشم جاش. چاکیش دەزانیت جاش چاکەی هەرگیز لەدەست نایەت، نا.
کەچی ئاگری هەناوی نەیهێشت بەهیچ کلۆجێکەوە یەخەی بەربدات و گوتی:
- کاکە بەو خوایەی دەیپەرستین من و ئەو پیاوە پیرە پەککەوتە و..
بەدەست هێماکردن و:
- لەگەڵ ئەو زەعیفانەی بەرچاوت ئەوەی لە دارەتی دنیایێ شک دەبەین ئەو نێرینەیە وبەس.
ئەمە لە کەلی شەیتانی دابەزاند. کەچی بە هیچ تەرزێکیش جەسارەتی جێبەجێکردنی نەبوو.
بە هەشتاوی و قارەوە هەنگاوی بۆلای هاوێشت و بەدڵە مەرزە و دەست هەڵشەقانەوە گوتی:

- کوڕە ئەوە بۆ دابەزیت!؟.
کـەل وپەلەکانـی باپیـرەی لەنێوچارۆگەکـە نیشـاندا گوویـان پێـوە دیاربـوو..
- بۆنی ئەوانە هێڕی کردین دەچم فڕێیان دەدەم.
بـە بەهانەکـە هۆیێکـی لەخـۆی زانـی، لەدواییـدا بـە گورگـە ئاودانـەوە بەمـلاو بـەولاداو:
- خوایە کەس هەست پێنەکات!.
بەقارەوە گوتی:
- دە بڕۆ هەتیو هەر لەبای غارەوە فڕیاندە ناو خاسەوە.
کـە لـەو دیـو شـەقامەکەی ئـەوان لێـی سـەنگرابوونەوە بـوو. پـاش ئـەوەی بـە تـرس و لـەرزەوە بـۆی دەسـت نیشـان کـرد.
دەیزانـی بـە فیتـی داپیریەتـی و ناگەڕێتـەوە، تـا ڕادەیـەک لـە ملـی گـران نەبـوو، کەچـی چەنـد تانـی لەخـۆدا نەیوێـرا پێـی بڵێـت:«
- بڕۆ. مەیەوە».
ناحەقیـش نەبـوو ئاشـکرابووایە بـە بیسـت و چـوار سـەعات خاکـی لـە توورەگـە دەکـرا. تەنیـا لەگـەڵ دووپـات کردنـەوەی وتەکـەی و گورگـە ئاوڕدانـەوە بـە پشـتە دەسـت ئامـاژەی بـۆ نەگەڕانـەوەی کـرد.
بەمە پەردەی شەرمەکەی دڕاو بە خوایشتی حەزییەوە گوتی:
- پاکەت پاکەت. پاکەت پاکەت.
ئێوارەیـەک وێـڕای ئـەوە داپیـرە چاوێکـی چەنـد ڕۆژ بـوو پەنمـاو و شـین و مـۆڕ هەڵگەڕابوو..وبـە دەیـان جـار لێـی پرسـی بـوو:
- داپیرە چاوت بۆ ئاوا ئەستوور و شین و مۆر بووە؟.
بە هەناسە هەڵکێشانێکی هێمنیەوە گوتی:
- کوڕم دەردێکە و خوا ناردوویێتی و زۆر شکور.

- بەدەردچۆن یەکە و جار ئاوا زوو ئەستوور دەبێت.
- ڕۆڵە تۆ نازانیت هێندە. دەرد ئاوا بە حوجەتە.
هەستی کرد زۆر ماندوو..و شەقییە، کەچی کەم و زۆر لەمبارەیەوە نەیدواند. شەو درەنگانێ لە ژێر پێخەفدا ناڵەناڵی بیست و دەلحاز پێ دڵتەنگ بوو، بە ڕوویدا هەڵشاخا و گوتی:
- داپیرە ئەوە چاوت دێشێت؟.
لەگەڵ نزم کردنەوەی دەنگی و هەستاوە و لایوابوو. بەخەبەر نایەت، هەتا دڵی چ نەکات و گوتی:
- ئا. بەڵام لە جاران باشترە.
بە مەراقەوە گوتی:
- تۆپێتنەگوتم: چاوت چدەردێتی؟.
- ڕۆڵە ئەدی پێمنەگوتیت؟.
بەیانی زوو پێش ئەوە تفەڕکی زاد بکات بە نەنکی گوت:
- داپیرە من دەتوانم لیفکە و دۆخینانیش بفرۆشم.
لە زمانی حاڵیبوو: دەیەوێت باری ڕۆژانەی سووک بکات. بە بزەیەکی حەپەسانەوە دەمێک لێیمووڕ بووەوە و گوتی:
- ڕۆڵە پێت ناکرێت و لێتدەدزن.
بەرپەرچی بەڕالەخۆ. وەداوە و گوتی:
- کێ حەدی هەیە لێم بدزێت.
هەتا باوەڕی پێ بهێنێت و گوتی:
- دۆخینەکان بە قولفانگە لە ملی خۆمیان شۆڕ دەکەمەوە و لیفکەکانیش لە باسکی خۆمیان هەڵدەکێشم.
دووبارە بەچاوی شانازیەوە دیقەتیدایە و بۆ تاقی کردنەوە گوتی:
- بە چەندیان دەفرۆشێت؟.

پێشتر نرخەکانی لێ بیستبوو..و گوتی:
لیفکەکان بە دوازدە درهەم دەدەم و دۆخینیش بەچوار درهەم.
وێڕای خوری ڕستن و چنینی لیفکە و دۆخین و کوڵ و نان کردن و شێولێنان و کژو. وژی دیکەی ماڵەوە و گەڕان لە بازاڕ و کۆڵانان شەکەت و بێ شنگی کردبوو..
دوو سێ ڕۆژ بوو ژانی پێشت و ژێر پێی هەراسانیان لێهەڵگرتبوو. ولە هێندە شەواندا نەیاندەهێشت چاو لەیەک بنێت. لە خۆی ڕانەدەدیت هەتا سەر دەرببات. لە دڵەوە زۆر پێ خۆشحاڵ بوو..و بەکەیفسازییەوە ئاوێزانی بوو...و پاش ماچ کردنی ئەملاو ئەولای بە گوڕەوە لە جیاتی بڵێت:«
- لە شەکرم پێ خۆشترە» گوتی:
- ڕۆڵە دەترسێم پێتنەکرێت.
بەدەنگێکی قایمەوە گوتی:
- پێمدەکرێت و زیاتریش.
لە ناخەوە بە کەیفەوە سەلماندی و گوتی.
- باشە ڕۆڵە باشە. دڵت ناشکێنم ئەمڕۆ بۆ تەجروبەیان ببە.
لە دڵەوەش لای وابوو ڕۆنی لە بەدەن درا. کەچی لەسەر کەوتنی دوو دڵ بوو، لەلایەکی دیکەوە((
- با فیرە هەموو کاسبیەک ببێت و بەڕەنج و دەست و قامی خۆی، خۆی بژیێنێت. کە نیشانەی مرۆڤایەتییە ئەگەر نا دەبێتە کۆیلەی خوا پێداوەکان».
«کاتێک باوکی پێیگوت:
- ڕۆڵە من و منداڵەکان برسیمانە و دەمەوێت بە باراشێک بتفرۆشم.
ئەوکات منداڵ بوو..و هێندەی لە گوریس نەنابوو، هەرکە درایە ماڵی حاجی ئاغا و باوکی بەجێیهێشت ئەوسا حسیا فرۆشتن چییە. شەو

و ڕۆژێک گریان هەوگی بەرنەدا و هەتا بیست ڕۆژیش خواردنی تەواو بۆ نەدەخورا.
حەمەرەحیمیش هەر جارەی پێیدەگوت:«
- هەرنەوەیەکمان نانی بە ئارەقەی نێوچەوانی خۆی پەیدا نەکرد و چاو لە دەستان بوو سەگی تێبەردە».
ئێوارە هەرکە دیتی پێنج دۆخین وسێ لیفکەی فرۆشتوونە لە خەنییان شتاقە لنگانی عەردی نەدەگرت. پێش ئەوەی زاری لەدەم بگەڕێت بە گوراح خۆشییەوە گوتی:
- نەمگوت پێمدەکرێت!.
بۆ هاندانی بەڕووێکی گەش و عوبابەوە نێوچەوانی بە سۆزەوە چەند کەڕەت ماچ کرد و جا گوتی:
- ئافەرین ڕۆڵە ئافەرین. بەڕاستی پشکت حەڵاڵە و نەتۆدڕاندووە و بەمووێک لە نەوەی ڕووتان دانەبڕایت و شاللا جێی ئەوان دەگریتەوە.
بەمە سینگی شادی بەرزبووەوەو لای وابوو گەڕەکی باداوەی خڕ لەسەر تەسوییە کراوە. کەچی لە دڵەوەی دەراندی و:«
- هەنگێ وەکی ئەوانم لێدێت ئەگەر لە گەڵ مامە زانادا شێخ و سەفین و شوانمان بتۆپاندبووانایە».
لێی نزیک بووەو و:
- ئەدی چاوت هەنوکە چۆنە؟.
- زۆر باشە.
- پێت نەگوتم چاوت چ دەردێتی؟.
بەتۆزێک شلەژانەوە ناچار بوو بەم چەشنە پەردەپۆشی بکات و:
- کوڕم من چووزانم. دەردی خوایە و بڕایەوە.

ئێـواران هەركـە دەگـەڕاوە هەرچـی قانزانـج و مایـە بـوو خـڕی لـە مسـت داپیـرەی دەنـا.
ڕۆژانـە وا دەبـوو پارەیەكـی كـەم تێهەڵنەدەهـات. بـێ ئـەوەی درۆی لەگـەڵ بـكات:«
- ئەمڕۆ. نانێكی فرنیم، سەموونێكم كڕی، یا چایەكم خواردووەتەوە».
داپیری هەركە حسیا، بە پێچەوانـەی ژیانی پێشـووی باوكی نەمابوو بە ناز پەروەردە كراوە، زۆر بە بگرە و درۆی بەسـەر زار دا نایـەت و بـووە جێگـەی متمانـە و هەرچـی بوویسـت بووایـە، بـەڕووی هەڵنـەدەدا و خێرا بۆی جێبەجێ دەكرد.
نەبـەز هـەر جارێـك دەگـەڕاوە، بـۆ ئـەوەی داپیـرەی بخافڵێت، كـە زۆر كـەرەت دەیدیـت لەبەرخۆیـەوە دە كوركایـەوە، واریقاتێكـی ڕۆژانـەی لەمسـت دەنـا.
«داپیـرە ئەمڕۆلـە چایەخانـەی مـن دەچمـێ شـاعیری هەنـد زۆر لـێ خڕبووبوونـەوە و كردبوویانـە هەڵڵایـەك سـەگ خاوەنـی خـۆی نەدەناسییەوە. هـەر بابـا بـوو وەكـی حەمامـی ژنـان، بـێ ئـەوەی گـوێ لـە كـەس بگرێـت لەبـەر خۆیـەوە گەرمـی كردبـوو.
ئەویش بە سركییەوە بۆ حاڵیبوون هەستی ڕاگربوو.
- یەكێكیـان، دوای خوێندەوە شـیعرێك، كە چەندی كردم نەهاتـە بـەرم هەتـا لـۆت بگێڕمـەوە و گوتـی:
- بەشەرەفم ئەو شیعرەی من لە هەموو شیعری كوردستان بەهێزترە.
- یەكێكی تر لەتەكی بوو..و قیت بووەوەو بە زەدییەوە گوتی:
- وەللا تەڕەماشیش نەبوو».
بە ئاخەوە گوتی:
- ڕۆڵـە ئـەدی باسـی ئەنفـال و كیمیابـاران لـە نێـو شـیعرەكانیان دا

نەبــوو؟.
ئەمــە لــە گــوڕی گێڕانەوەکــەی سســت کــردەوەو کــزی بەســەریدا زاڵ بــوو، لــە پرســیارەکەی حاڵیبــوو، ناچــار بــە نەرمییــەوە گوتــی:
- نەخێر.
قار لە دەروونییەوەی خەزەرەی دەرکرد و بەمەی دەربڕی و:
- ڕۆڵــە مــادام هەرباســی شــیعریان کــردووە و خۆیــان لــە قــەرەی کیمیابــاران و ئەنفالیــان کــەم و زۆر نــەداوە ئەوانــە بێگومــان شــاعیر نیــن. چاوەشــن چــاوەش. چاوەشــێکی درۆزنیــش. گەرەکیانــە ئێمەمانــی لێقەمــاو و ڕەجــاڵ بــڕاو بەهــۆی گــوێ گرتــن لــە شــیعرەوە ئاگامــان لــە کارەســاتی ئەنفالــی بەدیــۆم و زنــدە بــە چــاڵ و گونــدو شــارتێکدان و فەرهــوودی مــاڵ و ســامان نەمێنێــت.
تاکو لەمەودوا خۆی لەو جۆرە شتانە هەڵنەسوێت و گوتی:
- ڕۆڵــە نەکەیــت جارێکــی تــر تخوونیــان بکەوێت. ئەگەرنــا بــە درۆی چاوەشــاتییەکەیان ســوخەتی نــەک تــۆ بگــرە هــی دەوروبەریــش تێکدەدەن و لــە هەســتی نیشــتمانی و نەتەوایەتیت بــەو تــەرزە شــیعرانە دادەبڕێنــن.
دوو ســێ ڕۆژ پێشــتر بــە هەمــان شــێوە باســی کۆبوونــەوەی چەندیــن مــەلای بــۆ دەور کردبووەوە، جوێنیــان بــە دوژمنــی ئــەو دیــوداوەو ئــەم دوژمنــە فەرمەســۆنە، موســلمانە و ئەویــش کافــر و زەندیــق.
هەرکــە لێــی وێکــەوت پەنجەیــان بەئاســتەمیش بــۆ کارەســاتەکان درێــژ نەکــردووە بــە غەزەبــەوە گوتــی:
- ڕۆڵــە مــادام حکومەتــی ئەنفــال و زنــدە بــە چــاڵ و کاولکاریــان لا موســلمانە، ئەوانــە مەلانینــە. بگــرە خوبــزەی بەلایانــن خوبــزەی بــەلا.
بە ئەوەندەش نەوەستاو گوتی:

- ئـ.هـ هەشـیان وەسـەر كێـوە دەچـن. ڕۆژی حەشـریێ خـوای مـەزن بەمەندیلـی خۆیانـەوە لـەدوڕ ئاگـری جەهەندەمیـان هەڵدەواسـێت.
نەبەز ئەو پەڕەی وەرگێڕاو پاش دیقەتدانی سۆماكانییەوە گوتی:
- داپیرە چاوت دەڵێیت باشترە؟.
- ئا. ڕۆڵە زۆر باشترە.
- دێلیت تەماشای بكەم؟.
بە حەیرمانەوە گوتی:
- ئەیرۆ بە قوربان بۆ نایەڵم!.
- لەگەڵ سەیركردنی سوورسوور هەڵگەڕابوو..و تانەیەكی بچووكیشی پەڕیبووە سەری و:
- داپیرە دەمنی شتی پێكەوتووە؟.
عاجباتی دایگرت و بە ڕوویدا گڕبووەوە و لە ناخەوە:«
- دەبێ ئاگای لێبووبێت!؟ كوڕە منداڵە خەیاڵ پڵاوان دەكات!».
- نەخێر چی پێنەكەوتووە بەس دەردەكە زۆر كوشندە و بە حوجەت بوو.

* * *

پاش ئەللاخوایی لەدەمی ئەژدیهای مەرگەوە ڕزگار بوو مەرگەساتەكە لـە دڵـی ڕووانـد: ئـەوەی خـوا ئەجەلـی نەهێنێـت نامرێـت و چـاوی قیسمەتیشـی بـە شـارە ئازیزەكـەی ڕۆشـەن بووەوە، باویشـكی خۆشـی ئومێد بـە «تروسـكە» بۆچوونەكـەی سـەرداری بەرۆكـی بەرنـەدەدا:«
- حورمـێ بڕوابكـە و بیكـە گـوارەی پێنـج «گـۆ» ی بـە «كاریتـە»ی گوێـت بـە ڕێگـەی جاشـە سـادەكانەوە سـپ و سـاخ دەردەچێـت»!.
- بەهەنگاوی زل و گوڕەوە و بـەرەو ماڵـی كەریمـە كـوڕی دۆسـتیان ملینـا. پێشـتر ئامـۆژگاری كوڕەزاكـەی كردبـوو. و:«

- ڕۆڵە فاتێی پلکت نەماوە و عەلی مامیشت ماڵی لە شار نییە و چ جێگاش شارزا نیت، هەتاکو خوای گەورە دەروەکت لێدەکاتەوە، هەڕوە ماڵی مام کەریمە کۆر».
زۆر کەڕەت لەگەڵ باپیری سەردانی کردبوو.
بە دیتنی نەبەز وا حسیا وێنەی «زانا»شی لەگەڵدایە و لای وابوو نسکۆ چییە لە دنیادا ئاوقای نەبووە و بەو پەڕی خۆشی و سەرفرازییەوە ئامێزی سۆزی لە دوورەوە بۆ گرتەوە و فرمێسکی کەیفان شۆرابەی لە سۆماکانییەوە بەستاو لەگەڵ چەند جار دووپات کردنەوەی ماچ و گوتی:
- ئۆخەی خۆ نەبردم و وا ئەمجارەش پێک شاد بووینەوە.
خاو. و خێزانی خانەخوێیەکە، بە سۆزی خۆشەویستییەوە لێی گردبوونەوە.
گورجی هەر ئەوەندەی خۆشی بوو هەتا کەریمە کۆر لێی پرسی:
- ئەدی بۆ. هەر بە تەنیایت!؟.
کارەساتە دڵتەزێنەکەی بەیاد هاتەوە و گۆتر نییە چوار ئافرەتی جوان و گەنج بە زیرەزیڕ لە بەرچاوی وەلەک پڕکێشان بکەن:
- بابە هاوارە.
- مامەهاوارە.
- باپیرەهاوارە
- لەڕاهی خوا عارەب چمان لێدەکەن و بۆ کێندەرێمان دەبەن.
- دیارە هەمووتان کافر و بێناموس و ویژدان و غیرەتن. بۆیە بە هانامانەوە نایێن و بەرگری لەناموسمان ناکەن.
گورجی لەناخەوە دواو:«
- گورگی دەشت و بەنێی چاوبرسی و داوێن پیس بۆ شوێنێکی

نادیاریـان ببـەن»
غەریبی هەستاو خۆی بۆ نەگیراو لەگەڵ پێشوو سورابوونا لـە هـات و هاوارێکی وایدا گەورە و گچکەی بـە گریان خستن.
- وەیرۆ.. لەخۆمان ماڵوێرانی ڕۆ..
- وەیرۆ.. لە خۆمان سەربەهەشێ ڕۆ..
- وەیرۆ.. کیژە جوان و قۆزەکانمان ڕۆ..
- وەیرۆ.. کیژە ناسکە گورگان خواردووەکانمان ڕۆ..
- وەیرۆ.. ڕۆڵە ئازیزە و هەتک کراوەکانمان ڕۆ..
- وەیرۆ.. کەحێلەکانی عەرەب بردانمان ڕۆ..
ماوەیـەک بەتەوژمـی گریـان و خۆ بەملاوبـەولا وەرگێڕاندا بـە هـەردوو لـەپ لـە ڕانـە چرچەکانـی خۆیـدا. ئـەوکات حسـیان دنیـا چ باسـە. کـە پێشتر هیچی ئەوتۆیـان نەبیستبوو. کەریم بـە دەست لـە مل وەراندنـدا ماوەیـەک بەیەکـەوە هەژانـەوەو:«
- وەیرۆ. کاکەڕۆ. براڕۆ. پشتت شکاندم کاکە گیان ڕۆ...»
دوای سـەعاتێک تۆزێـک هێوربوونـەوە، مەراقـی زانینـی دایگـرت بەسـەروبەر لـە واریقاتەکـە بـگات بـە ئـاخ و نزگـرەوە ڕووی تێکـردو:
- ئاگـرم لـە هەنـاوان بەربـوو بـرای خـۆت تـەواو حاڵـی ناکەیـت بـە قوربـان.
بـە هەناسـە سـواری و دەروون مشـتی داخ و کەسـەر و بـە بـەرۆک هەڵتەکانـی دەغـەزەوە بـەرەو ئاسـمان و گوتـی:
- ئـۆ.. هـ بـۆ خاتـری سـەت و بیسـت و چـوار هـەزار پێغەمبـەری نـازدار، بـاری تەعـالا سـەبەبکارمان بگرێـت و خێروخۆشـی لـە خۆیـان و منداڵیـان نەبینـن و لـەوێ دنیایێـش لەگـەڵ شـەیتان و فەرعـەون و نەمـروودو ئەبوولەهـب حیسـابیان بکرێـت وەکـی ختوخـۆڕا نامووسـی

خەڵکی دەیان گوندییان دادەست وەلەکان و سووک و هاسان بە فەتارەتیان دان.

پێشتر مێشکی نەبەزی ئاودابوو:«

- ڕۆڵە نەکەیت لەلای عەبدی بێ شەریک بدرکێنیت:

لە دەمی ئەنفال قوتار بوومە: ئەوکات بە نوێژی نیوەڕۆ بەعس زندە بە چاڵت دەکات.

هەرکە کارەساتەکەیان لێدەپرسی لەمەی زیاتر نەدەگوت:

- من نازانم پێش ئەنفالەکە چوومە ماڵی پوورم سارا لە شاری کەرکووک».

- ئەمەش ڕێ و شوێنی داپیری بوو.

بەم وتەیە دڵی داخورپا و مەرامی زانین بەرینەداو گوتی:

- خوچە بێجگە لە ڕژێم کەسی دیکە هەبوون ڕووی خۆیان بەو ئەنفالە نەگریس و نامۆیە ڕەش کردووبێت؟.

دیسان بە چاوێکی مۆڵەقەوە دەتگوت: تووشی نەخۆشی «ڤێ» بووەو سەیری کردو جا گوتی:

- تاهو. تاهو. لەبێ خەبەران کەشکەک سەڵاوات. ئەگەر جاشە داغمەدارە خائینەکان نەبووان ئێمە خەڵکی ناوچەکە لێکرا حەیامێک بوو، پێش دەرکەوتنی هێزی ئەنفال خۆمان بە ماڵ و حاڵەوە قوتار کردبوو.

لەبەر ئەوە جلەوی زەینی بەلایەکی تر وەرگەڕا بە هەندی هەڵنەگرت و.. وەک دڵدانەوە:

- خوچە جاش چەکی خیانەتیان لەشانە و هەرچی بکەن حەرەجیان لە ڕووانگەی هەستی نیشتمانییەوە لێناگیرێت.

بۆ ئەوەی لە دڵیدا سەقامگیر ببێت و گوتی:

- هەر ئەوان نینە وا چەند ساڵە. بۆ. وێران و سووتانی گوندەکانی باب و باپیرانیانەوە پێشڕەوی هێزی دوژمنن. کە گوتراش جاش دەبڕێتەوە.
گورجی هەرکە زانی لە قسەکانی حاڵی نەبووە، بە پێویستی سەرشانی خۆی زانی لە ڕاز و نیازی سەردارەکەی تەواو حاڵی بکات:«
- ئافرەت هەتا بۆت دەگونجێت پرتۆخی جاشە داغمەدارەکان هەڵماڵە».
ڕووی زاری تێکردو گوتی:
- من مەبەستم لە جاشە داغمەدارەکان: پێشفیتنەکانە. ئەو زۆڵ و ستەمکارانەیە، کە تا ئەمڕۆ حازی بەرگی پێشمەرگایەتیمان بەسەریاندا هەڵکێشابوو. نەک جاشە سادەکان لەگەڵ ئەو هەموو خیانەتەیان ئەوجا لە ڕاست ئێمەدا قوندەرەکەیان، لە ئەوان پیاوتربوو.
دڵی پێداخورپا و باوەڕی هات و بۆشی بووە پیازی سپیکراو، حەمەڕەحیمی دۆستی بە هەوەنتە ئەو ناوە قۆڕانەی هەڵنەبەستاون.
- «کەریم ئەوانە حەقی میللەتیان دۆڕاند و هەتاکو چاویان زندوو بێت بەتەمای هیچ مەبە».
دڵی بەرەوستی خۆ گنخاندنی لەمبارەیەوە نەداو تاکو زەریف لە بنەوانی بگات ڕووی قسەی تێکرد و گوتی:
- برای خۆت حاڵی ناکەیت؟.
ئەویش بە وردی لە سیری هەتاپیازی لە چنگ نا.
خێزانەکە گشت تا ماوەیەکی زۆر، بە شلەژان و حەپەسانەوە لەسەروسەکوتی یەکتریان ڕوانی و خەفەت لە هەناوەوە گینگلەی پێدان. پێشتر باوەڕیان بە گوتەی سەرپێیی ئەملاو ئەولا نەبوو:«

- پێشمەرگە و ئەو تاوانە موستەحیلە!» کەچی لەیەکێکی باوەڕپێکراوی نێوکارەساتەکە بیست پەردەی دوودڵی دڕاو باوەڕی بە یەکجاری فڕی. میللەت لە دارەتی دنیادا هەر ئەو چەکدارەیانەیان شک دەبرد. دواڕۆژ، بۆ دەربازبوونیان لەژێر چەپۆکی کوشندەی زۆردارو داگیرکەرانەوە خشتێک لە سەر خشتێک دانێن، ئەوانیش وا لە بەختان بوونەتە گورگی بێ ئامانەوە.
کەریمە کۆر دەمێکی زۆر تاسان بەرینەداو لە بەراییدا مەزەندەی وایدا بووە بەرێ:«
- حەمەڕەحیم ڕەنگە خۆشیانی نەوێت و دەیەوێت ئابڕوویان لای خەڵک و خوا بە با بدات» بەڵام دڵی بە قسەکانی گورجی پاراو بوو. لە حەیفان بە چەپەلۆکان وەرگەڕا سەروپۆتەلاکی خۆی و لە دەروونەوە کوڵا. ئەمما کوڵان:«
- بەڕاستی پاداشتی ئەو خەڵکە نەدارەتان داوە!. چەند ساڵ و حەیام بووبوونە پێخۆستتان و گەورە و بچووکیان دەست لەسەر سینگ بێکرێ و پاداشت لە خزمەتتان دابوون».
دەرگای حەقیقەتی تەواو بۆ کەوتە سەر گازەرەی پشت: ئەو ناوانەی حەمەڕەحیم پڕ بە پێستن:«
- جاشە سادەکان جاشی یەک دوژمنن و بەس. چ ناوی دیکەیان لە دوا نییە. کەچی ئەوانە جگە لە ئەوەی جاشی ئەم دیو و ئەو دیون ئەوجا داغمەی کوردایەتییان بە پشت ملیانەوە لکاندووە».
خێزانەکە جار لە جار هەستیان سڕکتر. ڕادەگرت، ئەویش بۆ ئەوەی پاشەڵی تەڕی داغمەدارەکان لای خەڵک و خوا هەڵماڵێت خوایشتی وابوو، بێ داوا و پێگوتن ناوەناوە زمان لەکارەساتەکە وەربدات.
- بە برای خۆم بڵێم هەرکە ئەنفال کراین و دڵی داغمەدارەکان داکەوت

و بە سۆزی ئارەزووەوە گەڕانەوە سەر ئاخورە دێرینەکەیانەوە، ئێمەیان بردە شاری کەرکووک. لەپێش نیوەڕۆ هەتا بەترەکی شەو بەسەرچوو بێزاد و ئاو لەناو زیلان راگیراین. بەهیچ نەوعێک نەدەوێراین، بە تی چاویش لە دەرەوە بڕوانین شەو درەنگانێ، بازاڕ چۆل و هۆل لە شاریان زۆر دوور خستینەوە و لە سارایەکی چوار دەورە سیم و ئاسمانیش پێخەف.هەڵیانڕشتین شەو و ڕۆژ لە یەک سەموونی سارد و ئاوی گەرم چیتریان نەدەداینێ. منداڵی ساوا بەرگەیان نەگرت و زۆربەیان گیانیان لەدەستدا و بێ شوشتن و کفن لە قورتێکمان دەشاردەوە.

ئەوانەی ماشبوون بە قوربانی مردن بووبوون.

خەڵکی نزیک سیمەکە، لە دواییدا زانیمان «دوبز» ینە مەردانە گوێیان بەترس و هەڕشەی بەعسی کەلبە تیژ نەدەدا و مەیتەکانیان لێوەردەگرتین و ڕۆژانە نان و خواردن و کەل وپەلی پێویستیان زێدە بۆ دەهێنان گوراحمان بەهۆی ئەوانەوە تەواو هاتەوەبەر و مردنیش کەم.

* * *

سبیانەیەکی زوو پێش ڕۆژهەڵات، سوپای بەعس هەرچی نێرومێ و منداڵ و جاحێڵ بوو بە زیڕ و هۆڕو گریانی بە حوجەتەوە لەنێو زیلانیان دەپەستان.

هەرکە گوترا عەرەب و ئەنفال دەبڕێتەوەو بە زەیی و هەستی مرۆڤایەتی لەکاتی فەرهوودکردندا لە دڵیاندا شک نابردرێن.

ئەوەی لە دیار بووایە زەندیق و فەرمەسۆنیش بووایە خۆی پێنەدەگیرا و لە شروان لەهۆڕژنی گریانیدەدا. تەنیا کەسانی عەرەب نەبن.

ئافرەتـەکان هێندێکیـان لەترسی ناموسیان لەخۆچوون و چواردەستە فڕێیاندانـە نێوزیلانـەوە.
عەسکەرەکان بە ئاشکرا و بێ پەردەی ئەخلاقەوە پێیاندەگوتن:
- مێیەکان دەکەینە کارکەر و جارییەی خۆمـان و نێرەکانیش نـاو مـاڵ و خزمەتچی.
مـلازم حوسـێنی سـەرکردەیان، ڕەشـتاڵەی مەیلـە و دێـزە لەخۆشـی ئەنفالـی کـوردان بیسـت و چـوار سـەعات بـزەی لێنەدەبـڕاو گوتـی:
- وەللا هەموویان زندە بە چاڵ دەکەین.
ئـەو ژن و کچانـەی زەینیـان لـە خۆمـا بـوو، لـە چەنـد لاوە بـە دەنگی حێلـەوە دەگریـان و دەیانگـوت:
- ویـ. یـ ی.
- ویـ یـ ی.
- وەیڕۆ.. لە خۆمان ڕۆ....
- وەیڕۆ.. لە خۆمان ماڵوێرانی ڕۆ....
- وەیڕۆ.. لەخۆمان قوڕبەسەرێ ڕۆ....
- وەیڕۆ.. ناموسمان ڕۆ....
- وەیڕۆ.. ئابڕوومان ڕۆ....
- وەیڕۆ.. شەرەفمان ڕۆ....
- وەیـڕۆ.. کەسمان نییـە بەرگری لـە شـەرەف و ناموس و کەرامەتمـان بکات.
- ئەوانە گورگی بیابانی داوێن تەڕ و بێئابڕوونە.
- ئەوانەعەرەبـی داوێـن پیسـی ئەنفالـن. لـە هـەر شـتێکی بۆنـی کـوردی لێوەبێت ناپەنگێنـەوە.
هێندێـک لـەو ئافرەتانـەی جەسـوور و بـە غیـرەت بـوون لەکاتـی

لێخوڕینیان بۆ ناو زیلان بە دەنگێکی بەرزەوە داوای بەهانا هاتنی کوڕە کوردی دەوروبەریان دەکرد:
- کوڕانی کورد غیرەتتان ببزوێت غیرەت.
- شێرانی کوردستان لەم ساتە حەرەجەدا جەسارەت بنوێنن و بە هانامان وەرن.
- بەهانای ناموسمان وەرن.
- بەهانای شەرەفمان وەرن.
- بەهانای ئاوەڵکراسمان وەرن. کەوا کەوتووەتە دەست وەلەکی چاو برسی و دڵسۆزی سەرگرتنی ئەنفالەوە.
گورجی قاروخەفەت گینگڵەیان پێدەدا و بەخۆی نەوەستا و پڕ بە زار هاواری کرد و گوتی:
- ئەوەیە بەرهەمی خەباتی گۆردایەتی شای ئێران.
- ئەوەیە بەرهەمی خەباتی گۆردایەتی عەرەبی ئەبوو کیمیا و ئەنفال و زندە بەچاڵ.
- ئەوەیە بەرهەمی خەباتی گۆردایەتی ڕیش چەرمووانی ڕۆژهەڵات.
- ئەوەیە بەرهەمی گۆردایەتی فیسداری دڵڕەش و داگیرکەری کوردستان.
عوتە و قوتە دوو برای بە کێل دەچووێندران.
عوتە= «عوسمان» و قوتە «حوسێن» بوو.
خەڵک بەعوتە و حوسە بانگیان دەکردن. ئەوانیش هێندە جار لێیان تێکدەچوو. وبۆیە بە خوایشتی هەردووکیان بە خەڵکیان ڕاگەیاند لەمەودوا بە:
«عوتە» و»قوتە» بانگیان بکەن.
هەرکە داوای ئافرەتەکانیان لە گوێ زرینگاوە، لە قاران بە چاوی

سوور و غەزەبەوە لە یەکتریان ڕووانی یەکیان بەئەوی تری گوتی:
- مردن مردنە تۆ خوا لینگ وەشاندمان لەچی.
- خۆ ئێمەش وەک جاشە سادەو داغمەدارەکان ناکەین بەس نەفسی خۆمان بووێت و میللەت بە قوربانی مانی خۆمان بکەین.
ئەمەیان گوت و بە هەردووکیان لەسەربازێکی کلاشینکۆف لەشان ڕووبوون و چەکەکەیان لێساند و کوشتیان و سەربازێکی تەکی ویستی دەست بووەشێنێت کوشتیان و چەکەکەیان هەڵگرتەوەو لەگەڵ ڕشاندنی عەسکەرەکان هاواریان دەکرد:
- بژی کوردایەتی.
- بژی پێشمەرگایەتی.
- بژی مەردایەتی.
- بمرێ خەباتی جاشایەتی.
- بمرێ گۆردایەتی داگیرکەران.
- بمرێ جاشی ڕیشداران.
- بمرێ جاشی عەگال بەسەران.
- بمرێ جاشی فێسداران.
- بمرێ چەواشە شۆڕش.
- بمرێ خوێنرێژی کوردان.
نزیکەی بیست سەربازیان پەلەواژوکردنەوە ئەوجا نۆرەی خۆشیان هات.
خەڵککە لەترسا پەلەقاژەیان بەملاو بەولادا کرد.
گورجی هەرکە چاوی بەو داستانەمەزنە کەوت هورووژمی مەردایەتی پاڵەپەستۆیدا و بە خۆی نەوەستا و تخی لە ترس و گیانی خۆی کرد و پڕ بە دەنگییەوە تێیهەڵکرد و:

- ئەوەیە کوردایەتی!.
- ئەوەیە مەردایەتی!.
- ئەوەیە جەسارەت!.
- ئەوەیە پێشمەرگایەتی.
- بێ ئەوەی«.......» بخەنە سەر«.......» داگیرکەران کوردایەتییان ئەنجامدا.
- ئاڵای مەزنایەتییان شەکاندەوە.
- بژی ڕۆڵەی قارەمان و بە جەرگی کورد و کوردستان.
- عوتە و قوتەی هەمیشە زیندوو.
- بژی پێشمەرگەی ڕاستەقینەی کورد و کوردستان عوتە و قوتەی ئازیزمان.

* * *

خێزانەکە بیبلتوون پێ شپرزان و خەفەتخان و چاشمیش بوون و کەم و زۆر خۆیان لە قەرەی هۆیەکە نەدەدا. هەتا بەقەدەر توانا بەرپەرچی بدەنەوە. وایاندا بەرمەزەندە:«
- ڕەنگە بەو شەوە تاریکە لە ڕێگادا زێلکی ڕژابێت، لە گینە منداڵێکی حەوت ساڵی و بەتاقی تەنیا و لە چۆلەوانی و غەریباتیدا ناحەقیان نەدەگرت.
زەینیان بۆ چیدی هەتەری نەدەکرد. ئەمەش متمانەی ڕاستەقینەی بەخۆ..وە نەدەگرت و دڵیان ئاوی پێنەدەخواردەوە. ئەگەرنا لە ڕێگاش ئاوقای دەبوو، یاخۆ تەنیایی نەترەی ڕووخاندبێت ئەوسا لینگی ڕۆیینی لەبەروە نەدەما.
گریانێکی بێ بێندان و زۆر بە کوڵ و قیژداری وا دەگەیشتە کەشکەلانی حەواوەو چاویش مۆڵەق وەستاو لەش چرک و هۆ ڕ لەرزینی وا

زەین دەبردرا جەستەی لەهەلاوە بە سیکارد کوزکوز دەکرێت، یاخۆ مێشکی دەشڵەقێت.
پێشتر بێهەست و خوست، بە حەپەی سەگانەوە، بەپیریەوە چوون و لە نێوان سەگەکان لەسەر چینچکان خۆی گرمۆڵە دابوو، گورج، بێ خۆ گورگە هەڵخستن قیت بووەوە و ئاسایی یانە وەگەڵیان کەوت.
وازەن دەبردرا یەکێکە لەخۆیان.
بیریان بۆ هەرلایەک بڕی بکردبووایە سەرچیغ دەچوو. عاجبتیان ماو هەرچەند سەری تەکبیریان دەهێناو دەبرد هەرگیز نەدەگەیشتە پاراوییەوە و: «هۆی ئەو گریانە بە حوجەتەی چییەو چۆنە خوایە و بە چ ڕێگایەک بەرۆکی بەردەدات».
هەرسانییەک گریانەکە خێزانەکەی پتر دەشلەژاند. هەرکە قاچەکانی لە ژێر دەوارە پێنج تەختە مووتاو و چوار ئەستوندە و بە حەسیری ڕەنگاوڕەنگ پەرژین کرا و شەتەکی بەرچیغەوە سەنگرایەوە و کەوتە بەر ڕووناکی چرا و سەرنجی سەرو سوکوتیاندا و:«
- کوڕێکی پارچەلە و تەبەش پان و سوورو سپی و دیدەگەورە و مەڕانی و برۆکەوانی و لووت بەرانی و خوێن زۆر شیرین و گەلێک لە خوێان جوانتر، کەل وپەلی بەری و سەرتاپای جەستەی تۆزاوی و دەتگوت لە خۆڵە پۆک وەردراوەو بەد مە و چاو و برۆ..و برژانگیشییەوە دەبیندرا، تەنیا کونی دیدەکانی نەبێت، دەلحاز زرووکەی تێوەستا. چ زرووکەیەک مەگەر هەر خوا بزانێت. ئەندامانی جەستەی لێکڕا چرک و هۆڕیان پێکەوت.
پیاوێکی کەڵەگەت و تێکچەقی و ڕەشتاڵە و ڕیش و ماش و برنج زۆر زگی پێسووتا. بۆ ئەوەی تۆزێک هێور بێتەوە، بە پەرۆشەوە ئاوێزانی بوو... و:«

– مەگری ڕۆڵە بە قوربان». ئەوسا وەک دەرزی لەسەرتاپای جەستەی بئاخزندرێت خراتر بوو.
– عەواد سلەمیەوە و ناچار هەر زوو بە شلەژانەوە دایناوەو دوو سێ هەنگاو بلەز لێیدوور کەوتەوە گوتی:
– خۆ چ کوفرم نەکرد!.
لەناخەوە پرتاندی و :«
– ئـ.هـ دیارە شێتە شێت».
– هەردوو کوڕە گەورەکانی بەنۆرە ئامێزیان بۆ گرتەوە.
هەمان تاس و حەمام بوو.
«ئەموونە»ی کابانی ماڵ وکورتەخنەو هێسک پتەو. و ئەستوور وچاو ڕەش و گەش و سەرچەناگەی بە ئەندازەی قلە نۆکێک تۆزێک زلتر کوترابوو..و خێتێکی کوتران لە ژێر ناوەڕاستی لێوییەوە بوو. سەرەکەی تری گەیشتبووە کوترانە خڕەکە وەو چەشنی نەخشی لێهاتبوو و ڕووەڕەش ئەسمەرە بە شووشەکەی قەشەنگتر هەڵخستبوو، بە بەرۆکی خۆیەوەی قرمساند و لچکە لەچەکە خەزنە تەنکە ڕەشەکەی بە دەم و چاوی دادا و دەلحاز ژێر بووەوە، کە ئاواتی هەرە گەورەی خێزانەکە بوو، کەیفسازی دایگرتن. تەنیا دەنگی نزگرەی دەهات.
دوای ئەوە زانیان بە چی کڕ دەبێتەوە و «ڕیشە»ی قەیرە کچی ماڵەوە ڕووی لە ئەموونە کرد و گوتی:
– دایە بیدە من.
– ئامێزی تێوەراند و چەفتەیەکەی لە مل کردەوەو ڕووی پێداپۆشت و بە ئامەشۆ کردن دەیهەژاند.
– خوشکی دووەم «جەدعە» تازە هەڵدەهات و لێیوەرگرت و هەژاندی و نزگەرەکەشی پەڕی.

دووبارە شادی بەسەر خێزانەکەداهات.
لایان عاجباتییەکی نامۆ بوو..وبە جارێک حەپەسان و گوتیان:
- ڕەنگە عەقڵی تێکچووبێت.
- لە گینە ئەگەرنا خۆ لە وڵاتێکی بێ پیاو پەروەردە نەبووە.
بۆ ئەوەی چارەی بکرێت:
- ئێوە بڕۆنە دەرەوە و دەمێک بەرچاوی چۆل کەن.
بیریان بۆ شتێکی تر بڕی نەدەکرد. کەچی بۆ ئەەی لەرزووکە بووەستێت خواستەکەیان بەجێگەیاند.
ڕیشە دوای وەرگرتنەوەی فەرمانی بە پیاوەکاندا.
چاوی بەملاوبەولادا تەرحی چاوەڕوانی شتێک بکات شێتانە دەگێڕا.
«سەلال»ی کوڕە گەورە کت و مت باوکی بوو..و دەستنوێژی شۆری و بە ئەنقەست هاتەژوورەوە و هەست و خوستی لێوەنەهات و هەرکە بۆی ڕووانی.
خێزانەکە ئەوسا شاگەشکە بوون.
لەسەر دوو گوردە ڕەش و سپییەکە کەشکۆڵییەکە وەستا نوێژی خەوتنان بکات. عەگالەکەی بە دەستەکەی ئەولا بوو..و لەسەرینا و هەرکە دەستی لێبەربوو..و دەلحاز لەهوروژمی گریانیداوە.
«ڕیشە» دەرچووی «خانەی مامۆستایان» بوو. و چەند ساڵ خزمەتی هەبوو، بە هۆیەکەی حسیا و بۆی واژی بووەوە لە «عەگال» دەترسێت، ئەمەشی لا عاجباتییەکەی تر بوو. بە براکەی گوت:
- برام عەگالەکەت بشارەوە.
کڕبووەە هەرکە داواکەی بە جێگەیاندرا.
ئەو سادایەوە دەستی جەدعە و چووە دەرەوە و بە باوک و براکەی گوت:

- بەبێ عەگال وەرنەژوورەوە.
کورە زەق زەق سەیری دەکردن و چرچەی لەبەروەنەهات. ئەوسا هۆیەکەیان بۆ بوو بە پیفۆکی سپیکراو تەنیا لەکەسانی سەر بەعەگال دەترسێت.
بەمەش حەپەسان و نەیاندەزانی هۆیەکەی چییە:
- عەگال پەتێکە لەخرێنەموو درووست کراوە و خۆ چ درندەی بنیادەم خۆرنییە تاکو زەندەقی لێ بچێت.
کەچی ریشە کەمێک بیرتیژ بوو..و بەروویان هەڵشاخا و گوتی:
- بە بۆچوونی من عەرەبی عەگال بەسەر زۆریان ئازار دابێت، یان کارەساتیان تووش کردبێت.
هەرکە هۆی گریانەکەیان بۆ روون بووەوە تەواو هێور بووەوە و ئاویان بۆ هێنا و زۆری خواردەوە. کەچی کە نانیان لە پێش دانا تەرحی برسی ساڵی گرانی بە پەرۆش و هەردوو دەستان پارووی لەنێو دەم دەنا. چل و هەشت (٤٨) سەعات بوو تفەرکی زادی نەکردبوو.
تۆزەکەیان لە بەدەن داوەشاند و دەم و چاویان شۆری. پێشتر خوێنی سەرشانیان دیبوو، کەچی لەبەر گریانەکە لە یادیان پەری، تەواو داسەکناوەو بە چاوی ئاسایی یەوە سەیری دەکردن.
شمەکەکانیان لەبەر داکەند و شانی چەپەی بە گوللە زامدار بوو بوو..و هەرچوونێک بوو هەتا خوێنەکەی بووەستێت ریشە بە پەرۆی پێچا.
عەلاوی کورە گچکە بارتەقای دوازدەساڵی کردبوو..وچاو خێڵ و ددان و شاش و. واش چوێر، لە ژیاندا هێندەی لە گوریس نەنابوو، بەرینی و درێژی خۆی لە یەکتر هاوێر نەدەکردن بەرووی باوکییەوەی هەڵشاخا و گوتی:

- باوە ئەو منداڵە بەو شەوە لێرە چ دەکات؟.
بەشلەژانەوە ڕووی لە هەمووان کرد و گوتی:
- ڕۆڵەکانم نەکەن بە هیچ شێوەیەک لای کەس ناوی ئەو منداڵە بهێنن، گەر گوتیان ئەو زارۆکە چییە لاتان؟.
بڵێن: - منداڵی خزمێکمانە.
ئەوسا ڕووی لە عەلاوی کرد، بۆ ئەوەی بترسێت و لای عەبدی بێ شەرێک نەدرکێنێت، کە لێیدەترسا، پەنجەی شادە نوێژەی گێرد ئاسا دوو سێ جار بە قرتقرتۆکی خۆی خشاند و گوتی:
- ئەگەر حکومەت بزانێت ئاوا سەری هەموومان دەبڕێت.
لە ئەوانی تر ئەمین بوو. و گوتی:
- ڕۆڵە ئەوە یەکێکە لە منداڵانی میللەتی کورد هێندێک لە پیاوەکانیان دژی حکومەت وەستاون. حکومەتیش لەبەر ئەوە شوێنەکانیان کێو..و هەڵەتی زۆر سەخت و هەڵدێرە بەروەستیان نایەت و لە تۆڵەدا ژن و منداڵی گشتیانی بە زیلان هێناونەتە ئێرەو هەمووانی بە گوللە کوشتوونە و ژێر خۆڵی خستوونە.
- حەکو. هەموویانی بە گوللە کوشتوونە!؟.
- بەڵێ.
- کافرستانییە!.
بە دەنگی نزمەوە گوتی:
- کە گوترا: بەعس دەبڕێتەوە.
بەلای گفتە سەرەکییەکە هۆیداوە و گوتی:
- وا دیارە ئەو تفارۆکەش خوا ئەجەلی نەهێناوە و گوللەکە کاریگەر نەبووە و لە ژێر خۆڵی داپۆشتنی مردنی ئەنفالیشدا دەرباز بووە.
چاڵەکانی دوو ڕۆژ پێشتری دیبوون:- یەکجار زۆر بوون و درێژیان

نزیکە ((٢٠)) مەتر و بەرینی مەتر و قووڵیش سێ. نەیدەزانی بۆ چینە و بە حەپەسانەوە وێکەوت و پێیانگوت:«
- گۆڕە ئەنفالن و بۆ زندە بە چاڵکردنی کوردە یاخییەکانە».
«ناسر»ی کوڕە ناوەندی لە دایکی دەچوو. و گوتی:
- بڵێ ئەو تەقە زۆرانەی ئەمشەو بۆ کوشتنی ئەوان بوونە؟.
سەلال وەریگرتەوە و گوتی:
- بەڵێ.
- ئەوا پیاوەکانیان تاوانبارن ئەو قوڕ بەسەرانە لەبەرچی؟.
باوکە ناچار وەلامیداوە و گوتی:
- ڕۆڵە ئەوە سوخەتی ئەو حکومەتەیە گریمان یەکێک لە بنەماڵەیەک لێیزیت بێتەوە و قارەمەندی بنەماڵەکەی تەفروتوونا دەکات.
بۆ ئەوەی لە ڕادەبەدەر بترسێن ولای عەبدی بێ شەریک ناوی منداڵەکە نەدەرێنن گوتی:
- دڵنیابن ئەگەر حکومەت بزانێت ئێمە ئەو زارۆکەمان چەپاڵەداوە بە بیست و چوار سەعات وەک کوردان خاکمان لە توورەگە دەکات.
هەرکە خەوی لێکەوت خێزانەکە بیلبتوون تەرحی دڵ پێسووتان لە دەورەی مۆڵ بوون:
- ئەو منداڵە بەستەزمانە تووشی چ کارەساتێک بووە خوایە!.
دڵنیاشبوون دایک و باوک و کەس وکاری بەر حەملەکە کەوتوونە و کەسی نەماوە.
بەمە زیاتر بەزەیی یان بزوا و پێداخدار بوون و بڕیاریاندا هەتا دوا هەناسە لە خزمەتی نەسرێنەوە.
ناوە ناوە جەستەی لەخەودا ڕادەجڤری و هەڵبەز و دابەزی دەکرد.

**ئەنفالی دووەمی گچکە:**

«دەڤەرەکـە نەخاسـمە بـەری باشـووری شـاری هەولێـر ماوەیـەک بەهـۆی هێرشـی توندوتیـژ و سـامناک و نـاڕەوای:«
- پێتدەوەسـتم ڕاناوەسـتم» سـوپا و عەشـیرەتە عەرەبەکانـی سـەر سـنوور بـە تاندانـی:
- سەر بۆ ئێمە و ماڵ بۆ ئێوە،
هێمنـی و ئارامـی فڕیبوون. هەراوهۆریـا و ئـاژاوە و تـرس و بەسـەردا دان و هـەڵاتـن و دڵەڕاوکێی بیسـت و چـوار سـەعات بەرقـەرار بـوون.
ناوە ناوە لە هەللایەکی وادەدرا سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە:((
- ئەها. عەرەب هاتن، عەرەب هاتن».
هـەر بابـا بـوو زەخیـرە و دانەوێڵـەی لەنێو چـاڵ و قۆرتانـی نێـو ئاقـار حەشـاردەدان و ئـاژەڵ و چارەوایـان بـەری خۆیـان ڕەوان دەکـردن.
خۆشـییان سـەلتەیی بـەس گیانیـان لەبەرایـی هەمـوو شـتێکە سـەلامەت بێـت ئاوایـی یەکانیـان چـۆل دەکـردن و بـەرەو باکـوور و خۆرهـەڵات هەیپەیـان لێدەکـرد.
ئەمـە چەنـد ڕۆژ بـەردەوام بـوو، هیچیش بـەدی نەدەکرا. ئیـدی خەڵکەکـە هێـدی هێـدی ترسـیان ڕەوییـەوە وباوەڕیـان هـات هەڵبەسـتراوە. کـە دڵنیـا بـوون چ لـە گۆڕێ نییـە دوو سێ کەڕەتیش بـە دەنگـی هاوارەکـە نەسلەمینەوە.
تاکـو ڕۆژێـک غەنیمەکانیـان بـە لێشـاو هورووژمیـان هێنـاو ئاڤایـی دەڤەرەکـە نەمـا گەمـارۆی نـەدەن. زنـدە مـاڵ مـردەماڵیـان بـە گـەزۆ.. و مـازوو خەملانـد. ئاتاریـان لەسـەر پاتاریـان نەهێشـت.
هەرکـە گوتـرا «عـەرەب و فەرهـوود» دەبڕێتـەوە و هیـچ بنیادەمێـک خـۆی لـە قـەرە نـادات. ئەوجـا ئاگریـان بـە نسـیب خانـووەکان کـرد.

لە ئاوایی «م» دا حەشرەو واوەیلا و قالووبەڵایە زیڕ و هۆڕ و ڕۆ،
ڕۆی ژن و زارۆکان دەگەیشتە کەشکەلانی ئاسمانەوە:
- وەیرۆ.. بابەڕۆ....
- وەیڕۆ. برا ڕۆ....
- وەیرۆ. دایەڕۆ....
- وەیرۆ..لەخۆمان چارەڕەشێ ڕۆ....
- وەیرۆ. لەخۆمان ماڵوێرانی ڕۆ....
- وەیرۆ. لە خۆمان سەر بە هەشێ ڕۆ....
- هاوارە عەرەب چمان لێدەکەن!.
- هاوارە عەرەب پرکێشی نامووسمان دەکەن!.
- هاوارە عەرەب بۆ کێندەرمان دەبەن!.
لەکاتی سووتاندنی خانووان و بەرزبوونەوەی چڕە دووکەڵدا خەڵکەکەیان بیلبتوونی کۆکردنەوەو بەرەو زیلانی ئەنفال ڕاپێچ دەکران و زرووک و هۆڕەکەش هەر بەردەوام بوو.
«کەژاڵ»ی تەمەن ((١٥)) ساڵ و خوشکی «سروود» کەوتە بەر سێرەی چاوی عەرەبێکەوەو زۆر جوان و قەشەنگە، بێ پەردەی ئەدەبەوە دەستی لە دیارە عەشاماتەکەوە بە ڕوومەتیدا خشاند و گوتی:
- ئۆخەی چەند قشتە قشت!.
کچە تاسان بەسەریدا زاڵ بوو..وزۆر نەما لە خۆ بچێت و ئازای بەدەنی چرک و هۆڕ لەرزین.
سیروانی باوکی بەوپەڕی هەڵچوونەوە گوتی:
- کورە سەگی لە بابی سەگ قەت حەیاو شەرمت بەخۆ نییە، پڕی دەدەیتێ!.

ئەویش زۆر داوێن تەڕبوو، لە بریتی بەسەرخۆیدا بشکێتەوە و بە زەردەخەنەوە گوتی:
- ئەوە تازە بووەتە جارییەو حەلاڵمە هەرچی لێ بکەم.
لە قاران چاوی چووە پشتە سەری و بە دەست هەڵتەکانی غەزەبەوە گوتی:
- گووت خواردووە لەگەڵ ئەژدادیشت.
بەمە هاروهاج بوو. وپڕیدایە و بەعەگالان وەریگەڕایێ.
سیروان بەوەج و هێزتربوو..و لە ژێرەخۆینا و دایە بەر پێلەقان.
هاوڕێکانی لە ژێردەستیان دەرهێناولەگەڵ چەک دانە دەستی و هانیاندا و یەکسەر کوشتی.
سروود بە کوشتنی باوکی دەبوورێتەوە.
بەگیسی خێزانی هەرکە دیمەنەکەی دیت، بە دزی خڕکە بەردێکی هەڵگرتەوە و لە پشتە سەریدا و فەراقی حنتەی لەبەر بڕی.
جەماعەکە دایکە و کچەیان دابە ر ڕێژنەی گوللان. سروود هەننۆب لە خۆ دەچێت.
بە چەند دیمەنی دزێوتر هۆشی دەڕوات.جاری دوایی لە نێو زیلی عەسکەری چاوی هەڵدەهێنێتەوە.
«لینگی دایکیان بەرز کردەوە و دوای خلْخاڵ داکەلان زۆر بەریقەت و کەیفسازییەوە سەیری دامێنیان کرد. لە ئاست خوشکەکەی بەنۆرە و شیرتر بوون. هەر جاریش لە هیکەوە لە خەو ڕادەپەڕی و لە هەرلاوە ئارەقەی هەڵدەڕشت و هەتا دەنگی لەبەردابوو دەیگوت:»
- عەرەب هاتن، عەرەب هاتن..
ڕیشە زگی زۆر پێدەسووتا و ئاوی دایە دوو قومی خواردەوە و ئارەقەکەی تۆزێک نیشتەوەو ڕاکشاوە. هەتابەیانی چەند جاری

دیکەی ئاوقا بووەوە. شەوانی دیکەش تووشی دەبوو.
هەموویان لە وشەی یەکەم گەیشتن کەچی نەیاندەزانی «هاتن»
مانای چییە.
عەواد سێ چوار ساڵ لە دەڤەری ئەو سەربازی کرد بوو..و لە
زمانی باش دەگەیشت و تا حەدێکیش دەیتوانی لەگەڵی بە ڕەوانی
بدوێت:«عەرەب هاتن»ی بۆ ڕاڤە کردن.
بۆیان والابووەوە عەرەبی سەر بەعەگال سەراو دویان زۆرناوەو
ئازاریشیانداوە.
«چەند ساڵ پێشتر تەرحی ئەمڕۆی حازری لە گوێیان زرینگاوە و:
- عەرەبی موسڵ و دەڤەری و گەیارە و شەرقات و قەراج و حەویجە،
بە پاڵ پشتی سوپاوە بە ئەنفال کردنی ناوچەکە هەستاون.

* * *

**ئەنفالی یەکەم:**

سوپایەکی زۆر بە زیل و مودەڕەعە و جێبی عەسکەرییەوە، پێش ئەوەی مل لە ڕێگەی خۆر ئاوا و باشوور و خۆرهەڵاتی دەڤەرەکە بنێت، سەربازەکان لە نێو عەشیرەتە عەرەبەکان هاواریان دەکرد و:

- سەر بۆ ئێمە ماڵ بۆ ئێوە.

پەرێز پاگژی ناوچەی قەراجیان دابەرێ.

هەر ئاڤایی یەکی تووش دەبوون نێرەوزی لە حەڤدە و هەژدەساڵییەوە دەکوشتن، یان دەگرتن. قارەمەندی دەربەدەر و پەراگەندە.

سەربازەکان لەگەڵ کوشتنی هەر کوردێک ئاماژەیان بۆ عەشیرەتەکانی دواوەیان بە درووشمەکە دەکرد.

عەرەبەکان ئەوەی دەستی داری دەگرت تەرحی مێگەلە مەڕ بەسەر «خوێڕسک» وەربیێت. دوابەدوای سوپاکەوە، بەوپەڕی سۆز و شەوقەوە، نەخاسمە هەرکە درووشمەکەیان دووبارە و سێبارە دە ئاخزنییە پەردەی گوێچکانیانەوە دەست بە چەک و خوترە و مەترەق هەڵشەقاندن و هەڵپەرینی سێجرتیانەوە هەڵیاندەدایە و:«

- احنا العرب، اهل الغیره

نترد الکراد من هالدیەر.

- أحنا بدو.. وینەلعەدو.

- بێتنا، بێتنا. أخزنا بسلاح الابیض».

تالانکەر و پاتار خۆرەکان تەرحی پاشەڵی سوپاوە ڕێچکەیان بەستاو دەستیان بە ژێر هەرچی لە ئاوایی یەکاندابوو داهێنا و عەشتەبایان نەهێشت و خانووەکانیشیان کردنە خۆراکی ئاگر.

عەشاماتی هەردوولا، بە سۆزی تەماع و غەزای چەواشەی هەستی ئایین و نەتەوایەتییەوە لە کلکەی «حسێنی غازی» و «دارەبزمارە»وە بەرەو

ناوچەی کەندێناوە شۆڕبوونەوە. لە زارگەڵی بازاڕگەی دیوی خۆرهەڵاتەوە «چایەخانەی»ی «مام هەینی»ی تەمەن حەفتاساڵ لەبەرچاوی ژن و منداڵیەوە پەلەواژیان کردەوە. هەرچی لە گازینۆکەدابوو: «شەکر و چاو پیاڵەو کتری و تەباخ لەگەڵ کەل وپەلی ژووری ماڵەوە دەستیان بە بندا هێناو ئاگریشیان بە نسیب کردن».

سۆرێی خێزانی کە دیتی پیاوکەی کوژراو خانوو.. و سەروەتیان بۆ سونەتیش نەما هەر ئەودەم لەشروان بە زگیدا.

«سەردار هەینی» لەتەمەنی چواردەساڵیدا، بەڵام لەبەر ئەو کورتەخنە و بێ نموود بوو، بەگچکە دەخەملێنرا، هەرکەچاوی بە تەرمی دایک و باوک و سووتانی گازینۆ..و ماڵیان کەوت لەتاوان حایج ئاسا بێ ئەوەی هەست بکات لەڕەوەکە دابڕێت سوپاکە دەیکوژێت پڕتاو تێقوچاند. لە دێی «کەنداڵ» ڕەتبوو گەیشتە ئاوایی «چیغلوک» و هەر لەبای غار و دەست هەڵتەکاندا بە دەنگی بەرز و پشوو سوارییەوە بەرەو دێی دێمەکار دەیگوت: «عەرەب هاتن. عەرەب هاتن» دێمەکارییەکان گەمارۆیاندا و گوتیان:

- قولەمەیتەرەی مام هەینی تۆ لە زێدە عەشاماتی ئەو خەڵکە چیت بە تاقی تەنیا تێتقووچاندووە؟.

پشووسواری بێنێکی زۆر پێداو. واریقاتەکەی لە سیری هەتا پیازی بە وردی لە چنگ نان. نزیکەی حەفتا ماڵ دەبوو لێکرا بەخۆکەوتن و هەیپەیان بەرەو شارۆچکەی دیبەگە کرد. بە ماوەی سێ ڕۆژان سەرتاپای ناوچەی کەندێناوە فەرهوود کرا و عەشتەبایان نەهێشت.

زۆربەی گوندەکانیشیان سوتاند و تەنیا ئەو تاک و لۆکانەبەدەر هێندێک لە عەشیرەتە عەرەبەکان، بە فەرمانی سوپاکەوە بەیەکجاری نیشتەجێ کران.

* * *

**سەردار هەینی:**

ڕۆژێک بیستی: گوندی (ج) حکومەت بەردوومانی کردووە و خەڵکێکی زۆری کوشتووە و ماڵی خاڵی بە بتوونی بەرکەوتوونە و هەمووشیان نێژراون تەنیا خاڵی نەبێت.

دوای هەفتەیەک تەرمی خاڵی لە نێو جۆمێک دەدۆزنەوە و سەگێکی ڕەشیان دەبێت لە دیار تەرمەکە وەرکەوتووە.

لە دوای هەڵگرتنی جەنازەکە سەگەڕەش بێ سەرو شوێن بزر دەبێت.

ئەمە هانیدا بچێت زیارەتی قەبری ماڵە خاڵوانی بکات. لە ڕێگادا پێش ئەوەی بگاتە دێیەکە بەر سوپای ئەنفالی بەعسییان دەکەوێت.

* * *

ئیتر ئەو شەوەیان بەڕێکرد. بۆ بەیانی شتاقیان نەیاندەوێرا عەگال لەسەر بنێین. بە خولق خۆشی و کەیفسازی و دەم بە خەندەوە بۆیان دەڕوانی.

ڕیشە ویستی تەنیا بەخۆی چاودێری بکات.

کەچی زمانەکەی نەدەزانی.

باوکی بەڕوویێکی گەش و عوبابەوە زاری کردەوەو گوتی:

- ناوت چییە؟.

یەکسەر بێ شڵەژانەوە گوتی:

- ناوم سرروودە.

خێزانەکە دڵنیابوون لەمەودوا بەم ناوە بانگ بکرێت ڕیسەکەیان لێدەبێتە خوری.

دوو ساڵ لەمەوبەر کوڕێکیان ناو «حموود» کۆچ دەکات، بۆیە هەر زوو هەموویان ڕێککەوتن بەم ناوە بانگی بکەن.

باوکەکە گوتی:

- حموود چۆنیت؟.

وەڵامی نەداوە.

دووبارە بە پەنجە ئاماژەی بۆ کرد و گوتی:

- حموود چۆنیت؟.

ئەوسا زانی لەگەڵ ئەویتی و گوتی:

- من ناوم سروودە سروود.

بە مەیلەو پێکەنینەوە گوتی:

- ئاخر ئێمەی عەرەب بە سروود دەڵێین (حموود).

ئەمە سکوتی پێکرد و هەنئۆب گوتی:

- حموود کوویت؟.

بە هێدیەوە گوتی:

- باشم.

عەواد بەیانی زوو بەم تەرزە حاڵی کرد و گوتی:

- ڕۆڵە ئێمە ئەو عەرەبە عەگال لەسەرانە نینە ئەزیەتی خەڵک بدەین. عەگالی ئێمە عەگالی بنیادەمانە، نەک عەگالی دڕندە و بکوژ و خوێنڕێژ و تالآن کەڕان.

چەند جار دووبارەی کردەوە. هەتا لە دڵیدا سەقامگیربوو. بەردەوام بوو. ئەوجا لەبەرچاوییەوە عەگالەکەی لەسەرناوە و گوتی:

- دە تەماشاکە ئەوە عەگالی بنیادەمانە و لە ئەزیەتدان دوورە.

لەو ڕۆژەوە لە عەگال بەسەران نەدەسلەمییەوە. بەهۆی خولق خۆشی و کەیفسازیی گوزەرانی خێزانەکە لە ئاستیدا ناوە ناوە لە خەو ڕاپەڕینەکەی کەم دەبووەوە و لە ئەنجامدا بە یەکجاری بەرۆکی بەردا.

دوای ڕۆژوبان کەوتندا لە ترسی حکومەتەوە نەیانوێرا بیبەنە شاری سەماوەو لێیان نزیک بوو نیشانی پزیشکی بدەن.
ئەوەندەی لە ڕژێمی بەعس دەترسان گریمان ئەوەندە لە یەزدان بترسابوونە، بە پێڵاوەوە دەچوونە بەهەشت.
سەلال ڕووی لەباوکی کرد وگوتی:
- بابە من دەچم حوسێنی ئامۆزام دەهێنم.
ماڵیان لە سەماوە بوو. نەیسەلماند و بە دەغەزەوە گوتی:
- دەترسێم لەبەر ئەوە سەراو و دەراو نە دیتەیت و کەمێکیش دەم هەراشیت سەرمان لە قوڕ ڕاکەیت.
دوای دەمێک دامان لەبەر خۆیەوە گوتی:
- بەخۆم دەچم و غەریبی «خەلەف»یش دەمێکە نەمدیوە دەکەم.
دەوام مابوو گەیشتە شار و نەیتوانی بچێتەلای برازاکەی موزەمیدی نەخۆشخانەیەکی سەر ڕێگای بوو چووە ماڵی براکەی و خەلەفی لەناوەڕاستی حەوشە دیت و بە هەلەداوانەوە بەپیریەوە هات و دوای ئامێز لە یەکتروەراندن لە هورژنی گریانیدا.
عەواد بەسەر سوڕمانەوە گوتی:
- برام پیمناڵێیت چی ڕوویداوە!؟.
بە گریانەوە دەستی گرت و بردییە ژوورەوە و سەیری کرد «کازم» ی کوڕە گچکەی لەنێوجێ و باڵنگاندا ڕاکشاوە و هەر ئەوەتە گیانی لەبەرماوە. دەتگوت: ڕەنگە ساڵێکە لە نێوجێ و باڵنگاندا کەوتووە و حوسێنیشی لە دیارە. لە حەیفان هەر ئەوەندەی لەگەڵ ماچ کردنی پێگوترا:
- ڕۆڵە ئەوە چ خێرتە !؟.
دوای گریانێکی زۆر گوتی:

- چیت لێبشارمەوە مامەگیان: دوێنێ ئێوارە........
پشوو سواری هەڵوێستەی پێکرد و:
- ڕێکخــراوی بەعــس هاتــن و گوتیــان....... یالــلا شــۆفەرەکەت بێنــەو.
وەرە دوامــان....... لەگــەڵ «مەتەرعیــدان»ی دراوســێمان....... شــۆفەری
هەبــوو، ئێمەیــان بــردە ســارایەکی چــۆل و....... هــۆل و چەندیــن چاڵــی
زۆر درێژ وقوڵ و بەرتەسک لێدرابوون....... ئێمە هەرگیز نەماندەزانی
بۆ چین.
- ڕۆڵە من دیومن یەکجار زۆرن.
- کاری زۆریــن. کاتێــک دیتمــان چەنــد زیــل و نێرینیــان....... هێنــا پــڕی
ژن و منــداڵ و پیــاوی کــورد بــوون....... ئەوســا حســیاین چاڵــەکان بــۆ
زنــدە بەچاڵکردنیانــن و....... ئێمــەی خــاوەن شــۆفەریش دەبــێ بیاننێژیــن.
گریان ماوەیەکی زۆر بەرۆکی گرتەوە و:
- مــن دەلحــاز پــێ شــلەژام و هەناوە.......کوتــەم پێکــەوت و ئەژنۆکانــم
لە تــاوان تــەق تــەق...... بە یەکتر دەکەوتــن و چاوەکانــم...... غەمراندیــان
وهێــزم لــە بــەدەن فــڕی.
گریانی تووشبووە و:
- نە خەسەلە هەرکە دیتم نێرینکیان هەڵڕشت.
دیسان گریان وەستاندی و:
- نزیکــەی چــل، پەنجــا کــەس دەبــوون...... بەعســییە چەکــدارەکان
هێنایانــەو ســەر لێــواری گــۆڕەکانــەوە...... هەرکــە بــە چاوانیــان دیــت
ئەوســا زانیــان...... بــۆ زنــدە بــە چاڵیانــە و لێکــرا...... منــداڵ و پیــاو و
ژن لەزرووکەیەکــی وایانــدا...... بــەو شــەوە دەگەیشــتە کەشــکەلانی
حــەواوە...... جوولەکــەش بیدیتبووایــە دەلحــاز لــە پرمــەی...... گریانــی
دەدا تەنیا بەعس نەبێت...... ئێمەیــان بــە جارێک لەناخــەوە شــپرزاند و

...... کاس و هێڕ بووین...... من لە ژێرەوە زۆرەزۆر بۆیان دەگریام...... زریک و هۆڕوهات و هاوار و......بڕاڕۆ. و دایەڕۆ. باوکەڕۆ...... بوونە هاژە و ژاوەژاو لە دورگوێیەکانم...... تەرحی جەرس دەزرینگانەوە...... چەشنی ڕۆژی حەشر هەر بابا بوو...... دەیویست ڕابکات و گیانی خۆی لە گەرووی مردنی موحەقەق دەرباز بکات. کەچی بەعسییەکان بەقۆنداخە تفەنگ و. سالدرمە و سەرە سمکان بەرەو چاڵەکانیان دەگێڕانەوە.......

گریانی بێنی پێداو:

- لە دڵم سەقادرا هەرچی بەعسییە هەستی بەزەیی...... بنیادەمی لە بەدەندا شک نابردرێت و. لە درندان سەت قات درندەترە...... ئەگەرنا زگی بە ئاستەم بەژن و زارۆکان دەسووتا...... زۆریان لەگەڵ هاوارەکانیاندا قسەیان دەکرد. کەچی من کەم و زۆر لێیان حاڵی نەدەبووم...... تەنیا ئەمانە، نەبن دەیان جار پەردەی گوێمیان سمی.......

- وەیڕۆ. وەیڕۆ........

- هاوارە هاوارە.......

- بابەڕۆ، دایەڕۆ، براڕۆ.......

- من لەسەر ئاخیر چاڵ بووم و مەتەر لەسەر چاڵی نزیکە من...... ناوە ناوە زێتر بەکارەساتەکە تێکدەچووم و...... جەستەم ڕەتی دەبرد. کەچی لە ترسی بەعسییەکان...... نە دەوێرام لە شوێنی خۆم بجووڵێم...... لەتەقەی تفەنگ و گرەی شۆفەر و زێڕ و هۆڕ و ...هات و هاوار لەو ساراقە فرایەدا...... چیدیکە نەدەبیسترا. حەشر و واوەیلا بوو..و...... بۆم ڕوون بووەوە عەرەب ئەو تەرزە درندانەی...... پەروەردە کردووە بۆیە خوای مەزن بەلاش نەیفەرمووە: «الاعراب

اشد کفرا و نفاقا»......

- سەردار هەینی لەکاتی دابەزینی لەنێو زیلەوە لەو ساتەدا هەتا کوژرا پڕ بە زار دەینەڕاند و:
- بمرێ بەرپرسە خائینەکان.
- بمرێ بەرپرسە بەکرێگیراوەکان.
- بمرێ جاشە داغمەدارەکان.
- بمرێ شۆڕشە چەواشەکەیان.
- تا گەیشتنە لای مەتەر و هەرکە...... چاڵەکەی بەردەمی تەژی تەرم کراو فرمانیان پێداو.......
- یاللا خۆڵیان بەسەرداکە.......
- نازانم مەتەر چۆن جەسارەتی بزاو بڵێت.......
- لێم ببوورن من هێزم لە بەدەن نەماوە، خۆڵیان پێدابکەم......
- بەوپەڕی هەڵچوونەوە بەسەریان قیژاند و گوتیان:
- چیــ..... یی!؟.
- لە دوو سێ لاوە بە دەنگی زۆر حیلەوە:
- پێت دەڵێین: خێراکە.......
بە نەرمیەوە گوتی:
- دەڵێم دەست و پێم شکاون و....... تکاتان لێدەکەم ناتوانم نا.......
- هەننۆب لە چەند لاوە........
- کوڕە بۆ خوات پێدەڵێین نەیکەیت دەتکوژین........
هەر ئەوەتە تێیگەیشتم و گوتی:........
- کوشتنم سەت قات لا شەریف و پیرۆزترە....... لە ئەنجامدانی ئەو تاوانە بێ مرەوەت و قەباحەتە........
- یەک دووانێکیان، بێ پەردەی سێ و دوو لێکردن. بە دەسرپێژێک

پەلەواژیان کردەوە و........
گریان سکوتی پێکرد و:
- هێشتا جوولەی لەبەروە مابوو تۆڕیان هەڵدا....... نێو چاڵەکەی بەردەمیەوەو گوتیان:
شۆفەرەکەشی ئیستیلایە......
گەیشتنە لای من و هەر بنیادەم بوو گەورە و بچووک، نێر و مێ.......
بە زیڕوهۆڕ و گریانی بە کولەوە...... دەیان هێنا سەر چاڵەکەی پێشم و بە گوللە دەیانکوشت و....... دەکەوتنە نێو گۆڕەکەوە........
گریان چەند سانییەک قورگی گرتەوە و:
- ئافرەتێک دوو منداڵی لە ئامێز بوو گوللەیان....... لە پشتە سەریاندا و منداڵەکان بە زیڕو گریانەوە...... لەگەڵ تەرمی دایکیان کەوتنە نێوقۆرتەکەوە و....... هەتا بە ژێرتەرمان کەوتن زیڕەیان هەردەهات........
- هەرکە چاڵەکە پڕ بوو گوتیان:
زۆر گریاوەو:
- یاللا دەی خۆڵیان پێداکە........
ئەوەندەی بە کوڵ گریان خێزانەکەی لێکرا بە گریان خست.
- کەم و زۆر تاسام نەکرد سستی بنوێنم...... سوڕ دەمزانی چەشنی مەتەر لەناوم دەبەن...... لە حەیفان ئاگام تەواو لەخۆم نەماو......
ناچار بەدڵە مەلەرزەوە هێدی هێدی بە ملی شکاوم....... قۆرگی بە گریان گیراوە و:
- خۆڵم بەسەردا دەکردن و لە ژێرەوەش وەک ساواری سەر سوپای بە قشپل دەکوڵیم و....... هەر خوا هاوارو خوا تۆبەم بوو. لەو تاوانە بێ مروەتانەم ببوورێت. ئاخیر قۆرت هێشتا پڕ لاشە نەبوو بوو......

دیتم منداڵێکیان تورِ هەڵدا ناو قۆرتەکەوە و....... بە گریان و دەست بڵندکردن هەستاوە، تاکو نەیکوژن گوللەیەکیان لێداو....... منیش لە حەژمەتان لاییتی شۆڤەرەکەم بۆ ئەوەی نەیبینم....... بەلایەکی تر گۆڕی. هەرکە ویستم خۆڵ بەئاخیری چاڵەکەدا بکەم نزیکەی نیومەتر مابوو لەتەرمان پڕ ببێت دیتم منداڵەکە لەسەر لینگانەو...... دەیەوێت لە چاڵەکەوە دەربچێت. منیش یەکسەر لاییتەکەم بە ئەنقەست کوژاندەوەو...... گرە گرێکی سێ چوار دەقیقەکەیم تاکو بزانن....... شۆفەرەکەم تەواو نییە قاییم پێیەخست. هەرکە دڵنیابووم.. منداڵەکە دەرباز بووە ئەوجا کارە کوفرەکەم....... بەناخێری گیانم تەواو ئەنجامدا.

پاش گریانێکی یەکجار زۆر گوتی:

دوای دەسبەربوون ئاگام هەر ئەوەتە لە خۆم مابوو....... کاری لەمێشک و دەروون و بیروباوەڕم کردو...... بە حاڵەحاڵ گەیشتمەوە ماڵ...... هەرچی ئازای لەشمە لێکرا دەتریوێنێت و ژان دەکات....... چ ژانێک مەگەر هەر خوا بزانێت....... دامناوە ئەوپەڕی چەند ڕۆژێکی دیکە بژیم.

مامەکەی بۆی والابووە و برازاکەی مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ و ویژدان و هەستی مرۆڤایەتییە و بە سۆزەوە دەستی لە مل وەراند و بەماچ کردن لەهۆڕژنی گریانیدا و پاشدان بە گوراح خۆشییەوە گوتی:

- ڕۆڵە مژدەیەکی زۆر خۆشی وات بدەمێ شاللا بۆت دەبێتە هۆی شیفای نەخۆشییەکەت.

ئەویش لەو ساتەدا بیری بۆ هیچ شتێک نەدەچوو..و شادی کەمێک ڕووی داگرت و عاجباتیانە بۆی ڕووانی.

- مژدە ڕۆڵە ئەو منداڵەی باست کرد ڕزگار بووەو وا لەماڵی ئێمەیە.

ڕەنگی دەلحاز لەکەیفان گەش هەڵگەڕا و تەزووی شادی و سەرفرازی بەنێو دەمارەکانی جەستەیدا مێروولەی کرد و پشووی لەگەڵ سوار بوو..و لە دوورەوە هەست پێدەکرا. بەو پەڕی گوراح خۆشییەوە پێخەفەکەی لەسەر خۆی لادا و بەجرەجر توانی دانیشێت و بە گوڕی سۆزەوە گوتی:

- تۆخوا بەڕاستیتە!؟.

- بەڵێ. شەو بە حەپەی سەگان چووینە دەرەوەو ئەویش ساڵدانە ساڵدانە وەگەڵمان کەوت. گوللەیەک شەپیلکی چەپی گرتووە.

ماوەی نەداو بەڕوویکی گەشەوە گوتی:

- ئۆخەی خوایە هەناومت فێنک کردەوەو....... دەریش کەوت ئەو تاوانە بێزەوەرو نارەوایە بەخوایشت و حەزی....... من نەبووەو بگرە بە زۆر بووە....... دەربازبوونی ئەو منداڵەش شاهیدە.

مامەکە هەڵیدایە و گوتی:

- ڕۆڵە تۆ لە کانگەی مەرگەوە یارمەتیت داوە خوای مەزن شاڵلا لە پاداشتیا شیفات بۆ دەنێریت.

بزەیەکی کەم خزا سەر لێوەکانی و گوتی:

- من بۆ ئەوە هاتوومە تاکو حوسێن ببەم منداڵەکەی تیمار بکات.

بەڕووگەشییەوە گوتی:

- واجبێکی دین و دنیایە چارەسەرکردنی...... دەبێ منداڵەکەش بێتە ئێرە.

- نا. نا ئێرە شارە و ئاشکرا دەبێت و سەری هەردوولامان لە قوڕ دەنێین.

سەلماندی و زاری بەڕووی براکەی کردەوە و گوتی:

- کاکە مەوەستە هەر ئێستا برۆ.

حوسێن گوتی:
- مامە تاکو کەس شک نەکات تۆ لێرەبەو من بە ناوی هێنانی ئامۆزاکانم بۆ لای کازم دەچم.
- برینەکە سەرچیغە و هەر گۆشتەکەیە و زوو ساڕێژ دەبێت.
بەهۆی تیمارکردنی حموود تۆزێک گریانێکی ئاسایی کرد.
حوسێن هەڵیدایە و:
- باجەدعە و عەلاوی بچنە بەر مێگەلەکە هەتا سەلال و ناسر دەگەڕێنەوە.
هێندە بابەتی تەداوی بەجێهێشت و ڕیشە شی فێر کرد چۆنی تیمار بکات.

* * *

عەلی عەبوود
دوای دەست بەربوون لە ناشتنەکە گریانی منداڵێک بیسترا. بەعسییەکان دیتیان منداڵێکی یەکساڵانەیە و وا لە باوەشی «عەلی عەبوود»ی «موقەدەم»ی سوپایی یە. بەهەڵچوونەوە لێیانسەند و نزیکەی مەترێک خۆڵی چاڵێکیان هەڵدڕی و بە زیرە زێڕەوەیان ناشت. بەغەزەبەوە بەڕووی هەڵشاخان و گوتیان:
- ئەو منداڵەت بۆ لا بوو!؟.
- دایکەکەی پێش ئەوەی گوللەی لێ بدرێت منداڵەکەی بۆ من تێهەڵدا و منیش زگم پێسووتاو قۆستمەوە.
- هەرکە ئەمەیان لێ بیست و گوتیان:
- وا دیارە تۆ بەزەییت بە کوردان دادێتەوە ئەمەش جۆرێکە لە خیانەت.
دوو سێیەکیان بە قۆنداخە کلاشینکۆفان لە کەللەی سەری دەدەن و

کار لـە مێشـکی دەکات و تێکدەچێت و هـەردەم بەبـاڵ فـش کردنـەوە تـەزری منداڵەکـەی بگرتـەوە ئـەم ئایەتـی دەخوێنـدەوە:
- «الاعراب اشد كافرا و نفاقا».

* * *

چەند ڕۆژێک دوای ئەنفالە شووم و بەدڕەوشتەکە کازم لـە حەژمـەت زنـدە بـە چاڵەکە بـە دڵێکی تـەژی ویژدانـەوە بەزگیدا.
«مـام عیـدان»ی باوکـی «مەتـەر»ی تایـەن لـە ترسـی هەڕەشـەی بەعسـەوە کـەم و زۆر تاسـای نەکـرد پرسـە دابنێت. هـەر سـێ ڕۆژ لـە بەیانییـەوە هەتـا ئێوارە شـان بەشـانی خەلەفـی دراوسـێی دانیشـت. بەمـە تۆزێـک گـڕی دەروونـی هێـور بـووەوە.

* * *

ئـەو پیروپەککەوتانـەی دوای ڕۆژەڕەشـەکە مابووینـەوە، بـە کارەسـاتە دڵتەزێنەکـە دەسـتمان بـە جارێـک لـە خۆمـان بـەرداو دوو شـەو و دوو ڕۆژ لـە بریتـی نـان و ئـاو خواردنـەوە دەگ گریـان و لەخـۆدان بـوو.
ژنـەکان شـینیان چەنـد جار دابەسـتا و پیاوەکانیش زۆرە زۆر دەگریـان و:
- وەیڕۆ. کچە نازدارەکانمان ڕۆ...
- وەیڕۆ. کیژە کەحێلەکانمان ڕۆ...
- وەیڕۆ. کچە داوێن پاکەکانمان ڕۆ...
- وەیڕۆ. شەرەف و ناموسمان ڕۆ...
- وەیڕۆ. کیژە هەتککراوەکامان ڕۆ...
حەمەڕەحیـم نەخۆشـییەکە. بەریدابـوو، زەینیشـی گەڕابـۆوەوە دۆخـی جـاران. تەنیـا شـنگی لـە بـدەن نەمابـوو. هەرکـە بـە چـاو دیتـی هـەر چـوار ئافرەتیـان کـە هـەردەم هەترەشـی لێچووبـوو...و بەهـاوار هـاوار

و زێرە زیرو ڕاکێش ڕاکێش بردن و:
- کوڕە بابە دەخیلە.
- مامە دەستم داوێنت.
- باپیرە لە ڕاهی خوا بە هانامان وەرە.
- کوڕە غیرەتتان ببزوێت لە دەست عەرەبمان قوتارکەن عەرەب.
- کوڕە بەرگری لەناموسی خۆتان بکەن ناموس».
سێ شەو و سێ ڕۆژ، بێ ئەوەی تفەڕکێ زاد بکات و خەو بچێتە چاوی گریان بەرینەداو کاروپیشەی هەر جوێندان بوو بە شێخ و هاوبیرەکانی:«
- ئێوە هەر لە ئیجادەوە سەرەتان بوون. دڕکی بەرپێی میللەتی کوردی بێ ئەنوا بوون و دۆستی دڵسۆزی داگیرکەران. هەتا لە ژیاندا ئێوە نان دوو لەت بکەن گەلی کورد ڕۆژی خۆشییان ئەمڕۆ دەبێت. لە کەسانێک کێوە بە دەستی ئەنقەست، تەنیا بۆ دامرکانەوەی............. چەند هەزار کەسی بێدەرەتانی نەتەوەی خۆیان، بێ بەزەیی یانە هاوێشتە بەر، بەرداشی ئەنفالی بێ ئامانەوە، هەرچییان پێ بگوترێت هەرکەمە».
پشوو سواری دەمێکی وەستاند و:
- ئـ هـ بۆ چ هاتین و لە سایەی شەوەڕەشی نوێ و شێخی چەمەرییەوە تووشمان بەتووشی چ بووە خوایە!؟.
لەگەڵ تف هەڵدانی قارەوە گوتی:
- تفـ .. ف لە خۆتان و هەڵوێست و بیروباوەڕتان.
- تفـ .. ف لەو کەسانەش کە بە ئاستەم مەیلی ئێوەی گۆردە و داغمەدار هەیە.
- تفـ .. ف لەو بیروباوەڕەی کە بەهۆی ئێوەوە هاتووەتە کایەوە.

دوای جوێنەکان لە تاوان و قاروخەفەت خواردنی زۆرەوە تێکچوو. لەو ساتەوە زاری بەستراو مرتە چییە بە ئاستەمیش لەبەرەوە نەدەهات. تەنیا قسەی لەگەڵ بکرابووایە دەگریا.
کاتێک کەریمە کوێر باسی جۆری مردن و ناشتنی حەمەڕەحیمی دۆستی لێ بیست لە هۆڕژنی گریانێکی حێلی وایدا دراوسێیەکانی پرتاو بەسەریاندا قژقژان و:
- سەت حەیف و مخابن بۆ تۆ کاکە گیان!. بەڕاستی ژیانێکی مەردانە و سەربەرزانەت بەسەر برد!.
«کەریم بڕواناکەم جارێکی تر بتبینمەوە گەردەنم ئازاد بکە..
- نا. نا. وا مەڵێ کاکە گیان. شاللا زوو بە یەکتر شاد دەبینەوە.
- ئەوەی دەڵێیت زۆر زەحمەتە.
- بۆ لەبەرچی!؟.
بە نەختێک سەرشۆڕکردن و دامانەوە گوتی:
- هەڵوێستم لەگەڵ هەڵوێستی ئەوانە ئاسمان و ڕێسمانە».
کەچی بەداخەوە ئەو حەرامزادانە، حیزانەیان بەفەتارەت دایت.
ماوەیەکی زۆر گریان بەرۆکی بەرنەدا و پاشدان بە نزگرەوە:«
- یاخوا هەزار ڕەحمەت لەگۆڕەکەت!. لەبەر ئەوە هەردەم لەسەر ڕێگەی ڕاست بوویت: ئەوەی ڕێگەی ڕاستی بەردا ئومێدی پاشەڕۆژی بڕا». هەنووکە دەزانم وا لە دوڕ بەهەشتی خوایت.
- ئەو ڕۆژە هەتا ماڵ نووستنان لە حەیفی دۆستە ئازیزەکەی جێی بەخۆی نەدەگرت و لەدەروونەوە بڵقی دەدا.
گڕی دەروونی لاپەڕەکەی پێوەرگیراو بە مەراقەوە گوتی:
- کاکە چ خەبەری زانای مەت نەبیستووە؟.
- ناوەللا.

بەهەشتاوییەوە:

- پێشمەرگەیە؟.

بە ئاخێکی درێژدادڕەوە گوتی:

- نەخێر. زۆری هەوڵدا بابی رازی نەبوو چەکی خیانەت، بەناوی پێشمەرگایەتییەوە لەشان بکات.

هەرکە لە واریقاتەکەی حاڵی کرد بە دامانەوە قڕوقەپی لێکرد.

- لە هەوەڵەوە لە دڵم سەقادرا جارێکی تر نایبینمەوە. کەچی پاش دەربازبوونی خۆم لە گەروومەی مردنی موحەققەوە بڕوام وایە هەتا خوا ئەجەلت نەهێنێت نامریت و مەزەندەکەی باوکیشی ڕاستە و:«

- جاشە سادەکان ڕوحمی کوردەواریان لە دەروونندا نووزەی ماوە و بە فەتارەتی نادەن».

- دڵیشم خەبەر دەدات ماوە.

بۆ دڵدانەوەی گوتی:

- خوچە چم نەبیستووە، بەڵان جاش خۆ بنیادەم خۆر نییە و مسۆگەرەو هیچ دڵ لە دڵیش مەدەو لەمن و لە تۆ ساخترەو شاڵلا ئەمڕۆ.. و سبەی سۆراخی دەبێت.

- خوا بەدەمتدا بڕوانێت.

داوای لێکرد هەوڵی بۆ بدات یەکسەر دەستی نایەسەر چاوی و گوتی:

- بەڵێن بێت هیچ قسوور نەکەم.

شێت و هار بوو. وچاوی ڕقی چووە پشتەسەری هەرکە داوای لێکرد:

- کاکە گیان خانووێکی گچکەمان لە گەڕەکێکی لاچەپ بۆ پەیدا بکە.

هەتـا لـە مـل هۆڕڕیەکـەی، لـەم ڕووەوە باشـی دەناسـی، دابەزێـت و لەمـاڵ نەچێتـە دەرو مەسرەفیشـیان بکێشـێت بـە تەوسـەوە گوتـی:
- دیارە من و ڕەحمەتی برای یەکتر نەبووینە.
لەمەبەستی گەیشت و لەوەڵامدا:
- بەڕێ وەڵـلا برایەتـی ئێوە ئەوەنـدە ڕێک و بەهێز بوو هیچ برایەکی دایک و باوکی ئاوا. نەبووە.
- ئەدی بۆ..!؟.
- ئـەوەی ڕاسـتی بێـت لـە دارەتـی دنیـادا هـەر ئـەو تفارۆکەمـان مـاوەو دڵـم بەروەسـت نـادات لـە سـێبەری خـۆم نەبێـت، لـە سـێبەری باوکیشـم بژیـت.
«هەرکەسێک لە سێبەری خەڵک ژیا ئومێدی دوا ڕۆژی بڕا».
حەمەڕەحیـم دەسـتی باروبـووی لـە هەمـوو ڕووێکـەوە لێنەگیرابـووەوە. جـار وابـووە مانگێـک کاتـی پێشـمەرگاتی لـەدوڕ ماڵـی بەسـەر بردبـوو. مەراقـی بـوو ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دەسـتی تۆڵـەی بـۆ بنەماڵەکـەی درێـژ بـکات. دەشـیزانی خەسـلەتی مێردەکـەی هەڵگرتـووە و داوەرانـەوەی زەحمەتـە مەمنـوون بـوو.. و تەقەلاشـی زۆردا بـەلای کەمیـەوە:
- خوچـە چاوەکـەم ناڵێـم مەسـرەف بـەس تکایـە پایەبەرزمـان بکەیـت، بـە حەوشـەکەمان ڕازی بیـت.
- کاکە خۆت ماندوو مەکە.
- خوچە دەستم داوێنت.
ئەمەی زۆر لە دڵ گران بوو. بەسەربادانی ناڕازییەوە گوتی:
- کاکـە چاوەکـەم لێـم ببـوورە ئامـۆژگاری ڕەحمەتییـە و ناتوانـم خواسـتەکەت بەجـێ بهێنـم.
پێشتر تێگەیاندبوو:

- خاتووەکەتان ڕەفیق حیزبییەکی ملەوەزی تێدایە.
بەزەردەخەنەیەکی تەڵخەوە گوتی:
- سندان لە خانوو بدات. من دەمەوێت هەتا خوا دەرویێکمان لێدەکاتەوە کەس نەمانناسێت
دوو یەش ئەمەش بوو، وایکرد بە خانووەکەی ڕازی نەبێت.

* * *

ڕۆژێک عەلی عەبوود بە تەک ڕێکخراوی بەعسییان گوزەر دەکات و لەبەرخۆیەوە هەروەکو خووی بوو بە باڵ فشکردنەوە ئایەتەکەی دووبارە دەکردەوە، بەرپرسانی بنکەکە وایان خەملاند:
- بە ئەنقەست و تان و تەشەریەوە ئاراستەی ئەوان دەکات.
دەیگرن و بەرەو بنکەکەیان ڕاپێچی دەکەن و دەڵێن:
- وا دیارە بووەتە بە کرێگیراوی کوردە خائینەکان. هەتا شرار دەبێت دەیکوتنەوە.
پاش دوو ڕۆژان لە نەخۆشخانە سەر دەنێتەوە.

*** **

سبیانەیەکی زوو، پێش ئەوەی نەبەز بڕوات لە دەرگای حەوشەیان درا.
نەبەز هەرکە دەرگاکەی کردەوە، خێرا خەبەری داپیریداو:
- پیاوێک بەرخێکی لەدەستە و گوتی:
- ئێرەماڵی مامۆستا حەمەڕەحیمە؟.
منیش نەوێرام وەڵامی بدەمەوە.
گورجی خورپەیەک ترس بەسەریدا زاڵ بوو. هەرکە دیتی و ناچار خۆشی و ترشی گوتی:
- فەرموو، فەرموو کاکە.
پێش ئەوەی دانیشتێ هەستی کرد هەر دووکیان ڕەنگیان تێکچوو..و

بۆیە هەرزوو گوتی:
- من ناوم مەلا هادییە.
یەکسەر خۆشی لە دەمارەکانی جەستەی گورجی دا مێروولەی کرد و بەوپەڕی شادییەوە گوتی:
- مەلا هادی لاوری؟.
- بەڵێ.
هەر زوو بەسەر دانواندنی کەیفسازییەوە زاری بەڕووی نەبەزی کردەوە.
- ڕۆڵە ئەوە دۆستی دڵسۆزی باپیرتە.
بەوپەڕی خولق خۆشی و سەرفرازییەوە گوتی:
- یاخوا بەخێربێیت دۆستە ئازیزەکەی حەمەڕەحیم.
- من زۆر لە دواتان گەڕام. لە دواییدا بیرم هاتەوە کە مامۆستای شەهید دۆستی کەریمە کۆری شیوعی بووە و چوومەماڵیان و لەگەڵم هەتا بەر دەرگەی حەوشەتان هات.
بە بزەیەکەوە گوتی:
- ئەدی ئەو بەرخە چییە؟.
زەردەیەک دایگرت و گوتی:
- من قەرداریمە. هەرکە لە چیای قەرەچوغ بوو شەوێک کاوڕێکی لە شوانکارەی بە دوان دەستێنێت و دەیکوژتەوەو ئەوەندە گۆشتەی بۆ هەڵگیرا بەسەر چیای خست و منیش ئاگادار بووم. بێ ئەوە ناخۆش هەتا هەنگڵمان ئێشا گوشتمان خوارد. دوو ڕانی گەورەی پێشکەش بە من کرد.
بە بزەیەکەوە گوتی:
- منیش ئەمڕۆ لە جیاتی ئەو بەرخەم بۆتان هێناوە.

* * *

ڕۆژێـک عەسـرانێکی زوو، بەدڵێکـی تـەژی خەمـەوە گـەڕاوە و لـە دوورەوە گوتـی:

- داپیرە، داپیرە ئەوە لە کێندەرییت؟.

لە بنەبانی ژوورەوە گوتی:

- داپیرەت بە قوربان بێت.

لەگەڵ دەرگا کردنەوەدا گوتی:

- ڕۆڵە ئەوە کووە ئەمڕۆ.. وا زوو هاتییەوە؟.

بەڕووخسار تێکچوونەوە گوتی:

- خۆپاکەتەکەیان لێساندم.

لەگەڵ ڕاچڵەکانەوە هەتا شەپ گرتی لەبەری ڕانی خۆیدا و گوتی:

- ئەیرۆ بە قوربان کێ!؟.

بە تەتەڵەی لێوانەوە لای وابوو حسێبی لەگەڵ دەکات و گوتی:

- ئەمنە ڕەشە عەرەبەکان.

لای ڕوون بـوو هەتـا خەڵکـی نەبووە و هەژارەکـە ڕەزیـل و سـەفیل و دەست کورت و پەراگەندە و دەربەدەر ببن ختوخوڕا بە گژیاندا دەچن تاکـو منداڵەکـە هێـور بێتـەوە بـە گـەرم و گـوڕ و گـوراح خۆشـییەوە ئەمـلاو ئـەولای سـێ جـار بـە شـەوقەوە مـاچ کـردن و بـە هێوریـەوە گوتـی:

- بۆ لەبەرچی ڕۆڵە!؟.

هەڵوێسـتەکەی ترسـەکەی پەڕانـدو شـادی گـەڕاوە ڕووە هەڵبزڕکاو یەکەیـەوەو:

- گوتییان درهەمێک لە سیعری خۆی گرانتر دەدەیت.

- لـە نرخەکـە ئاگاداربـوو.. و بـە مەزەنـدە وایبۆچـوو گرانتـری دابێـت و گوتـی:

- - بۆ بە چەندت دەفرۆشت!؟.
- بە سێزدە درهەم.
بە حەپەسانەوە گوتی:
- ئێ خۆ تۆ گرانت نەداوە!.
لەگەڵ سەرلەراندنەوە گوتی:
- وا دیارە بەڵاش کە سوخەتییانە بە گژت داچوونە.
- نا. نا داپیرە سیعری ڕەسمی خۆی دوازدە درهەمە.
- ئەمەی پێشتر نەزانی بوو، لە فکران ڕاچوو..و:
- ئێ پێت بگوتبووانە: با دووکاندارەکان بە یازدە درهەمم بدەنێ منیش بە دووازدە درهەم بیفرۆشم.
- سینگی لەگەڵ ئاخ هەڵکێشاندا بەرز بووەوە و:
- داپیرە ئەو مەلعوونانە گێلمە گێلمەی نازانن.
- ڕاست دەکەیت داگیرکەر و گێلمە گێلمەیان نەگوتووە. ئە هە بە زۆریش لەڕاست چینی هەژاران وانە. کەچی لەڕاست دەوڵەمەندان، بە بەخشینی زۆرەوە مڕ کراون ماکەرێکی تەواون.
ئەمەی لەم ساتەدا هاتەوە یاد:
ڕۆژێک لیفکەی فرۆشتە ماڵی حاجی فەتاحی کۆتاڵفرۆش. هیوای کوڕی پرتاو بە حەوشە کەوت و گوتی:
- مزگێنی باوکم قوماشێکی زۆری لە وڵاتی یابان مەتری بە «١٦» شازدە درهەم بۆ هاتووە و هەمووی لەسەریەک بۆ نۆهەت دینار فرۆشتەوە».
خەم ماتی بەسەرداهێنا و بە دڵتەنگییەوە گوتی:
- پاکەتەکە زۆر بوو؟.
- یەک تەکە بوو.

بۆ دڵدانەوەی بە ڕووێکی گەشەوە گوتی:
- چ نییە ڕۆڵە چ نییە. شاللا خوا لەلایەکی دیکەوە حەوێزەی دەکاتەوە.
دوای ڕووانینی سەروسەکوتی بەڕووگەشییەوە:
- بەڵانەکێ ئەگەر ئەو جارە ئەو عەرەبە ڕەنگ دێزە و داگیرکەرانەت دیتن بە دوازدە درهەمیان بفرۆشێ.
بە بزەیەکەوە، پەردەکەی وەرگێڕا، کە هەرگیز لە یادی نەدەڕەوییەوە و:
- داپیرە دەردەکەی چاوت هەر ماوە؟.
لە دڵەوە لەو ساتەدا پێ ڕاجفری و ناچار بوو بڵێت:
- نەخێر. تەنیا تۆزێک هەست بەزوورانەوە دەکەم.
- ئەدی دەبینێت؟
- ئا. ئا. لە دیتندا هیچ بەڵای نییە.

* * *

نەبەز لەبەر نەمانی باوکییەوە کاتی خۆی باپیری زۆری خدوو دابووێ. بەمردنی، چ جای بەڕەزالەتیش زۆر تێکدەچێت و لە هەوەڵەوە ئەوەندە گریا دیدەکانی پەنمان و جیقیان دەردا. مەگەر چۆن دەنا لەیادی نەدەچوو.
زۆر شەوان لەکاتی ڕاکشاندا، بۆ دووبارەکردنەوەی سەربردەکەی یەخەی داپیری دەگرت.
گورجی ئەگەر بیری پێشتر بۆ بچووبووایە هەرگیز لە دیاری بۆ کەریمە کۆری نەدەگێڕاوە.
چەند جاری بۆ دەور کردبووە و، بەڵام بوو بووە گرێیەکی دەروونی و حەزی وایدەخواست لە نێوان سێ چوار شەوان بەرگوێی بکەوێت.

هەر جارێک تاکو لە گێڕانەوەکە خۆی بگنخێنێت، گەز گەز گۆشی پێ بەردەدا، بابەتی لابەلای تری بۆ باس دەکرد. نەخاسمە بەسەرهاتی خۆی.
«پاش ئەوەی دەستم بە یەکجاری لە پیاو و کوڕ و کیژ و بووک و کوڕەزا پچڕاو تەنیا مامەوە دنیام بە جارێک وا لێک هاتبووەوە. لام وابوو لە تەپانی بنی بیرێکی بێزار تەنگی «٣٠» مەتر قووڵ دامەو ڕووناکی بە ئاستەمیش لێبەدی ناکرێت. وەک سەرخۆشانم لێهاتبوو..و ئاگام لە مەحموودی بێزەواڵ نەماو خەڵکەکە دەستیان لێ شوشتم. ئەگەر یەکێک بمردبووایە، کە ڕۆژ نەبوو یەختیارێکمان نەمرێت. پۆلیس شفێری خۆیان وەگەڵ چەند حەپسان دەدا مەیت بە ئۆتۆمبێل ببەن بەشمەکی بەریەوە، لە قۆرتێکی بشارنەوە.
حەپەسانێک ئاوقای بوو..و:
- کاتێک من دەبەن لەناو سەیارە دەجووڵێمەوە. شفێرەکە زگی زۆر پێمدەسووتێت و ئاوی سارد بە دەم و چاو و دەست و پێمدا دەکات و..وە هۆش دێمەوە. لەگەڵ حەپسە کوردەکان ڕێک دەکەوێت، بە دزی هەر ئەو ڕۆژە من دەگەیەنتە ماڵی خۆیان لە شاری سەماوە.
- لەگەڵ بەڕۆک هەڵتەکاندا بەرەو ئاسمانەوە گوتی:
- ئۆ. هـ یاخوا ماڵیان سەت ماڵی لێ بکەوتەوە!. وەکی منداڵی ساوا کێک و شەربەتیان بەدەممەوە دەکرد. هەتا تەواو زندوو بوومەوە. تەنیا زەریف نەمدەوانی لنگان باوێم، ئەوجا لەسەر داوای خۆم بە خێرو پارەی خۆیان منیان گەیاندە شاری کەرکووک و ماڵی سارای ئامۆزام.
زۆری مەراق بوو بۆ پاشەڕۆژ بیانناسێت و گوتی:
- داپیرە نەتدەزانی ماڵەکە کێنە و ناویان چییە؟.

سەری خەمانی بادا و گوتی:
- زۆرم بە عەرەبییەکی شەق و پەق لەگەڵ هەوڵدان بۆ دواڕۆژ ناویان بزانم پێیاندەگوتم:
- خاڵە ئێمە بۆ خوای دەکەین پێویست بەناو گوتن ناکات.
- لاشم وابوو لەخۆیان دەترسان، بەڵانەکی بە پیاوەکەیان دەگوت: ئەبووعەباس و ژنەکەش «ئومو عەباس».
کوڕێکی بەژن وماڵیان هەبوو ماڵی جودا بوو ناو«عەباس».
- ئـ هـ ئەوان عەرەب بوون و لە گیانی خۆشیان دەترسان ئەوجا زگیان بە پیرێژنێکی سەر لێواری قەبری وەک تۆ سووتاوەو گوێیان بە ترس نەداوە، کەچی دڕندەکانی خۆمان چ ترسیشیان لە دوا نەبوو..و بەناوی کوردایەتی و ترخێنەوە زگیان نەک بە پیروپەککەوتە، بگرە بەژن و منداڵ جاحێڵانیش نەسووتاوە.
- ڕۆڵە کە گوتت: خائین دەبڕێتەوە: ئەوانە مامۆستاکانیشیان هەر خائینن.
- ڕاستە ئەگەرنا ئەو بەچکە دەم بە خوێنانەیان درووست نەدەکردن.
- بەبۆچوونی من ئەوەی بە خائینیشیان حسێب نەکات هەر خائینە.
بێ ئەوەی لە بیری بفڕێت دوای تەواو بوون یەکسەر بەدەنگی بەرزەوە گوتی:
- داپیرە من مردنی باپیرم دەڵێم. مردنی باپیرم.
بە هەڵچوونەوە:
- کوڕم خۆ نەبووە حەقایەتی مێشێ.
پەستی ڕوویداگرت و بەناورانەوە گوتی:
- ئاخر بەو نەبێت دڵم داناکەوێت، نا.
ئەمە ملی پێکەچ کرد و گوتی:

- هەتا لە ساراکە بووین، بە واسیتەی خەڵکی دوبزەوە خواردنمان بە ڕەفاهەتەوە بۆ دەهات و. وەزعمان زۆر بەرەو باشی دەچوو. تەنیا باپیرت بەکارەساتی ئافرەتەکانەوە زۆری لەبەر خست. هەرکە چووینە «نوگرە»ی بەقورگیراو شەو و ڕۆژ لە سەمونێک و ئاوی گەرمیان زیاتر نەدەداینێ. ئەگەر پارەیەکی زۆرمان پێنەبووایە، بێشک زۆربەمان لەبرسان و ئاوەکەی دەمردین. بێ فەرق و جیاواز دەمان نارد خواردن و بوزمان بۆ دەهات.

قاروکەسەر بێنێکیان پێداو:

- گیانێکمان بە پۆلیسەکانەوەبوو. هەڵسوکەوتییان لەگەڵمان زۆر باش بوو. قەت فێڵیان لێنەدەکردین. هێندە جار خواردنیان بێ پارە لەماڵی خۆیان بۆ دەهێناین. نە خەسە لە ئەبووعەباس. کەچی زەفتییە بەعسییەکان زۆر بێدین و دڵڕەش و تەڵەکە باز بوون. ڕکیان لەو جێگایەش دەبووەوە ئێمە پێمان لەسەر دادەنا. دە (١٠) دینارمان بدابوونایێ ئەگەر بای (٣) دیناریان شت بکڕیبووایە زۆریش بوو،

- نەبەز لێیوەرگرتەوە و:

- ئاخر ئەوانیش وەکی جاشە داغمەدارەکانی خۆمان مامۆستاکانیان دڕندەبوونە و بۆ ئازاردانی میللەتیان دروست کردوونە.

- زۆر ڕاستە. بەئەمری حکومەتیش هەموو کەل وپەلێکیان لێ قەدەغە کردبووین. هێندە جار لە ناعیلاجیان شیوە قولەمان لەناو قۆدی ئاوی تەماتە، بە چیلکەدار و پەڕە کاغەز و قونکە جگەرە لێدەنا.

بە کەپوو فن کردن و سڕینەوە لێوەکانی کپی بەسەر داهات و:

- باپیرەت لەهەوەڵەوە بەکەم خواردن و ئاوی گەرم و سوێرەوە و زۆر بێ شنگ تر بوو. ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەبنیسا و بێ هێزدەبوو. تا

وای لێهات هۆشیشی بە جارێک نەما و خواردنم بە دەم نەکردبووایە داوای نەدەکرد. شەرواڵی بە زۆریش لەپێ نەدەکرد. هەشت نۆ ڕۆژی زیاتر نەبرد..

خەفەت تاوێک مرتەی لەبەر بڕی و بە ئاخەوە گوتی:

- لێلاییم بۆی دایێ یەکەم کەس بوو لەوێ خوا ئامانەتی خۆی لێساندەوە.

لە ناخەوە کوڵی، کەچی هەرزوو بەسەریدا زاڵ بوو، گوتی:

- بە هەزار ناڵی عەلی و تکا و ڕجا پۆلیسەکان سێ حەپسییان هێشت چوون لە ئاقار، بێ کفن و شوشتن لە قوتێکیان شاردەوە. بە مردنەکەی دەستەبەزێک کەوتە سەر دەندەکانی شێخ و ئەحمەدە گولەی هەولێری.

هەرجاریش دوای کڵاش دڕاند پێیدەگوت:

- ڕۆڵە لە بیرت نەچێت ئەوە پاداشت و بەرهەمی خەباتی نوێی کوردایەتی ساڵەهای ساڵمان بوو، لەلایەن سەرکردە بە کرێگیراو و بەزیوەکان.

ئەویش نۆبات بۆچوونی خۆی دەردەپەڕاند و:

- قسەکانت لە کونی کارک ڕاستترن، بەڵان مەرد ئەوەیە هەتا عزرائیل چۆک لەسەر سینگدا دەنێت بەهیچ کلوبابەتێکەوە لەیادی ناکات و شەو و ڕۆژ پێنج فەرزە تف و نەفرەتیان بکاتە سوونەتی ژیانی.

* * *

شەوێک لە تافی ماڵ نووستناندا کەریمەکۆر و گۆران بە ژوورکەوتن. بە هەشتاوییەوە لەبەریان هەستاو لە بریتی چاک و چۆنی و بەخێرهاتنیان گوتی:

- گۆران ڕۆڵە ئەدی ولاشەکەت!؟.
حسیا زۆر حەیرەی سۆراخێتی و بە زەردەخەنەوە گوتی:
- لەمن و جەنابت ساخترە، بەڵام نەیویست بێتەوەو چووە ئەو دیو.
« ئەگەر چوویتەوە، هەرچۆنێک بێت، بە زووترین کات دەبێ خەبەری کارەساتی ئەنفالم: کێ ماوە و کێ بەرکەوتووە بۆم بنێرێت.
یەکسەر باوەڕی کرد و باوکی لە دیاریەوە پێیگوت:«
- ڕۆڵە لە دوایان هەڕوە ئەو دیو».
کەچی لە دڵەوە ڕازی نەبوو، بە هەڵچوونەوە گوتی:
- تۆخوا. جارێ وەختی چوونە ئەو دیوە!.
کەریم لەچوونەکەی حاڵیبوو، بۆ دڵدانەوەی گوتی:
- ماڵ بەماخۆی نەچێت حەرامە.
گەشی پەڕییە ڕوومەتە چورچەکانی و ئەوجا بیری هاتەوەو پڕیدا گۆران و دوو کەڕەت لەسەریەک ماچی کرد و جاری دواییش گوتی:
- ئەوەش لەباتی زانایە.
هەرکە پرسیاری کەس و کاری خۆی لێکرد بە ئاهەوە گوتی:
- خەبەری دایک و باوکت دەزانم.
بۆ ئەوەی بخافڵێت و پرسیاری ئەوانی دیکەی لێنەکات و گوتی:
- لەبەر ئەوە باوکت پارەیەکی زۆری لابوو باشی ڕادەبوارد و بێدڵی خۆی و دایکتی نەدەکرد و یارمەتی زۆری خەڵکەکەشی دەدا. من هەتا هۆشم لەخۆ مابوو بەپارەی خۆی نەیدەهێشت بێ خواردن بم. دایکیشت شەو و ڕۆژ لە دیارم بوو..و یەکجار زۆر بێتام خزمەتی کردم. هەتا ڕۆژی حەلاو. وەلایێ لە یادم ناچێت.
دووبارە بۆ ئەوەی پرسیاری تری لەبیرباتەوە هەر زوو خۆی وا دەرخست زۆر مەراقی زانینێتی و گوتی:

- ڕۆڵە چۆن بەدەست جاشەکانەوە قوتار بوون؟.
بەلادان لەکرۆکی باسەکەوە خورپەیەکی ترس لە پەڕەکەی دڵیەوە چوزەی دەرکرد. نەخاسمە هەر باسی دایک و باوکی بۆ کرد. ناچاریش بوو.
- پووریّ زۆر پیاوانە لەگەڵمان جوولانەوە.
بە سرکیەوە گوتی:
- ئێ ی!؟.
خۆشی وترشی هۆی ترسەکەی وەلاناو بەلای مەرامەکەیەوە هۆیداوە و:
- پاش ئەوەی جاشە داغمەدارەکان نەیانهێشت خۆمان ڕزگارکەین من و زانا، بە فیتی باوکم و مامۆستا هانامان بردە ناو ڕەبییەی جاشەکان. زابتی ئیستخباراتی عەسکەری بۆ تەفتیش هاتە لامان. ناوی هەریەکەمانیان پێشتر کرد بووە ناوی جاشێک لە ئیجازە دابوون بەو ناوەی لە لستەکەی بەردەستی دابوو بانگ کردین و ئێمەش وەڵاممانداوە. هەرکە داوای هەویەی لێکردین جاشەکان وایان حەملاندبووین و گوتمان:
- ئێمە لە مێژ نییە دامەزراینە و هێشتا هەویەمان دەرنەچووە.
ویستی زار بەلایدیکەوە هەڵبڕێت، کەچی ئەو نۆرەی نەداو و بە دەنگی زۆر بەرزەوە گوتی:
- یاخوا ئەوەی جاشی داغمەدارە بە قوربانیان بن و ئەوانیش هەموویان بە قوربانی تەرمی بۆرە بن.
تەحەمولی نەما بێڵێت چیتر بدوێت و بلەزەوە ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد و:
- پووریّ ئەدی سۆراخی ئەوانی ترا؟.

یەکسەر لەگەڵ چاو برینە چاوە ڕەشە گەشەکانی و بەخۆی نەوەستاو لە هۆڕژنی گریانێکی وایدا گۆرانی ناچار کرد خراتر بێت.

* * *

- داپیرە مامە زانا لە دوای شێخ و سەفین و شوانەوە چووەتە ئەو دیو؟.

پێ شلەژاو دەمێک ورتەی لەبەرەوە نەهات. لە دواییدا تاکو بەردێکی یەکجاری لەسەردانێت و کەڕەتێکی تر نەیدرکێنێت بە دوو دڵیەوە گوتی:

- نا. نا. کوڕم فیراری عەسکەریە و نەیوێرایە بێتەوە. نەشیزانیوە خوا ئێمەی لە دەمی دڕندەی ئەنفالی عەرەبانی نەجات داوە. ئەگەر نا هەر دەهاتەوە.

دڵی بە قسەکەی ئاوی نەخواردەوە و گوتی:

- ئەدی کاک گۆرانیش فیرارەوە هاتووەتەوەش.

واق وڕمان وەستاندی هەتا بە ڕامانەوە ئەمەی بۆ هات:

- ڕۆڵە ئەو بووەتە جاش. مامت زانا لە تەپلەسەریشی بدرێت نابیتێ.

بێ ئەوەی بە وەڵامەکە دڵنیابێت نقەی لەخۆ بڕی. داپیری لێی ترساو:

- منداڵە و نەبادا لەجێیەکی تر بە گۆڕێی وەربکات و درۆکەشی لێ سپی ببێتەوە، کە ڕکی دنیای لێدەبووەوە ملی کەچ کرد ڕاستییەکەی بۆ هەڵڕێژێت و:

- ئا. ئا. کوڕم لە دونای ئەوان چووە، بەڵان تۆ جارێکی تر نەکەیت لای منیش باس بکەیت. ئەگەرنا شێخ خزمی ئەحمەدە گولەی خائینە

و بزانێت شەوێک زەفیتیەمان دەنێرتە سەرو ئاجەراتمان کوێر دەکاتەوە.
هەرکە ڕاستییەکەی بەر گوێ کەوت و گوتی:
- داپیرە هەموو جارێ تۆ دەڵێیت: «درۆ باش نییە».
بە دەیان جار لەم ڕووەوە ئامۆژگاری کردبوو:
- ناوەللا باش نییە. ئەوەی درۆزن بێت لەکن خەڵک و خوا ڕووڕەشە.
پاتی باشی بۆ هەڵکەوتوو..و بە هەڵێزانی و بەڵکی ئەویشی بۆ بدرکێنێت و گوتی:
- ئەدی هەنووکە چاوت کووە؟.
عاجباتی پێهات و:«
- ئەو بە بلحاتە بڵێ بۆ لەو ساتەدا ئەم پرسیارەی کرد!؟».
بە ملی داهات و گوتی:
- زۆر باشە و لە زگە بڵێم بەلا و قەلای نەماوە.

* * *

حاجی حەمشینی کوتاڵفرۆش گریانی منداڵێکی لە دووکانی حاجی فەتاحی برای لێوەی نزیک بوو بەرگوێ کەوت.
کاربەدەستانی بەعسی داگیرکەر. زۆریان لەگەڵ هەوڵدا بە ناوی ئیجازەی بازرگانێتی دەرەوە، هەرجارێک چەند ملیۆن دینار قانزانج دەکات، بەلای خۆیانەوەی پەلکێش بکەن خەفییاتییان بۆ بکات. لەبەر هەستی نەتەوایەتی و ئایینی بەگلاوی دەچوواندو لە دڵەوە عوودەی لێدەکرد و:
- قازانجێک لەئێوەی دوژمنی گەل و نیشتمانم چنگ کەوێت بەچڵکی سەگی لەقەڵەم دەدەم.
لە ڕووالەتیشدا گوتی:

- سوپاستان دەکەم: من پارەی ئیجازەی دەرەوەم نییە.
کەچی ئەمیان نەپەنگاوەو بەماوەی دووساڵان بووە ملیۆنێر.
- کاکە ئەوە چییە!؟.
بەهەڵچوونەوە کەوا کەفی غەزەبی لەزار پرووشکەی کرد و گوتی:
- ئەو توخمە سەگە دزی لێمان کردووە، دزی.
دەیزانی منداڵەکە لە ئەوانە نییەو کاکی دەیەوێت ختوخۆڕا تاوانباری بکات. بە واق ورمانەوە بۆ وێکەوتن گوتی:
- چۆن دەزانیت؟.
بە پرسیارەکە، کەیفدار بوو. گوتی:
- دوونێ هەتا چوومە، مزگەوت و نوێژی عەسرم بە جەماعەت کرد و گەڕامەوە)) ٢٠٠ (( دوو سەد دینار لەناو چەکمەزەکەم نەمابوو، بێجگە لەو هەتیمەش کەسی دیکە لەبەر دووکانەکەم نەبوو.
بەسەربادانی ناڕازیی یەوە، لە دڵەوە منگاندی و:«
- کەر لە کوێ کەوتووەو کوندە لە کوێ دڕاوە!» جا زاری هەڵبڕی و:
- کاکە چاوەکەم خۆ ئەوە جاری یەکەم نییە دزیت لێدەکرێت و دەشزانیت کێیەو خواش قەبووڵ ناکات بەلاش ئەو منداڵە بەستەزمانەی تاوانبار بکەیت.
- منداڵەکە ڕەنگی وا پرووکابوو..و لە دوورەوە، پێوەی دیاربوو. چشی دەسەلات نەبوو. هەرکە ئەمەی بیست یەکسەر بە دەنگی بەرزەوە گوتی:
- بە حەقی خوا من نەمدزیوە.
ئەمیش لەئەوی باشتر دەزانی کوڕەکەیەتی، بەڵام لەدەستی چووبوو. و تەقیبووەوە و عەشاماتێکی زۆریش گەمارۆیاندا بوون و

بەچرووچـاوی مچـو مـوڕەوە گوتـی:
- دەڵێیت: دیفاع لەو هەتیوە ناکەس بەچەی دەکەیت!؟.
بەمـە زۆری لـێ داخـدار بـوو. کـەوا نیازێتـی، بـە بوختـان هەڵبەسـتان، بـە منداڵـی خەڵکـەوە سـومعەی هیـوای کـوڕە بەدڕەوشـتەکەی خـۆی پێداپۆشـێت بـە دەنگـی حێلـەوە گوتـی:
- بەڵێ دیفاعی لێدەکەم و زێتریش.
کاکی دەمی حەپەسانی قرمساو بە غەزەبەوە لەسەروسەکوتی ڕاما.
- چـۆن دەزانـم خـوا هەیـە ئـاواش دەزانـم ئـەو منداڵـە سەروسـەبەبی تێـدا نییـە.
منداڵەکـە هەرکەزانـی لایەنگیـری لـە لاڕا بـۆ پەیدا بـوو ڕەنگـی نەختێـک بـەلای ئاسـایی گـەڕاوە.
ئـەم وتەیـە لەدیـار ئاپـۆڕای خەڵکەکـەوە گۆتـرە نەبـوو..و زۆر پـڕ هەڵمـاو بـە توورەیـی یـەوە گوتـی:
- شاللا بەو ڕدێنە سپیەو لەسەر ماڵی خۆشم بە درۆزنم دەقەبڵێنیت.
شـارەزای بـوو: زۆر جـار لێیناسـەنگرێتەوە، لـەزگ بـوو لـە حیدەتـان پێـی بڵێـت:«
- ئـەرێ وەڵـلا درۆ دەکەیـت!» کەچـی هـەزارە زیلەکـەو ڕەچـاوی بـرا گەوراتـی فسـی کـردەوەو ناچـار بـوو بـەم تـەرزە پـووش بەسـەری بـکات.
- حاشـاکی جەنابـت مـن حـەددم نییـە ئـەو ناماقوولییـەی لەڕاسـتت بکـەم، بـەڵان ئەگـەر بزانیـت ئـەو منداڵـە کێیـە قـەت بـە مەزەنـدە ئـەو توومـەت نـەدەدا پـاڵ.
نەبـەز هەتـا ئـەو سـاتەش تونـد گیرابـوو، پشـووێکی ئومێدی هاتـەوە بـەر بـە زیـت بوونـەوەی ئـەو پاڵپشـتە بەهێـزە.

حاجی فەتاح خۆشی و ترشی بەملیداهات بۆ. وێکەوتن هەستی توریندانە ڕاگرێت.
- ئەوە کوڕەزای ئەو پیرێژنە لیفکە فرۆشەیە کە لە کۆلانی گەڕەکی ئێمە ((٧)) حەوت هەزار دیناری ئێمە دەبینێتەوە و لە خواش بەولاوە کەسی دیکەی لێ دیار نەبووە. ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەوەشدا نانی ئیللە لاشک نابەن و بە لیفکە و پاکەت فرۆشی سەرپێیی بەڕێوە دەچن، لە دەرگەمانیدا و گوتی:
- ئەرێماڵی دوونێ چتان بزر نەکردووە؟.
هەرکە وەسفی جانتا و ژمارەی پارەکەمان بۆ هەڵدا، بێ سێ و دوو داینەوە. هەرچەند هەوڵ و تەقەلامدا هەزار دیناری بدەمێ وەری نەگرت و گوتی:
- ئێمە لە نەوەیەکی واینە، بە ئارەقەی نێچەوانی خۆمان نەبێت، بێزمان نایەت بە پارەی خەڵک بژین.
لە زاری حەمە ڕەحیمەوە:
- ئەوەی بەنانی خەڵک ژیا هەستی مرۆیاتی زڕا.
- تۆخوا منداڵی ئەو نەوعە ژنە دوو سەت دیناری جەنابت دەدزێت!؟.
وتەکە تەرحی شەپەزللەیەک ئاراستەی دەم و لەوسی کرابێت پێ ڕاچڵەکی و هەنجەتی نەما. بەس بۆ خۆپەڕاندنی ڕووالەتەوە بەرامبەر خەڵکە وڕووژاوەکە دوو زللەی کوێیی یانەی خێواندە بناگوێی و گوتی:
- دە بڕۆ گوجیلە سەگ بەرچاومان بەردە و خوام لەو خووایەیە جارێکی تر پێت بەو کۆلانە بکەوتەوە.
خەڵکەکە زۆربەیان پێ پەست بوون، پاش ئەوەی پاکانەکە لە دڵان جێ گیر بوو..و ئەوجا لێیدا. نەخەسەلە حاجی حەمشین بە جارێکی

لێیدە غەزڕاچوو. بەڵام برا گەورەیە و چی لەگەڵ ناکرێت.
نەبەز هەرکە پێی لەسەر عەتەبەی دوکانەکە سەنگراوە، لەگەڵ ڕوو.
وەچەرخاندا بەقارەوە نەڕاندی و گوتی:
- شەڕت بێت لە شەرتی خوا دوای دە ساڵی دیکەش بێت تۆڵەی
ئەو دوو زللەیەت لێ بکەمەوە.
خەڵکەکە بەبڵقی سەر ئاویان خەملاند، کەچی هەموویان واقیان بە
هەڵوێستەکەی ورما.
حاجی فەتاح یەکسەر بە دەنگی بڵندەوە گوتی:
- هەتیو چیدی بە گوو خواردن لێرە نەوەستیت. دەنا بێم شاپ
تڕێنت دەکەم.
حاجی حەمشین نەبێت لەناخەوە باوەڕی هات و لە دەروونەوە
دوا: «
- بەلاش گیرەپیسییان بە دوا نەکەوتووە».

* * *

«ئەلحوکمولیلا» کافر بەخۆشی خۆی ناچێتە دۆزەخەوە. چارەی
نەما و ئێوارەیەک خۆی وارە وارە هاوێشتەماڵیان و دوای هانابردن
بۆ براکەی. ئەویش بە توندی بەرپەرچی داوە و گوتی:
- من ناتوانم لەگەڵت بێم تەوازوو بۆ تاوانەکەت بخوازمەوە، بەڵان
ماڵیانت نیشان دەدەم.
گورجی لەهۆی هاتنەکەی گەیشت و زۆری کەیف پێهات. پاش نەمانی
سەرداریشی سامی بنەماڵەکەیان لە نێو دڵی ناحەزانەوە، ئەمەش
مەرامی ژیانی بوو، هەرماوە. ئەگەرنا حاجی فەتاحی ملیۆنێر و
دیدەنی ماڵە هەژارێکی گەڕەکی شەعبی کوجا مەرحەبا. بە نەبەزی
ڕاگەیاند و:

- ڕۆڵە خێرا چایەی لێنێ.
چووە بەرامبەری چوارچمکی دانیشت و گوتی:
- یاخوا بەخێر بێیت کاک حاجی.
تی چاوێکی لە چاوی بڕی و گوتی:
- خوا ئیمانی هەموولایکمان سەلامەت بکات.
دوای تۆزێک ئۆقرە گرتن و سەربەخۆدا شۆڕکردنەوە، بە ئەمێک هەڵیدایە و:
- خوشکی ئازیزم من هەڵەیەکی زۆر گەورەم دەرحەق کوڕەکەتان کردووە.
هەرزوو لە چەنەی قسەکەیداوەو گوتی:
- کاک حاجی جارێ ئەوەی دەڵێیت هەلەی پێناگوترێت و تاوانێکیش نییە دووانە:
ویستی پرسیاری ڕوونکردنەوەی بدەرێنێت، کەچی نۆرەی نەدا و گوتی:
- دزییەکە، بە مەزەندە بووەو هەتا ڕادەیەک حەرەجت لێناگیرێت، کەچی دوای ئەوە بۆت ساخ بووەوە کوڕە دز نییە لە جیاتی ماچ کردنی و پاکانە خواستنەوە، لەو توومەتە گەورەیەی خۆڕا دابووتە پاڵی و گاڕدانی لەسەر،، ڕەوشت پاکی لێشتداوە و منداڵیش ئەوە ناکات.
ناچار بوو بێ خوایشتی دڵیەوە دان پێدابنێت و گوتی:
- پیاو حەق بڵێت قسەکەت ڕاستەو هەر ئەوەشە وا منی هێناوەتە ماڵتان و ملم لە ڕاستتان لە موویێک باریکترە.
- «ئـ.هـ دەزانی بەرەی رووتانین لە مارەیی دایکمان خۆش بین لە حەقی خۆمان خۆشنابین، بۆیە وا ئاوا بە تەوازووەوە خۆت ملکەچ دەنوێنیت».

دەنگی هەڵبڕی و گوتی:
- کاک حاجی بڕیارمدا بوو منداڵەکەش لەتوانایدا نەبێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، بەخۆم بێم لە جیاتی دوو زللەکە، دوو خوترەت لە ناو دوکان لێدەم، بەلانەکی مادام هاتوویە ماڵمان ئەوا لەو حەقەی خۆمان خۆشبووین.
باوەڕی هەرگیز نەدەهات ئاوا بە ئاسانی دەستی لەژێر سەری ئەو گیرەپیسانە دەردێت. لەناخەوە خەنی بوو.. و بە هەشتاوی و کەیفسازییەوە گوتی:
- داپیرێ نەبەز بەو قسەیەت دڵنیا بم؟.
بە چاوی تەژی شانازییەوە سەیری کرد و گوتی:
- کاک حاجی وا دیارە بەرەی رووتان باش ناناسێت قسەو کردەوەیان یەکە و پشتی دڵنیاییت بە یەکجاری بکەوە.
هەرگیز ئاوای لێرانەدەدیت دەلحاز دوو دڵییەکەی لەم رووەوە فڕی و لەخۆشییان ڕەنگی ئاسایی بووەوەو زاریشی بەش و گوتی:
- زۆر مەمنوون خوشکی بەڕێزم زۆر مەمنوون.
نەبەز..ویستی لە تۆڵەدا هەر ناپرتوخی کوڕە بەدڕەوشتەکەی دەربێخێت. دوای ئەوە بە بڕیارەکەی داپیری دڵگیربوو..و گوتی:
- داپیرە تاکە پاکتەکەی ئەمنە عەرەبە دیزەکان لێیانساندم، من ناوی خۆم بە قەڵەمی سوور لەسەر نووسیبوو. دوونێ لە هیوای کوڕی مام حاجیم کڕییەوە.
- گرژی یەکسەر چڕوچاوی حاجی داگرت و خەم لە هەناوییەوە گینگڵەی پێداو کەچی نەیتوانی زمانی بەئاستەمیش لەم ڕووەوە بپچڕێنێت.
گورجی هەوەستی زۆر پێهات و بێ پەردەی شەرمەوە، بە ڕووی هەڵداو:

- ڕۆڵە گیان عەرەب و عەجەم دەزانن: کاک حاجی بەخۆی و کوڕیەوە دەستیان لەگەڵ ئەمن و ئاسایشی داگیرکەری کوردستان تێکەڵە، ئەگەر نا چۆن دەتوانێت گرانییەکی بێتامی وا بخاتە ناو بازاڕەوەو لەهەموو خیانەتان خیانەت ترە:

- مەتری قوماشی بە هەشت سەد فلس لە هەندەرانەوە بۆ بێت و بە نەوەت دینار بفرۆشتەوە.

چاوی بە ئەنقەست لە چاوی ناو گوتی:

- دووەم خیانەتیشی هەر بە فیت و پارەی بەعسی داگیرکەرەوە، تاکو بە خەڵکەکە بسەلمێنن حکومەتی عەفلەقی کوردکوژ و خۆشی موسڵمانی وانە بەرماڵیان لەسەر ئاو دەگەڕێت و زەرەر و زیان بە «گێرکە»بەگی خواسایی نەگەیاندووە. بگرە بەخشندە و خێرکەرن مزگەفتێکی گەورە و نایابی درووست کردووە.

ئارەقەی ڕەش و شینی شروانی دەردا. هەتا ئەو ساتە بە خەیاڵیشیدا نەدەهات دەرکی هەمبانەی پرتۆخی بەم چەشنە، لە نێودڵی خەڵکی شارەکەی والابووەتەوە. لەولەبانی و ڕۆشنبیریی پیرێژنیش دەمی کردە تەڵەی تەقیو هەتا بە پینەوپەڕۆی لابەلا بەرپەرچی بدابووایەوە. بەهەزار ناڵی عەلییەوە پیاڵە چایەکەی بۆ تەواو کرا. سەت خۆزگەی دەخواست دوو مەترەقەکەی بەناوشانی بکەوتبووایە زۆر شیاوتر بوو. نەک ئەمانەی بەرگوێ هەڵدرابووایە.

دوای پەرتەبوونی خەڵکەکە حاجی حەمشین وەبەر گوێی کاکی چرپاندو:

- بەو بەیتەی زیارەتم کردووە، هەروەکو گوتی دە ساڵی دیکەش بێت تۆڵەی ئەو دوو زللەیەت لەجێگایەکی وا لێدەکاتەوە ئابڕووی دنیا و قیامەتت دەڕژێنێت.

لە هەوڵەوە قەشمەری پێهات. هەتا بۆی واژی کردەوە لە توخمی عەولا رووتەی کەندێناوەیە دەلحاز خورپەیەکی ترس کەوتە پەرەکەی دڵیەوە و:

- تفارۆکەکە بەخۆشی دەسەلاتی نەبێت ئەو فیلەتەنەی کە لە دوڕ ژووری حەپسخانە دوژمنی خۆیانی بە پەند لەناو برد، بیستوومە لە کارەساتی ئەنفال دەرباز بووە نامووست دەبات.

لەو ساتەوە کێچی کەوتە کەوڵەوە و نەیدەزانی چۆن بە چ ڕێگایەک بەربەستی بەرەی ڕووتان بداتەوە.

دڵە مەلەرزەش شەو و ڕۆژ بەربینگی گرتبوو، زۆرجار بە ڕێککەوت گەنجێکی نەناسراو..وەبەر دوکانەکەی تێدەپەڕی، چاوی لە ئاستیدا نەدەقوچاندەوە. ئەوجا سەری بە:«

- لاحەولە وەلا قووەتە، ئیللا بیللاهیل عەلیعولعەزیم». با دەدا و دەیگوت:

- کوو بەلاش و حەلاش تووشی گیرەی جەربەزە و سوورتکان بوومە خوایە!.

مسۆگەریشی بوو زوو..و درەنگ ڕۆژێک هەر دادێت وەبەر حەملەی غەزەبیانەوە بکەوێت.

گورجی بە شانازییەوە ئەملاو ئەولای نەبەزی ماچ کرد و گوتی:

- ڕۆڵە ئەوە نیشانەی ترسانە و کوتەک دەزانێت قۆناخ لە کوێیە. ئەگەرنا حاجی تیکە بەتیکەش بکرابووایە پێچکەی بە ماڵی ئێمە نەدەکەوت.

* * *

## ئەنفالی سێیەم

دەنگ و باسی ئەنفالێکی تر، کارەساتێکی دیکە. ڕاوەڕووت و تالانێکی تر. کورد قڕانێکی دی، بەزین و ئاشبەتاڵێکی دیکە. لەنێو شاردا کون فەیە کون تەقییەوە و گوێی وردو درشتانی کاس کرد:

- بەعسی عەرەبی داگیرکەر دەمی بەخوێن بووەو ئەمجارە ژن و منداڵ و پیاوی پیری پەککەوتە، بەس بەتای جلی بەریانەوە لەپاداشتی پێش قەرەوری کوردکوژانی ئەو دیو، لەلایەکی تری کوردستانەوە، دوای زندە بە چاڵ کردنی پیاوە گەنجەکان و تالان کردنی سەروەت و سامان وا لە ئاقارێکی چۆل و هیشک و برینگ و زۆر دوور لە ئاو..و ئاوەدانی، چەشنی ئاژەڵ خڕیان هەڵڕشتوونە.

هەستی بەزەیی و ویژدان و مرۆیایەتی و نیشتمانی خەڵکی شاری لەناخەوە ڕاهەژاند و دەنگی مقۆمقۆی یارمەتیدان لە کوچەو کۆلانان بەرزبووەوە و لە مالان پەنگاوەو دڵی گەورەو گچکە بەدین و زەندیق، هەڵوێستدار و عولعولی، بێ پڕوپاگەندە و درۆ..وفیشالی دوو زەردێنەی حیزبە بەراو....... کاربەدەستە بەزیوەکان تان و جۆشێکی وایدا تەرحی حار گرتن هەر بابا بوو، بەگوێرەی هزرو دەسەلاتی خۆیەوە دەیویست بەرەیەکی خێر لەم ڕووەوە دژی هەڵوێست و حەزی زەبر بەدەستی داگیرکەرەوە، باوێتە مزگەوتەوە.

گورجی بەبیستنی خۆی پێنەگیراو بە تالووکەوە، ئێ هـ بەڵکی ڕێگەی هاریکارییەک وێکەوێت بەرەو بازاڕ هەیپەی لێکرد. هەر چاوێکی کردبووە چوار چاو..و لەمەلاو لەولای سرکانەی دەڕوانی، یەکێک بناسێت و قۆڵی یارمەتیدانی لە قۆڵی هەڵکێشێت. لە نکاو تووشی مەلا سمایل و خدرە لارو کەریمە کۆر بوو. پێشتر ناوە ناوە دیدەنیان دەکرد بەهەڵچوونەوە بەربەستی باروبوویانی لە هەموو

ڕووێکـەوە دابـووەوە:
- کەسێک بە ڕەنج و شانی خۆی نە ژیا مانای وایە مرد.
مردنێکی بێزەوەریش. ئـ.هـ ئەوهات و هاوارەی میللەتەکەشمان هەر بۆ ئەوەیە ژیان بە دەست و قامی خۆی بەسەربەرێت، نەک لە ژێر عەبای ستەمکار و داگیرکەرانەوە.
پیکابیان لەبەردەم نانەواخانەیەک ڕاگرتبوو..وبە پاشۆلان نانیان تێدەکرد:«
- خۆزیا دەستی منیشی تێدەکەوت!».
شادی لە ڕادەبەدەر دایگرت.
تاکو بزانێت لایان قەدری سەردارەکەی هەیە بە شاگەشکەیی یەوە ڕووی زاریان تێکردو:
- یاخۆ بەخێر بێیت ئێمە مەرامـمان وابوو ئەو کەڕەتە نان ببەین و لە دووەم کەڕەتدا بۆ کەل وپەلی پێویستی ڕۆژانە، جەنابیشت ئاگادار بکەین، بەڵان وا دیارە دڵمان لەگەڵ یەکتر ڕاستە بەخۆت هاتیت.
بە سۆزەوە گوتی:
- زۆر سوپاستان دەکەم.
لەگەڵ ڕاگرتنی پەنجا دینار بۆ مەلا سمایل و گوتی:
- دەبا. بای ئەوەندە پارەکەمەش خێری ئێمەشی تێکەوێت.
- پارەی نانێکی زۆر لەلارا دراوە و پێویست بە پارەی ئێمە و جەنابت ناکات.
لە ڕەنگ و ڕووی هەستیان کرد ناڕازییە و هەتا باوەڕ بکات گوتیان:
- بەس لە نوین و کەل وپەلی دیکە خێری خۆتانی تێباوێ. بەمە شادی دایگرت و لایوابوو لە ڕۆییندا پێی لەزەویدا بەرز دەبێتەوە.

بەوپەڕی شانازییەوە لە پشتەوەی پیکابەکە خدرەلا دەیهاژوا سوار بوو، خەڵکەکە هێشتا تەواو بە دەنگی هاوارەکەوە، بەخۆ نەکەوتبوون. لە چووندا تاک و تەرا ئۆتۆمبیل دەدیترا هەرکە نانەکە دابەش کرا، لەدوو سێ لاوە بانگ لەنێو کۆمەڵە تێک چڕژاوەکەدا، دەیان خێزانی وەک کۆچەر لەساکە گۆڕدا، دەستە دەستەی گەورە و گچکە، کۆمەڵەیان بەستابوو، قەت بڵێیت عەشتەبایان بۆ دەرمانیش لا نەبوو ڕاهێشترا:

- خێرەمەندان، خێرخوازان، نان و خواردەمەنی لەحەدبەدەر زێدەنە و پێویست ناکات چیتر بێنن خەسار دەبن، خەسار. بەس لەمەودوا تەکانی نوێن و کەل وپەلی پێویستی ڕۆژانە لەخۆتان بدەن. کەل وپەلی ڕۆژانە.

لەبەر قەرەباڵغی ڕێگاکە لە گەڕانەوەدا شفێری لێزان و چاپووک نەبووایە سەری لێدەشێوا و ڕاستەڕێی لێ تێکدەچوو. سەیارە دوو، دوو و سێ سێ، پڕ شتومەکی هەمە تەرز قەتارەیان بەستابوو. گورجی لەخۆشییان هەستابووەوەو بەهەر ئۆتۆمبیلێک دەستەبەزێک دەکەوتە سەر دەندەکانی و لای وابوو هەموو پێشکەش بەکەسی خۆی دەکرێت. لەدڵەوە هەزار و یەک جار خۆی کردە قوربان و بەلاگێڕی ڕۆلانی دڵسۆز و چاوتێر و بەخشندەی خەڵکی شارە ئازیزەکەی خۆی و:

- دەگ بە قوربانی تۆزی بەرپێی خەڵکی شارە ڕەنگینەکەی خۆم بم. بەلاگێڕی هەڵس و کەوتیان بم. بە فیدای دەست و کەرەمی هەولێریان بم. هەتا میللەتی کورد ڕۆڵەی بەوەفا و دڵسۆزو سەخی وەک ئێوەی هەبێت ڕۆژێک هەر دادەهێنێت. دوور لەچاو سوورکردنەوەی دوژمنان پشووی ئۆخەی تێدا بخوێنەوە.

ماوەیەک کپی بەسەرداهات و لە دواییدا دەستی پێکردەوە و:
- ڕاستە لەنێو کێو و زورگ و هەڵەتاندا لە سایەی سەرکردە بەزیوەکاندا «ئاشبەتاڵ» ی لە هەرچی جموجۆڵی چەکداری و سیاسی دژی حەزی داگیرکەرانەوە کراوە، کەچی لەنێو شاردا، لەبەر ئەوە داغمەدارەکانی لێدوور بوون، بە بەرەوازییەوە کوردایەتی و مرۆڤایەتی هەر لە قایدەی جارانن و هەر بەردەوامیش دەبن.
- دەگ هەرچی جاشی سادە و داغمدارە، بە گەورە و گچکەیانەوە بە قوربانی تۆزی ژێرپێتان بن ڕۆڵە ئازیزەکان.
پێخەف و قاپ و قاچاخ و مەنجەل و پەقرەج و مەسینە و دۆلکە و تەنەگە و بەرمیل و تەنکی ئاو و کاریتە و شەقرە و حەسیر و نایلۆن و بلۆک و چەمەنتۆ و قوم و چەگل و زۆر شتی تر کلاشەیان دەکرد.
هەتا گەیشتنەوە ناو شار ((١٨)) هەژدە لانکی لەسەر پیکابان ژمارد.
لە ماڵی خۆی بالیف و لیفە و جاجم و بەڕەو تەشکە مافوور و دوو گوردی هاویشتە ناو پیکابەکە و ئەوجا سوار بوو. ولەسەری بە پاوە کۆلان بە کۆلان هاواری دەکرد:
- هۆ.. خزمەکان هۆ....
- هۆ.. موسڵمانەکان هۆ....
- هۆ.. کوردپەروەرەکان هۆ... ژن و منداڵ و پیری ڕزاوەی بەرماوەی سێیەم ئەنفالی کراوەکانی دەستی عەرەبی داگیرکەر، وا لە ساکە گۆڕێک بێ ناز و خاوەن فڕێدراون و سەمعە سۆت: ئەوەی ڕۆژانە پێ بژین شک نابەن. تکایە، تکایەکی خوایانە، تکایەکی کوردانە، تکایەکی مرۆیانە دەستی باروبووتان بەقەدەر توانا بۆیان درێژ بکەن. نوین و مەنجەڵ تەشت و تەنەگە و جام و لەگەن و قۆدی و کەوچک و کەوگیر و کەرەستەی خانوو..و هەرچی دڵتان ڕێدەدات و لە دەستتان دێت.

ئیدی لە هەر لاوە بەسەریاندا باری.
گورجی بۆتاندانیان ناوە ناوە هاواری دەکرد و:
- ئەوەیە کوردایەتی!. ئەوەیە مەردایەتی، ئەوەیە ئیسلامەتی، ئەوەیە خەبات و تێکۆشان. ئەوەیە. پێشمەرگایەتی. دەی بە قوربانی هیممەتان بم، بە فیدای دڵ و دەروونتان بم. دەی مەرگم بە پێش مەرگتان کەوێت. دەی لەو چاوەتانە. ڕۆژی غیرەتە. ڕۆژی مرۆیاتییە. ڕۆژی چاکە و سەخاوەتییە. ڕۆژی بەزەیی و خۆشەویستییە.
- دەی گورجیتان دەبەرێ مرێت، بە گوێرەی گوزەرانتان بە قەدەر بەرەی خۆتان پێراکێشن زیاتر نا. لەو خێرەش خێرتر نییە و وەک نوێژ و ڕۆژی لەسەرمان فەرزە و باری تەعالاش لەوێ دنیایێ، لەسەر پردی سیراتێ تۆڵەتان یەک بە دەتان دەداتەوە و بە بەهەشتی بەرینی خۆی شادتان دەکات.
لە چوارەمین کۆڵاندا پیکابەکە پڕ بوو، لە بەر خەڵکی تر هەر کاروانێکی دیکەیان پێکرا.
کاروانێکیش بابەتی نایلۆن و فافۆن. چەند دوکاندارێک بەپارەی خۆیان بە نرخی شەریکەیان کڕی.
پیکابێک پڕ لانک. ماڵی بەمنداڵی ساوا نەما بەری نەکەوێت. دوو سێ لانک زێدە بوون گورجی بۆ ئەو ماڵانەی بردن منداڵیان بەڕێوە بوو. بۆ ئەوەی لەسەر ئامۆژکارییەکانی سەرداەکەی بڕوات هەتا ئاوی لە دوا بێڵی بێت چی عەیب و عاری داغمەدارەکانە هەڵڕێژێت، لەم ساتەدا بە هەلیزانی لەنێو خەڵکە جەرگ بڕاو..و سووتاوکەدا دڵنیایی خۆیان لە ئاست باروو بووەکەدا بۆ یەکتریان دەردەبڕی و:
- لاموایە چ ئیحتاجییەکی ئەوتۆیان نەماوە.
- نەخێر. هەموو شتێک ئەوڕۆ. ژیان پێوستی بێت لەمشەیە.

- پارەیەکی یەکجار زۆریشیان دراوەتێ.
- تەنیا خانوو نەبێت.
- بۆ خانووش خوا کەریمە.
- کاریتە و شەقرە و حەسیر و بلۆک و قوم و چەگل و چەمەنتۆ زۆر هاتوونە.
- دەزانین بەڵان هێشتا بەش ناکات.
بەرووی مەلا سمایل هەڵشاخا و گوتی:
- مامۆستا جەنابت مەلای و سەرت لە زۆر شتان دەردەچێت دەمەوێت پرسیارێکت لێ بکەم.
- بلەزەوە گوتی:
- هەر تۆ و پرسیار!.
هەناسەیەکی شانازی پڕ بە سییەکانی هەڵکێشا و گوتی:
- کووە ئەوجارە ئەو ژن و پیر و منداڵانە لە تۆڕی ئەنفالی عەرەبان قوتار بوونە!؟.
پرسیارێکە و لای زەیندارانیش ئاوی زۆر دەوێت. کەچی زۆربەی خەڵکەکە بە عەقڵ قوڕەیی یان خەملاند و ئەللا خوایی زمانی لێ خشاندووە.
مەلا سمایل چی بۆ نەهات و شەرمیشی بەخۆ بوو لە دیار عەشاماتەکە بڵێت:
- نازانم.
پاش دەمێک ڕامان و مشوور خواردنی بەرخۆیەوە ئەمەی بۆ زیت بووە و گوتی:
- ڕەنگە ئەو کەرەتە خوای مەزن لەڕاست ئەوانەی ڕوحمی هاویشتووبێتە دڵی کاربەدەستانەوە.

بێ سێ و دوو لێکردنی ترسەوە گوتی:
- کاربەدەستانی بەعس و ڕوحم!؟.
حەیرما و ناچار بە ملیدا هات، کە بیری بۆ چیتر نەدەچوو بێ ئاگایی خۆی دەرببڕێت و بڵێت:
- ئەدی؟.
هەرکە دڵنیابوو ناگاتە ساخە، بەڕالەخۆوە گوتی:
- کاتی خۆی لەگەرمەی شەڕی داگیرکەرانەوە داغمەدارەکانی ئەملایە تەنیا یەک قۆناخەڕێ، بە پێیان، بێ پاداشتنی نانێکی سووتاو بوو نە «کۆسە بەبەی» پێش قەرەوری کوردکوژانی ئەو دیو، کەچی داغمەدارەکانی لای خۆمان لە تامیان دەرچوواند و تەرحی پێناو چەند قۆناخییان بڕی و بەسەر شەریکەی نەفتی شاری کەرکووکیاندا دا.
پشووێکی کەیفسازی خواردەوە و گوتی:
- ئەوجا هەر لایەنێک، بە گوێرەی ((.........، .........، .........)) بەعسی داگیرکەر ئەنفالی پێشکەش بە میللەتە هەژار و بێدەسەڵات و نەبەزیو..و تێنەقووچاوەکەی دەوروبەر کرد.
دەمی حەپەسانی گشتییان بەشبووەوە و چاو لە مۆڵەق و متەقیان کەم و زۆر لەم ڕووەوە لەبەروە نەهات.
نەخاسمە نە شارەزاکان. ئەم بۆچوونە عەقڵ گرتە پڕ بە پێستە و مەگەر بە دەگمەن دەناکەس بیری بۆ نەدەچوو..و ئەو پیرێژنە پشت چەماو..و چرو چاولۆچاوییەیان نەگوتووە.
کەریمەکۆر حسیا دنیا چ باسە، بە چاوێکی تەژی ئافەرینەوە بۆی ڕووانی و گوتی:
- براینە عاجباتیتان نەمێنێت. ئەوە پەروەردەی دەستی زانایەکی پسپۆر و جاقی و کولاوی ناو ئەو تەرزە مەسەلانەیە.

بۆ ئەوەی بناسرێت و حەیراتییان بتۆرێت و گوتی:
- ئەوە ژنی بەرەی ڕووتانە.
بیلبتـوون بەناسـینی خۆشـحاڵ بـوون و لەناخـەوە سـەت ئافەرینیـان حەواڵـە کـرد.
ئەویش لـە هەوەڵـەوە پێ پەسـت بـوو، بـۆ ئـەوەی نەناسـرێت لەجیاتـی دەمامـک چاویلکەیەکـی ڕەشـی لەچـاو کردبـوو، ناچـار بێویسـتی حەزیـەوە لـە چـاوی کـردەوەو پاشـدان لـە ناخـەوە دواو:«
- ڕەحمەتـی گوتەنـی چـم لـە قیامـەت، بـا خەڵـک و خـوا خـڕ بزانـن. هەرچیـش دەبێـت بـە گونـی نەبـەزەوە».
- کەواتـە بـە بۆچوونـی ئـەو پلکۆکەیـە تـەپ و تـۆزی نەهامـەت هـەر لەسـەر پشتی چینی نـەدار و بێ پشـت و نەبـەزی و هەڵنەهاتووەکانـە.
- مانـگ لـە چواردەیـە حەوجـە بـە ئەنگوسـت نـاکات. نیازی هـەردوولا تەنیـا لـە ناوچوونـی ئێمەمانانـە.
لە خاو. و خێزانە ئەنفال کراوە نوێیەکانی بەرگوێ کەوت:
- ئـەم نەدەکەفتییە بەردەسـتی دوژمنێ، بەڵێ گەلـەک ڕەجا لـە «هەڵۆ» و جەماعەتـا وی کـرن، بەڵـێ بـە چ ڕەنگەکـێ نەهێـلان ئەمخـۆ قوتـار بکەیـن. سـوێند خـواردن دوژمـن قـەت نەشـێت و هیـچ هێـز و دەسـت هەڵاتنیـش نینـە بگەنـە ڤـێ دەڤـەرێ.
گورجی هەر زوو بێ پەردە و بە زەردەخەنەنەیەکی تەڵخەوە گوتی:
- کەشـکیش بـرای دۆیـە و بـۆ لەناوبردنـی ئێمەمانـان و هەسـتی کوردایەتـی، بـە مووێـک هاوێرناکرێـن. چ کەچـەڵ حەسـەن، چ حەسـەن کەچـەڵ هەریەکـە.
دوای دەمێک دامان و بیرکردنەوەی لەم ڕوانگەوە:
- دەنا من ئەویانم پێ لەبارترە لە ئەمەیان.

- چۆن!؟.
- ئەویان پاش چەند ساڵی دیکە مسۆگەرە تۆی دەبڕێتەوە، کەچی ئەمەیان((........)) ڕەگی وا داکوتاوە لە ((........)) مسۆگەر بەرەو((........)) دەبات.
- «بەڕاستی وان بەرگرییەکا باش کرن. بەڵێ وان شیانا ڕێگرتنا هێرشا ئەنفالێ نەبوو. بە رقێ چەندی پشتا خۆ ژمە کرن و ئەم دگەڵ خۆ نەبرن و بە جهماین و کەفتینە بەر حەملا ئەنفالێ».
- ئـ. هـ وا چاکە ڕووی خۆیان کەمێک بە بەرگری کردنەکە سپی کردووەتەوە. نەک وەک شێخی چەمەری، بەڵان وا دیارە بەرگریەکەیان تەنیا لۆمان و ناودەنگی خۆیان بووە و بەس. ئەگەر بە ئاستەم بۆ میللەت بووایە ئێوەیان لەگەڵ خۆیان ڕادەپێچا. ئەمەش هەمان تاس و حەمامی خیانەتە و بڵێین و نەڵێین شایەنی پێشفیتنەیی و نەفرەتانن.

* * *

مانگەشەو سەر لە ئێوارە ڕا دیارە. لە جم وجۆڵی و هەڵس و کەوتی خەڵکە و پسکە پسک وچرپە چرپی دوو، دوو..و سێ سێی دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵی بەرو بازاڕ و شەقام و شوێنە گشتییەکاندا، لە ڕەنگ و ڕوو..و چاو تەژی تیشکی سۆزی بزبزۆکیانەوە ڕادەزاندرا: چینە ڕووت و ڕەجاڵ بڕاوو چەوساوەو زەرەرمەند و نەبەزیوەکان لە پێکۆڵی هەڵچوونی چنگ قژکردنەوە دانە و خواخوایانە:((
- یاڵلا. دەی لەوچاوەتانە» یان لێ بکرێت و تۆڵەی سەردەرێ و بەردەرێی تاوانە بێ حسێبەکانی ساڵەهای ساڵیان بکەنەوە.
لەگەڵ کازیبەی بەیاندا، وەک لەهەڵابدرێت و: یاڵلا لەخەو ڕاپەڕن بدرێت خەڵکەکە بەژێن و شێنەوە، گەورە و گچکە و نێرومێیەوە، بە گڕی پڕ لەهەڵچوونی سۆزی کوردایەتی سرفەوە و دوورە

بۆنـی بەزیـوی گۆردایەتیـی و ئاشـبەتاڵییەوە، لـە کووچـەو کۆلانـی گەڕەکەکانـی هـەر چـوار ئالـی شـارەوە، تـەرزی مێروولـە بـە گـۆڕێ وەربـوون. مەیدانـی حـەق و حسـێبی حەشـر و قیامەتـی ولاتـی شـامە و لـە ئادەمـەوە هەتـا ئەمـڕۆی حـازری بـە بتوونی،لە نێـو گـۆڕدا قیـت بوونەتـەوە. دەرزیـت هەڵبدابووایـە بـەزەوی نەدەکـەوت. ئـەوەی لـە خەویشـدا مابـوو بـە دەنـگ و سـەدای:

- بژی کورد و کوردستان. بژی کورد و کوردستان
- بمرێ قەڵپەی دوو باب. بمرێ قەڵپەی دوو باب.
- بژی ئازادی.
- بژی سەربەستی.
- بمرێ داگیرکەر.
- بمرێ گۆڕدەو و چەورە بەزیوەکان.
- بمرێ دهۆل دڕان و ئاشبەتاڵی.
- بژی ڕاپەڕینی سەرتاسەری نیشتمان.

تـەق و هـۆڕ و هـات و هـاوار و هەلـلا و هۆریـا و بـە سـەماکەوتنی هـەر سـێ چـوار گـەڕەک، ڕووی نەبەردیـان بێباکانـە و موشـتاقەوە لـە نزیکترین بنکەو قـەلا و قۆشـەنی بیسـت و سـێ (٢٣) سـاڵە چەسـپیوەی داگیرکـەران کـرد.

گورجـی بووبـووە پێشـڕەوی ڕاسـتەقینەی هـەزارە زیلەکـەی گەڕەکـی «بـاداوە» و «زراعـە» و»موهەندیسـین» و «ڕووناکـی». لـە کانگـەی گـڕی هەڵچووندا لای وابـوو تـازە ئـەو ڕۆژەیە لـە دیلـی و کارەکەریتـی و ناوماڵـی دەربـاز بـووەوە بـۆ حەمەڕەحیـم دەگوازرێتـەوە.

لـە نێرومـێ و منداڵـی فەراقـەوە، هەتـا پیـری بەسـالاچوو، بـە پـڕی و چـڕی و پانـی شـەقامی ((٤٠)) چـل مەترییـەوە، تەرحـی قۆپەنـە دەغڵـی

شین کەرویشکە بکات ئاوا دەجمجمان. تاکو لۆک لەنێوان چل پەنجا سەرکان لوولەی کلاشینکۆفێکی جاشە سادەکان دەبیندرا. قارەمەندی بە شەقرە و بەرچیغ و مەترەق و خوترە و دەستی والآوە، بێباکانە ڕوویان لە گەرۆمەی مردن و عاسی و سەخترین سەنگەری ستەم و زۆرداری نێو شار کرد.
ڕۆژی پێشتر داگیرکەران ئامەشۆی خەڵکەکەیان قەدەغە کرد و خۆیان بە چەکی هەمەتەرزی ئۆتۆماتیکی لەسەر ساختمانە هەرە بەرزەکانی دەوروبەری مۆڵگا گەورەکەیان قاییم کرد. کەچی هەژانی کورسییەکەیان دەست و پێی نەترەیانی ئیفلیج کردبوو. تیشکی دەربازبوونیان لەوپەڕی کزیدا بوو.
شالآوە نەپساوە و لە ژمار نەهاتووکەش هەترەشیانی چوواندبوو، سوریان دەزانی هێزی غەزەبی تۆڵەیە و هەرگیز لە مردن ناپەنگێتەوە. پشیلەش تەنگاو بکرێت و ڕێگەی دەرچوونی شک نەبات ناچار دەبێت پڕ بداتە قرتقرتۆکی غەنیمەگەیەوە.
لە دڵیان سەقادرا پاداشتی هەرە شەریفەکەیان تەینا پخ کردنە. بە هەستێکی دوو دڵی و پەنجەی لەرزۆکی سەر پەلەپیتکانەوە هەزارە زیلەکەیان لەسەربانانەوە شەلم کوێرم ناپاریزم دابەر. ڕستەی دۆشکە و بیکێسی و برێن و کلاشینکۆفانەوە، چەند کەسیان پەلەواژ کردنەوە و زامداریش هەر هیچ.
لێشاوەکە درزی شپرزەیی یان تێکەوت و ناوەڕاستی شەقامە سەرەکییەکەیان بەردا و بەملاو بەولا پەرتەوازە بوون. لە پەناو پەسارگان خۆیان گرتەوە. کەچی لە هێرشەکەیاندا بە ئاستەمیش نەسلەمینەوە. بگرە بەدەروونێکی پڕ دەغەزی گوڕترەوە، لەخۆڕ هەڵات و باکوور و باشوورەوە، بە کلاشینکۆفی سادەکانەوە،

تەڕدەستانە وەڵامیان دراوە و تاو نا تاوێکیش تەکانی هورووژمی چوونە پێش ڕشتر دەبوو.
گورجی دوای ئەوە یارمەتی لابردنی کوژرا و بریندارەکانیدا پڕ بە زار هاواری کرد و گوتی:
- کوڕینە بە قوربانتان بم. بەڵاگێڕتان بم دەخیلی دەست و بازووتان بم. نەکەن نەترە بەربدەن و عەزمتان برووخێت. ئەوانە دوا هەناسەیانە و ئەو تەقانەشیان نیشانەی ترسان و زراوچوونیانە. نیشانەی ئاو بە کون وەربوونیانە.
بە دەنگی حێل ترەوە:
- دەی لەو چاوەتانە، ئەمڕۆ ڕۆژی مێرانە، ڕۆژی شێرە کوڕانە. ڕۆژی غیرەت و چاوهەڵێنانە. ڕۆژی تۆڵەسەندنەوەیە. تۆڵەی باوک و دایک و براو خوشک و کوڕوکچمانە. تۆڵەی ناموسمانە. تۆڵەی وڵاتمانە تۆڵەی گوندو شارەکانمانە. تۆڵەی سەروەت و سامانمانە.
دەمێک بە سڕینەوەی کەفی لالغاوەکانی، کە بەهۆی قاییم قسەکردن سەری هەڵدابوو بێنی داو:
- دەی دەبەرێتان مرم هێرشیان لە پەناوە بکەنێ. هێرشێکی حوجەتی چاو نەترسانە هەتا بۆ بابەلبابیشیانەوە وا تەمبێ ببن تا لەژیاندا ماون نەتوانن کەڕەتێکی تر پێ لە ڕاستمانە خوار دانێنەوە و خاکی نیشتمانمان دوو بارە بەکیمیاو ئەنفال و زندە بەچاڵ و فەرهوودەوە گڵاو بکەنەوە.
هێرشەکە تەنیا بە کلاشینکۆف، بۆ سەربانە بەرزەکان و بەرگرییەکەش مان و نەمان و بە چەکی قورس و کاریگەرتر. کەچی ورەیان داهێزرابوو..و بە ماوەیەکی کەمی چوار سەعاتی هەرچی دام و دەزگاو بنکەی سەرەکی داگیرکەربوو. لە سەرتاسەری

شـار خـڕی گیـراو چـەک و تەقەمەنـی ئـەو هێزانـەی چەنـد سـاڵ بـوو شـانازییان پێـوە دەکـرا کەوتنـە دەسـت میللەتـەوە تەنیـا «مۆڵـگا»ی سـەر زل و خوێن ڕێژە گـەورەکان نەبێت هـەر توانایەکی لـە دەسـتیان هـات درێغیـان نەکـرد. هەرکـە ئاپوورەکـە زانیـان بـەم حاڵـە زەفەریـان هەرگیـز پێنابردرێت، لەهـەرلاوە شـاڵاوی بـە گوڕیان بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسـی شـار، کـە لێوەیـان نزیکبوو بـرد. لەدینیش بن لـە خۆێن نابن، پۆلیسـەکان زۆربەیـان شـەو گوێیـان بـەو ئینـزارەی دوو سـێ ڕۆژ پێشـتریان درا بوویـێ:« دەبـێ ((٢٤)) بیسـت و چـوار سـەعات دەوام بکرێت».نەدابوو پاسـەوانەکانیش بـە خوایشـتی حەزیانـەوە باڵـی مەیل و چاوپۆشـییان قـووڵ کـرد و بـێ ئـەوەی تەقـە لـە تفەنگیانـەوە بێت، چەنـد کەسـانێکی دەروون تـەژی غەزەبـی تۆڵـەوە خۆیـان گەیانـدە جبەخانەکەیـەوە.

گورجی لەگـەڵ وەجبـەی یەکەمـدا بـوو..و هـەر زوو چەکێکی بـە چەنـد مەخزەنـەوە هەڵگـرت.

* * *

ئێـوارە خـدرە لار و کەریمـە کـوڕ و چەنـد کەسـی تـری چاقـی و قاڵبـووی نێـو شـەڕ و شـۆڕ و گێلەوەژانـدا، مـاڵ نەمـا لـە گەڕەکـی «بـاداوە»ی سـەرەتای هەڵقوڵانـی ڕاپەڕینەکـە ئـاگادار نەکەنـەوە. لـە کەیـف خۆشـییان هەتـا شـەبەقی بەیـان سـووکناتییان نـەدا.

گورجـی زۆری هەوڵدا هەردووکیـان گلداتـەوە. کەچـی تیشـکی ئومێدی دوارۆژی سـەرفرازی لـە نێو سـکۆڵەکانی دڵیانـەوە جوقجوقانـە هەلەکـە سـەمەیان بوو..و.سـات لـە دوای سـات سـۆزی خەنـی خۆشـی لـە ڕەنگ و ڕوویـان پـەرەی دەسـاند. نـە خەسـەلە لـەو ڕۆژەی هەرکـە لـە ئاسـمانی باشـووری کوردسـتانی داگیرکراودا تەقیـەوە و لـە گوێـی ورد و درشـتی

گەلی کوردەوە زرینگاوە:

- یەکـەم: پڕووشـکی دەسـوەکەرییەکی تونـدو نەمرانـە لەناوچـەی خەباتـەوە بـەرز بـووەوە. دوو هـاو.. ولایـش.. کـوژران.

خدرە لار هەرزوو گوتی:

- بەڵێ زۆر ڕاستە.

گورجی خۆی پێنەگیراو و قسەی خۆی تێخزاندو:

- بریا بە بریایێ ئەوکات من لەوێبوومایە و پڕ بە دەنگم تلیلییەکی عەگیدانـەم بۆیـان هەڵدابووایـە!

- کەچـی ناوچـەی ڕانییـە هـەرزوو مەردانـە وەڵامـی داوەو بـەڕووی خەڵکانـی بێ ئەنـواو ستەمدیدەی سەرتاسـەری کوردسـتانی تەقاندەوە.

نۆرەی کەریم هات و گوتی:

- ڕۆژی پاشـتر خۆپیشـاندانێکی گـەرم و گوڕ و جۆشـدار و مـاوە زۆر کـورت لـە شـاری هەولێر سـەری هەڵدا.

گورجی دووبارە بەرسینگی قسانی ساند و گوتی:

- ئەوجا لە شاری سلێمانی بەپەرێز پاگژی دوژمنیان قاودا.

خدرە لار نۆرەی قۆزتەوەو:

- کوفر دەوام دەکات. بەڵام زوڵم نا.

- زۆر ڕاستە.

دڵنیایان کرد:

- هاندانـی گەڕەکێکـی تـر بەرپەرچمـان دەداتـەوە. ئەگـەر نـا ئێمـە لـەو سـاتە دەگەڕێیـن شـەو لـە خزمـەت جەنابـت دابیـن.

بەمـە لـە داواکـەی سـاردبووەوەو بـەو پـەڕی ڕەزامەندییـەوە سـەری متـی لارکـردەوە.

بۆ بەیانی دوای دهۆڵ دڕانی موڵگا سـەختەکەی داگیرکەران و ناسینی

خائینە سەر زلەکان و بەندکردنیان تاکو دڵی بەشەو نەمانەوەیان گەرد نەگرێت ماوەیەک بەم گفتوگۆیەیان بەسەر برد و:
- دوژمنی داگیرکەر بەهۆی شەڕە وێرانکارییەکەوە زۆر لەخۆی بایی بووبوو.. و خوێنی غرووری بەری چاوی گرتبوو..و لە هەموو دەراوێک ئاوی نە دەخواردەوە و لەپێ و دانی خۆشیدانەدەسەکنا.
- بەڵێ دەیویست پێ لەقەدەر بەرەی خۆی زیاتر ڕاکێشێت.
- تایبەت لە ڕاست دراوسێیە هاورەگەزەکانیدا خۆی بکاتە نێرەکەری عوزێر پێغەمبەرو بە کەیف و ماشای حەزی دڵییەوە بەسەریاندا بزەڕێنێت.
- ناحەقیش نەبوو لە شەڕە خۆتڕێنەکەدا یارمەتی لە خانەزاکانییەوە، بێ حیساب بەسەریدا دەباری و بیست و چوار سەعات دیاردیی ئافەرینیان لێدەکرد و دەستی تاندان و شانازییان لە پشت دەداو:
- لەو چاوەتە ئەمڕۆ ئێمە لە جەنابت بترازێت کەسی دیکە لەم ڕووەوە شک نابەین، دڵسۆزانە بەرگری لە خاک و نەتەوەکەمان بکات. بەبێ درۆ و مەدەلایی یەوە سەروماڵمان لەژێرپێی پیرۆزت دایە.
- هێزی جیهانیش بە زێن و شێنەوە ملی تەوازوویان بەو پەڕی شەوقەوە بۆ لارکردەوە.
- بەڵێ بە فرۆکەو دەبابەو هەموو جۆرەچەک و تەقەمەنی و ڕەنگ کێشانی پەلاماردانی دڵسۆزانە ئامادەو هاریکار بوون.
- ئەوسا گریمان داوای ئاوەڵکراسی ناموسیشیان بکردبووایە، لەبەر ئەوە پێویستیان پێبوو دەستیان هەرگیز لەبەردەستی هەڵنەدەدا.
- ئەوانە بایان خستە کەوڵییەوە و لای وابوو لە جیهاندا هیچ کەس سەری هەڵنەداوە و بەری ملی بگرێت.

- بیری بە هیچ چەشنێک بۆ ئەوە نەدەچوو:«
- لە هەموو هەوران باران نییە».
- ئــەوەی ئــەو مرخــی لێخۆشــکردبوو قەبرخــەی بەرژەوەنــدی زل هێزەکانــی دەگرتــەوە.
- یەکگرتنی دوو دەوڵەتی یەک ڕەگەزیشی دەچووە پاڵ. ئەوانیش بە مردنی خۆیـان دەهاتنە بەرێ نـەک بـەم تەرحـە زەڕینە.
- هەرکـە قورگـی بەکامـی دڵـی خـۆی بـۆ زەڕینەکـە خـۆش کـرد وایـان لەقەوچـە داوە ئەژدادیشـی پـێ تەمبـێ بـوو.
- وەک مریشـکی «خەرابـەدراو»ی پەڕیـان پێـوە نەهێشـت و ئابـووپ گـەڕاوە سـەر حولـم سـێی جـاران و دەسـتی بـە جارێـک لەقونگـی خـراری شـانازییەوە پچـڕا.
- تـازە هەتـا لەژیانـدا مـاوە، بەخەونـی شـەوانیش ناگەڕێتـەوە فایـدەی جـاران.
- گـەرووی زەڕینەکەشـی واگیـرا هەتـا حەزرەتـی عزرائیـل چـۆک لەسـەر سـینگی دادەنێـت نابێتـەوە.
- لەرینـی کورسـییە چەنـد سـاڵ و حەیـام چەسـپیوەکەی کـەوا بـە مەزەبـی عەلـۆ.. و جەلـۆو تەڕلووسـانی دەوروبـەری عەمـر نووحـی دەبێـت، بەخەیاڵیشـیاندا گـوزەری نەدەکـرد، کەچـی وا هـەژا لـە دڵـی کەسـانی عەقـڵ قـوڕە و عولعولیـش سـەقا درا، هـەر بزانـە بـەرەو کۆنـدڕی نەمـان سـەرنخوون بـووەوە،
- لـە بەراییـدا جاشـە سـادەکان، هـەردوولا «هەشـت نـۆ دە سـاڵ باوییـەکان» و «چـل پەنجـا سـاڵ ڕچەڵـەک لـچ بـووەکان». کەهیـچ کات و ڕۆژێـک ڕسـتەی نامـووس و دیاردییـان لـە مسـتە خۆیـان نەبـووەو بـە گوێـرەی ویسـت و حـەزی داگیرکەرانـەوە شـەقاویان نـاوە و بـە

هەمـوو توانایانـەوە بەرپەرچـی جـم و جۆڵـی نەتەوایەتییـان دەداوەو هەسـتی نیشـتمانیان لـە ئەژدادیشـیانەوە، لا نامـۆ بـووە، بـە هەژانەکـە خراپەکارییـە، لـە ژمـارە بەدەرەکانـی چەنـد سـاڵەیان هاتەوەیـادو دێڵـە حیتانـە ڕابـەری کوشـتن و تێکـدان و سـووتان و کاولـکاری بـوون.
- مسۆگەریان بوو: ڕوویـان «هیربار»ی «سفر» نییـە بە «سـەفارچی» یان سپی ببێتەوەو تووشـی کۆنەڕەشـەی تۆڵەنەبنەوە.
- هەرنـا منداڵـە بـاوک و دایـک کـوژراوەکان، ژنـە بـراو مێـرد و کـوڕە سـەربڕاوەکان، خـاوەن زنـدە بەچاڵکـراوەکان. خـزم و کەسـی کیمیاگرتـووەکان. جوتیـارە گونـدو ڕەز و بـاخ سـووتاوەکان، بـە نوێـژی نیوەڕۆ. پێشڕەو، نیشـاندەر بوونـە. بەپلووکـە بـەردان چاویـان دەڕژێنن.
- زۆر ڕاسـتە، گـەر گیانیشـیان دەربـاز بێـت وەک سـەگی خوێـڕی هەڵەتەیـان دەکـەن و وڵاتییـان هەتـا ڕۆژی قالـو..و بەلاێـی لێدەبێتـە داخـی عـەزرەت و کەسـەرەوە.
- بۆیـە ورد و دروشـت و زەینـدارو کـەم فامییـان حسـیان پنچکێـک لەدەوروبـەر شـک نابردرێـت دەسـتی دەخیلـی پێـوە بگـرن.
- ڕووح لـە جێگایەکی قاییمـەو نایەتـە دەرو بـە دڵـە مەلـەرزەوە سـایەد و چاوەنـوارِ بـوون. ئەمڕۆ نـا سبەی وەکات گیرمیزیـان لێدەبڕن.
- لەبـەر بۆگەنیـان لـە دوورەوە دەناسـران و کەسـیش لـەو بارەیـەوە بەزەیـی یـان کـەم و زۆر پێنایەتـەوە.
- چەشـنی چەنـد سـپیانێک لەنێـو «غـەر» یێکـدا گورگیـان بەنـاو وەربووبێت، وا مشـەوەش و چاشـمیش بووبوون، ئاگایـان لەخۆ نەمـاو کەوتنـە نێـوان چـاڵان و ماڵانـی ناچـاری تەکبیرکردنـی:«
- چ بکەن چ نەکەن».
- پاش چەند ڕۆژان بەپشوو قانگدراوییەوە دەیان پرس و ڕاوەرگرتن

و مشـوورخواردنێکی زۆر و بەردەوامـی لەگـەڵ کارزان و دنیـا دیتـان خۆشەویسـتی گیـان لەبەرایـی هەمـوو شـتێکە، تاقـە بارێکـە ڕێگایـەک پێشنیار کـرا، کـەوا لەگینـە بەسـەلامەتی لێیدەربـاز ببـن، ئەمـە یەکسـەر گـوڕی وەبـەر لینگـی زاخیانـی وەنـاو بەوپـەڕی چوسـتی و شـەوق و ڕشـتییەوە، ڕووی هەڵوێسـت و چەکەکانیـان لەمێـژووی ژیانیانـدا بـە پێچەوانـەی ئەوەنـدە سـاڵەیان لـە دەریـای خیانەتـەوە وەرچەرخێننـەوە. ئەگەر نا گورگ و تۆبەیان نەگوتووە:
دوای ئەوە بەڕووی یەکتر تریقانەوە خدرە لار هەڵیدایەو:
- خوا یەکە و دەرگا هـەزار بەبیسـتنی هەژانەکە هەستە لـە بارچووەکە، سـەرلەنوێ لەبنەبانـی هەرچوارپارچـەی دڵـی ئـەو هـەژارە بێکەسـانەی گەشـت و گـوزراو بـاڕو مەلهـە و((........)) ی سـانەوەی هەندەرانیـان تەنیـا پەتـی سـێدارە و بەنـد و کونەفیـرار و کـوڕە ئەهـا.. عـەرەب هاتـن بـوو زیـت بـووەوەو ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ، سـات لـە دوای سـات بـرەو..و گەشـەی دەسـتاند.
کەریمە کۆر باگوێداوەو گوتی:
- لەوێنـەی ئەسـپێکی کەحێـل و غـوردی تێرشـینکەی نێرینـەی بەهـار لەنێـو پیشـتیردا پێکـۆڵ و پرمـە پرمـی دەرەوە بێـت و هـەردەم تانـی هەڵچوونـی وەبـەر جەسـتانی دەدا.
- کەسـانێک چییـە لەخـۆ گـف کردنـەوەی دەسـت هەڵێنانـی تۆڵـەدا خـۆ نەگنخێنێـت و گـورگ هەمـوو ڕۆژ بەسـەر «سـەدە»ی «مەحمـوود بایـز»دا نایـەت درووشـمی بـوو.
- گڕی هەڵچوونی هەر دوو هێز:«
پـاک و پیـس و جـاش و بـاش» بـێ پروپاگەنـدە و گاڕدان و درۆ زل زل و بـە بارەکانـی حزبـە، بەزیوەکان وبـێ هـات و هـاواری جلـەوداری

زۆر و بۆری، لە یەکتر دابڕاوەکان مڕبەندانە یەکیان گرت و بەکەف و کوڵ و گڕی سۆزی ڕاپەڕین، بەڕووی ستەمکار و داگیرکەرانەوە سۆرەسۆر لەڕووان خۆی دەنواند. ئەوپاتە مەزنە لەبارە هەرگیز فت ناکرێت و دەست لە تۆڵەی ئەو تاوانە بێ حەد و حسێبانە سل ناکرێت و نابوردرێن.
- لەکەسانی بێ سەوادو شەقاو..و دوو زەینان بەدەرکەسی دی باوەڕی بە گەشتکەرانی کەنار دەریایان نەمابوو جارێکی تر جلەوی ڕاستەقینەی هەستی کوردایەتی بەتەرزی مەبەست بگرنەوە دەست.
- گریمان بشبێت لە ساڵی کورد قڕان و کوردستان وێرانێی تایەن چەلەنگتر نابێت.
- کەچی لەبەر پیرۆزی بووژانەوەی هەستی و ڕووژانەکەوە، لەناخی دڵسۆزانی میللەتەوە قیڕو بنێشت. سادە و داغمەدار لێکیانداو ئەمانیش گەڕانەوەو سەر کورسییە خۆشەویست وپایە بەرزەکەی ساڵانی شەست و حەفتاکانەوە.
داغمەدارەکان کە دەگەیشتنە هەر شاروشارۆچکەیەکی داگیرکراو کار لە کار ترازابوو..ودەلحاز کلیلی ئازادییان هەرزوو، بەداو..و دڵ لە مست دەنراو دەچوونە سەر خوانێکی حازرو بزر.

* * *

دوو سێ سەعات دوای گرتنی گشت ڕێکخراوەکانی بەعسی داگیرکەری نێو شار و کوشتنی عەدەد ڕەشاشەکانی سەربانی مەنزوومەی قۆشەنی جەور و ستەم دەهۆڵی داگیرکەران، بۆ یەکەمجار لە نێو پایتەختی کوردستان درا.
لەژووران چەند داگیرکەری نەناسرا بەڕەنگی نیوە مردوویانەیان پەلکێش کردن.

جاشـە سـادەكان، نەبـادا پرتۆخـی نهێنیـان، تـا رادەیـەك سـرپۆش بـوو، هەڵماڵدرێـت و ببنـە پەرۆپیسـی ئافرەتـان دەگەیشـتنە هـەر ژوورێـك لـە ژوورەكانی ئەمن و ئیستخبارات و مەنزوومەوە، چی ئەوراقی بوو زوو ئاگریـان تێبـەردەدا و خۆیـان لەناخـی میللەتـە حارگرتووەكـە هەڵدەسـوی و:«

- پێویستە ئاسەواری بەعسی دكتاتۆر و داگیركەر ببڕینەوە».

خەڵكـە ورووژاوەكـە مەرامیـان وابـوو هـەر ئـەودەم بـە داروسـت و پێلەقـەی ڕەجمـی تۆڵـەوە پێشـوازیان بكـەن و«

- قازانجی زۆرە - تۆڵە بە تۆڵە!»

كەچـی گورجـی ئاگری لەهەنـاو دابـوو..و بـە هەمـوو دەنگییـەوە نەڕانـدی و:

- ئـەوەی دایكـی قاحپەیـە و ژنەكـەی حیـزە و بەخۆشـی دەیووتـە نـەك كوشـتن بگـرە تفێكیـان لێـدەكات.

جەماوەرە گڕگرتووەكە عاجباتییان پێهات و بە هەڵچوونەوە گوتیان:

- ئەوانـە خائینن، خائینیش بەهەموودین و مـەزەب و یاسـایەك كوشـتنی واجبـە.

هەر زوو پێش ئەوە قسەی تر بكەن گوتی:

- قسـەكانتان لـە كونـی كارك ڕاسـتترن پاداشـتیان تەنیـا كوشـتنە، بـەڵام تـازە بوونەتـە دیـل و پێویسـتە یەكەیەكەیـان بناسـین و بزانیـن كێـن و چ كارەن و تاوانیـان دەرحـەق ئێمـە مانـان چییـە ئـەوكات بـە ڕێگـەی مەحكەمــەوە، بـە پەتـی خیانەتـەوە هەڵواسـرێن.

- زۆربەیان لە ناخەوە سەلماندیان و گوتیان:

- بۆچوونـی پلكۆكـە زۆر لەجێیـە و بەعەجـە مەرگـی و لەسـەرەخۆوە بكوژرێـن.

دەنگێک لەناوەڕاستی ئاپۆراکەوە بەرز بووەوە و گوتی:
- ئەوجا کێ ئەم گورگە دەم بە خوێنانە دەناسێت!؟.
گورجی هەر زوو پێش ئەوەی بڵێن:«
- بەهەویە». بەهەلیزانی و بۆ ڕیسواکردن گوتی:
- دۆستە ئازیز و خۆشەویستەکانیان دەیانناسن.
- بلەز و حەیرمانەوە گوتیان:
- پیمانناڵێیت، دۆستەکانیان کێن!؟.
ئەمیش ئەم پرسیارەی لا گرنگ بوو، وەڵامی خێرا دانەوە گوتی:
- سەلاو لەعەقڵتان هەتا هەنووکە نازانن شێخەکانن!.
- کەریمە کۆر بەم وەڵامە زەقە و جورئەتدارەوە کەوا قەبرغەی کەسانێک دەگرتەوە، هەتا ئەمڕۆی حازری هیچ کەس لەو شارە قەوغەیەدا تاسای خۆ لەقەرەدانی نەکردووە. بافرە دایگرت و هەتا پتر بۆ جەماوەرەکە واژی بکاتەوە ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد:
- ئەگەر زەحمەت نەبێت ناوی یەکێکیانمان پێ بێژە.
لە نیازی گەیشت و کەیفی پێهات و لەلایەکی دیکەوە ئێ... هـ بەڵکو لەم گەرماو گەرمەی وروژانی هەستی نەتەوایەتییەدا، باری ترس و خەجاڵەتی کۆمەلایەتی توورِ هەڵدەدەن و دەستی تۆڵە لە گەورەترین خائین وسەرەتانی میللەت بووەشێنن، بێ سێ و دووی دڵە مەلەرزە و دەنگی زۆر بەرزەوە گوتی:
- ئەحمەدە گولەی شارەکەمان.
گەورە و بچووک لێکرِا، لەتاک و لۆکی کەسانی سیاسی و دنیا دیتە بترازێن وێڕای فسبوونەوەی هەڵچووەکەیان تەپەسوڕیان بەسەردا زاڵ بوو... و کەوتنە گێژەنی دوو دڵیەوە و هێندێک قوڕیان بەدەمدا دراو هێندێک لە دڵیان سەپابوو گریمان واشبێت لە قەوامی ئەواندا نییە

پەنجەی بە ئاستەمیش لەم ڕووەوە بۆ درێژ بکەن.
ئاخێکی بێدەسەڵاتییان هەڵکێشا.
چەند کەسانێکیش هەتا لەکۆڵە خۆیان بکەنەوە هەڵیاندایەو:
- ئەوجا ئەو چۆن بە ئێمە دێت!؟.
کەریم نەیتوانی ڕوو بەڕووی خەڵکەکە زار لەم بارە بکاتەوەو بێدەنگیشی لا تاوانبوو، ناچار لابەلا: زۆربەیان لێی حاڵیبوون:
- بۆ.. خۆ ئەو لەو موعەسکەرە زۆرو زەبر بەدەست و خاوەن چەک و عتاد لە ژمارە بەدەری ئەمڕۆ بەدەستمانەوە ڕووخا بە هێزتر نییە. گورجی هاروهاج بوو، کەوا بە چەند سەعاتێک قۆشەنی چەسپیوی چەندین ساڵەی دکتاتۆری وڵاتیان لە بن هێنا، کەچی دەستی غیرەتیان لە ئاست ئەحمەدە گولەی خەفیەی بەعس شکاوە، لە هەوەڵەوە دەیزانی لە تواناشیاندا بێت شەرمی باری کۆمەڵایەتی، لە ئیجادەوە یەخسیری ژێرینە و هەرگیز ڕێگەیان نادات.
کەلەمە، تەمای برا ئێ. هـ بەڵکی خوایە لە ئاست دەستە ڕاستەکەی سەری کەوێت و گوتی:
- هاتنی ئەوتان لە توانادا نییە، ئەدی سەیدە سۆرەی خوبزەی؟.
خەڵکەکە هێندێکیان عەقڵیان، بەلای ئەودا هەرگیز بڕی نەدەکرد، لەو جۆرەکەسانە بێت و پەیوەندی لەگەڵ ئەمن و ئیستخباراتەوە هەبووبێت و بە بوختانیان قرساند و بەنابەدڵییەوە بەرپەرچیان داوە و گوتیان:
- ئەوجا ئەو دەیانناسێت؟.
بە پێکەنینێکی حێلی وا لە دوورەوە دەبیسترا گوتی:
- لەبێ خەبەران کەشکەک سەلاوات.
زۆربەیان بە حەپەسانی گومانی نێوان ڕاستی و درۆ.. وەدایانە بەرنەزیرۆکان، تاوانی بە کوشتدانی «جەمال» و»چەتۆ» و هاوڕێکانیان

لەیاد پەڕیبوو...و:

- پیاو بۆخوا بڵێت: سەیدە سۆرە و ئەو کارە قەڵپەیان نەگوتووە.

- ناوەللا ئەو ئیشە لە ڕدێنی ئەو پەپوولەیە ناوەشێتەوە.

- هەنووکەش لەگەڵدابێت، ڕۆژ نییە شێت و هاریان لەماڵ چاک نەبێتەوە.

- کوڕە بڵێین و نەڵێین بەرماڵی لەسەر ئاودەگەڕێت: چۆن لەترسی خوا دەوێرێت تخوونی ئەو نەوعە کارە بێدینە بکەوێت!.

- بۆیە هەموو کەس ئەو سوخەتەی هەبێت ئەو هەر ناو.

گورجی لە هەڵسوکەوتی بەهۆی مێردەکەیەوە، پێش سوێند خواردنەکە لە ڕێی و پێکەوەی دەناسی. بۆ دەرخستنی پرتۆخی بەخۆی نەوەستاو گوتی:

- سەلاو لەعەقڵتان!. ئەدی هەر ئەو نەبوو دوونێ بەفیتی ئەحمەدە گولە و عەزە چاو گازی هاوڕێی چوار پێنج پاڵەوانی دەشتی هەولێری خستە داوی ئەمن و ئیستخباراتەوە.

لە ئەوانەی زۆریان پێخۆشبوو خدرە لار بوو..ودەلحاز بەشەوقەوە تێیهەڵکرد و:

- عەقڵمان ئەو عەقڵەیە هەر زوو بە ئەنقەست شتی ئاوا لەبیرە خۆمانی دەبەینەوە. بۆیە هەتا ماوین نابین بە هیچ.

گورجی بەڕوویدا زیت بووەوە و:

- لەبابی منت کەوێت، بەڕاستی بنی قسەت هێنا!.

- هەتا چاک و خراپ لەیەکتر هاوێر نەکەینەوە قەت بەڕۆژی خۆمان ناگەین.

- ناوەلا هەتا..ئاوا..تووڕ تووڕە بەجۆبین و خۆمان خەشیم هەڵبێخین هیچ.

« هەتا شۆڕشمان لەژێر. ڕکێبی ئەو شێخە بەکرێگیراوانە نەترازێینین

و یەکە یەکەیان لەکوردستان بەدەریان نەکەین قەت مەرام ناپێکین».
گورجی کاتی خۆی ئەمەی لە زاری حەمەرەحیمی بەر گوێ کەوتبوو.
لەبەر تەقییەکردن لەم ساتەدا لە دڵەوەی گوت. قاری زۆر لێخواردن،
کەچی هیچی لە دەست نەدەهات.
لەهەردوو بەرەدا دۆستی ئەحمەدە گولە و سەیدە سۆرە و نەیارانیدا نیاز
وابوو لەم ڕووەوە مل لەبەر ملی یەکتر بنێن، کەچی ئەوانەی ڕیشیان
لەبەر هەتاو سپی نەکردبوو..و سەریان لەبیروبۆچوونان دەردەچوو
دەیانزانی هێشتا پلەی زانیاری و ڕۆشنبیری و فیکری میللەتەکەیان
تەواو ماتەی نەداوە هەتا بە گفتوگۆی کون فەیەکونێکی بەڵگەدار بۆ
یەکتر داوەرێنەوە، ماوەیان چیتر نەدان و هەرزوو پێش ئەوان زاریان
کردەوە گوتیان:
- ئەرێ پێمان ناڵێن: بۆ ناسینی ئەو درندانە چ کارمان بە ئەوانەی
گوتران هەیە!؟. یەکەیەکەیان هەویەیان لێوەرگرین باشتر نییە؟.
ئەمە لەوغەکەی بەیەکجاری بن بڕ کردو گشتیان بەسۆزەوە بۆی
داوەرانەوە.
هەرکە گورجی زانی ئەوانەی هەتا دوا هەناسەیان بەرگریان کرد:
- سالم عەبدولڕەزاق»ی بەڕێوەبەری ئەمن و «عەلی عجل»ی
بەڕێوەبەری ئیستخباراتن» دەلحاز شاگەشکە بوو..ولە خۆشیان هەتا
دەنگی لە بەردابوو هەڵهەڵەیەکی درێژی بووکانەی لێداو بە هەشتاوییەوە
بۆ کن سالم خشی و لەبەردەمی قیت چەقی و کاتێک چاوی بڕییە
دورچاوی لای وابوو لە ژیاندا تووشی هیچ نسکۆ و کارەساتان نەبووە
و هەنتۆب تلیلیلیەکی دیکەی تێهەڵکردەوە و گوتی:
- دنیا هەروەکو تاجێکە هەردەم لەسەری تەرسێکە!.
لە خەنیان گەلێک پێکەنی و جاڕووی گفتی تێکرد و گوتی:

- دەزانیت من کێم؟.
لەدەست بەسەرگرتنەکەیدا سێ چوار جار دواندبووی و چاکی دەناسی، کەچی چەندی کرد و کۆشا زاری بۆ نەپچڕا. دوای سێ جار بەجاوەجاو و سەرلەراندنەوە گوتی:
- نەخێر.
بە هەموو دەنگییەوە:
- دەگ لە دوو خمێت نێن، ئەدی بۆ من تۆ دەناسم.
بەسەربادانی غەزەبەوە گوتی:
- ڕۆڵە من دایکی پاڵەوانی دەشتی هەولێر و گوندی «ب»یمە. «جەمال حەمەڕەحیم» ماوەیەکی زۆر لە ژێر چەپۆکی کوشندەی تۆی وەحش و کەلبە تیژئەشکەنجە و ئازاری کێشا و ئەوجا هەتا گیانی سپارد، بۆ ئەوەی سوودی لێوەرنەگرن قڕوقەپی کرد. لەبن کۆت و زنجیردا بێزی نەهات ئەلفازی لەم بارەیەوە بگەڕێت و حەزی گڵاوت داکەوێنێت.
دوای بێندان و پشووێکی سەرفرازییەوە بە گوڕاح خۆشییەوە گوتی:
- ئەوجا خۆ زانیت من کێمە؟.
گورجی لەسەر هەڵی خۆی بازنەدا و گوتی:
- قرۆکەتێ کێوە دەچیت مەحکەمەش نەتتۆپێنێت....
- لەگەڵ ڕاگرتنی فەقێیانەی کراسە چیتە ئەستوورە لەخم دراوەکەی بۆی و گوتی:
- من بەم کلکە ئەنگوچکانە دەتخنکێنم.
خۆی زێتر لێ نزیک خستەوە و بە بزەیەکی لەخۆباییەوە گوتی:
- بە هەموو باوەڕ و مەزەبێک حەق وایە لە تۆڵەی کوشتن و ئازاردانی ڕۆڵەکانمان بە دەستی چەپەڵی ئێوەی دڕندە و شەلفەتیژ، سەراوپێش بە دارێ وە بکرێن و بەگاز گۆشتتان لێ بکرێتەوە، بەڵان ئێمە نەئێوەی

دەم بە خوێنین و نە سادە و داغمەدارە بێویژدان و هەڵوێستەکانین لەو چەشنە تاوان و کارە دزێوانە، نەسەنگرێینەوە.
هەر ئەودەم واریقاتی جەمال و چەتۆ و هاورێکانیانی بە دەست هەردوو بەرێوەبەر بۆ خەڵکەکەی دەور کردەوە.
گورجی هەرکە دیتی دیلەکانیان هەتا ڕۆژی خۆی لە شوێنێکی تایبەت بەند کران و پاسەوانیان لەدیار دانان، دڵی داکەوت و یەکسەر بەرەو خانووەکەیان، کە شەو و ڕۆژ مەراقی دیدەنی بوو گەڕاوە و بێ پەردە بە حەوشە کەوت.
ئافرەتیماڵەکە چاوی پێکەوت، کلاشینکۆفی لەقەد و تا ئەو ساتە سێ یەدەکی تەقاندبوو، یەکێکی پڕ لاما بوو دڵی ڕاجفری و ڕەنگی پەڕی و ئەلفازی بە چاک و خراپ نەگەڕا.
بەبێ سڵاو ماوەیەک لە حەوشەو بەرەکە ڕاماو و تەزووی شادی بە نێو دەمارەکانیدا مێروولەی کرد. نە خەسەلە بەچاو دیتی باخچە و دارەکانی وەک جاران خزمەتیان پێوە دیارە، ڕووی دڕدۆنگی تێکرد و گوتی:
- کوا. پیاوەکەت؟.
ژنە باریکەلە و خوێن شیرین و سپییات، بە پرسیارەکە لێی حاڵیبوو..و بە جاوەجاو گوتی:
- لە بەیانییەوە چووەتە دەرەوە و نەهاتووەتەوە.
بێ سێ و دووی پەردەوە گوتی:
- دەزانم لە ترسی قوونی خۆی هەڵاتووە.
ئافرەتەکە زاری بووە و گوتی:
- دەفەرموو. وەرە ژوورەوە.
بە گرژییەوە:

- پێویست بەفەرموو ناکات لە هەنووکە زووتر نییە خانووەکەمان چۆل دەکەن.
هەرکە دڵنیابوو کێیەو خۆشی و ترشی بە ملیدا هات لە بەری بپاڕێتەوە و:
- پلکێ چاوەکەم لەو دەم و دەستە، بەبێ پیاو چۆن چۆل دەکرێت.
بە هەڵچوونەوە:
- دەڵێم چۆلی دەکەن و بڕاوە.
لەبەری مردو سۆت و:
- پورێ چاوەکەم چەند ڕۆژێکی کەم مۆڵەتمان بدە هەتا بتوانین ماڵەکەی بەڕێکی تێک بنێین و خانووێکیش بدۆزینەوە و بە پەند نەچین.
لە کەلی شەیتان دانەبەزی و بە دەنگی غەزەبەوە گوتی:
- دەڵێم چۆل دەکەن و زیاتریش.
چارەی نەما و بە حەز و سۆزەوە پڕی دادەستی و خزمەتی خانووەکەش سەربار دڵی نەرم بوو..و گوتی:
- ئەوا لەبەر خاتری پرچی جەنابت و. ویژدانیشتان لە ڕاست خانوو..و باخچەکەمان زندوو بووە، نەک لەبەر گەمبۆڵە خائینەکەی مێردت، پاش حەوت ڕۆژی تر دێمەوەو دەبێ چۆلتان کردبێت.
پێکەیفدار بوو..و بە بافرەیەکەوە گوتی:
- باشە بەسەر هەردوو چاوم.
- ئەوەشت پێ بڵێم: نابێ دەست لە هیچی خانوو..و حەوشەکەش بدەن.
سەری ڕەزامەندی بۆ دانواند و گوتی:
- شەرت بێت لە شەرتی خوا هەتا هەنووکە هیچی نوقسان نییە، کە بەخێر گەڕایتەوەش ئەوهات تەسلیم دەکەم.

* * *

زانا پێش ئەوەی خانووەکەیان بەتاڵ بکرێت گەڕاوە زۆر نەمابوو لەگەڵ «پەخشان» ی خێزانی «زرار مەولوود»ە جاش و ڕەفیق حزبی لە ترسانا شاری بەجێهێشتبوو و تێک بگیرێت و بڕو بزگوڕیان تووڕ هەڵداتە دەرەوە، کەچی هەرکەلێی بەرگوێی کەوت:

- پلکە گورجی هەتا هەژدەی مانگ ماوەی داینە.

هەتا ئەو ساتە لای وابوو کەسی لەئەنفال دەرباز نەبووەو لەشوێنی خۆی سینگ ئاسا چەقی و تەزووی خۆشی لەژێر پێی پەیدابوو. وبەختۆکە لە تۆقی سەری دەرچوو.

پەخشان هەستی بەپشوو سواری و ڕەنگ پەڕیی کرد. کەچی هەنجەتەکەی نە دەزانی، کاتێک سەربردەکەی وردو باریک بۆ دەور کردەوە لە خۆشییان زۆر نەمابوو لەبەردەمی سوسکەیی هەڵپەڕی و بەلەزەوە گوتی:

- هەر بەتەنیا بوو!؟.

- بەڵێ.

دڵی ڕاچلەکا و باوەڕی هات باوکی شتێکی بەسەرهاتووە. بەوپەڕی خولق خۆشی و ڕەزامەندییەوە، پاش ئەوەی بڕیاریدابوو ئەگەر دنیاش بێتە ڕجایێ تاکو کەل وپەلیان خڕ هەڵنەداتە دەرەوە و دانەنیشێت و:

- مادام مزگێنی دایکمت دامێ هیچم لە دڵ نەماو فەرمان فەرمانی ئەوە و من هیچ نیم.

کاتێک دووراو دوور چاوی بە نەبەز کەوت هەر وەختا بوو: دوو باڵی سەرفرازی لێ بڕسکێت. مەزەندە وابوو تەنیا دایکی قوتار بووە. لە بەرایییدا ئامێزی خۆشی توند لە دایکی وەراند و بەرزی کردەوە و دەست ماچ کردنیش هەر هیچ.

لەگەڵ نەبەز خراپتر. بەبیستنی کارەساتی بنەماڵەکەیان هاروهاج بوو..و

چەند ڕۆژ لەسەرچاوکەوت و زۆرە زۆر دەگریا. نە خاسمە هاواری ئافرەتەکان بۆ باوکی بێدەسەڵات و پرزە براویی.. پێشتر بیری بۆ ناوەرۆکی ئەنفال وا دەچوو چەند پیاوێکی گەنج لە سێدارە دەدرێن و ئەوانی تر ماوەیەک دەگیرێن و بەرەڵلا دەکرێن. ئەو ماوەیە دەرفەتیشی بۆ هەڵنەکەوتبوو، لە ناخەوە تا رادەیەک لەسەر وەسیەتەکەی باوکی:

- ڕۆڵە دوژمنی بنەماڵەکەمان، لەمەودوا، نە عەولا ئاغایەو نە بەعسە و نە جاشە. تەنیا شێخ و سەفین و شوانە.

ساردبوو بووەوە و ئەو گوڕ و زەوقەی بەرایی نەمابوون، کەچی بەکارەساتەکە لە دین دەرچوو. ولای وابوو هەتا ئەوانە لەژیاندا نان دوو لەت بکەن میللەتی کورد حاڵی لەئەمڕۆ چەلەنگتر نابێت و گریمان هەوڵیش بۆ تۆڵە نەدات لە توخمی ڕووتان دەتۆرێت.

سوێندێکی مزری پێدادا و گوتی:

- وەڵلاە ئەگەر گیانی خۆشمی لەسەر دانابێت، بە هیچ شێوەیەک لە جێبەجێ کردنی وەسیەتەکە بەقەدەر توانا قسوور نەکەم.

بەسەربادانی قارەوە:«

- میللەتێکی بێ هیرو یەغبارمان هەیە. گورگانی خۆیی کەلبەتیژترن لە گورگی داگیرکەرانەوە».

لە دڵی دایکی بووە مەراق و کەم و زۆر هیچی لە سەفەرەکەی بۆ باس ناکات بە ڕوویدا تەقییەوە:

- ڕۆڵە ئەوەندە وەختەی لەو دیو بوویت چت بە چ کرد؟.

بە ساردییەوە هەر ئەوەتە بەرگوێی کەوت:

- نەخێر.

لە دڵی گران وەستاو بەتەوسەوە:

- ئەدی بۆ تەوەنووس چوویت؟.

دەیزانی مردەی چییە و ناحەقیشی نەدەگرت، کەچی جارێ نیازی وابوو بەم جۆرە لەگەڵی بدوێت. جا وەڵامی بداتەوە.
- دایە ئەوانە لە ڕاستی ئێمە چەند مەغرور و لەخۆبایی بوون!
بە قسە گۆڕینەکەی تەپەسوڕی بەسەرداهات و نەیدەزانی هۆیەکەی چییە:
- ڕەنگە بۆ لەبیربردنەوەی منی بێت!.
ئەمەش هەرگیز لێڕەوچاو نەدەکرد. ناچاریش بوو بێ خوایشتی حەزییەوە:
- داغمەدارەکان دەڵێیت؟.
- بەڵێ.
ویستی وەک ئەو گێڕ بگۆڕێت، کەچی لە دڵەوەی حەملاند و:
- هەتا بۆم دەردەکەوێت سەرسەدەی دەگاتە کێندەر باجلەوی بۆ شۆڕ بکەم.
- غرووریان لەباس نایەت.
- هەر بێزیان نەدەهات لەگەڵ ئێمەمانان بدوێن.
- ئەوە نکووڵی لێناکرێت.
- کەچی لە کۆشی داگیرگەری ئەو دیو «سەگ» یش تەواو نەبوون.
- ڕۆڵە بەلاشیان نەگوتووە:
- سەگ لەسەر گوفەکی خاوەنی خۆی درە.
- کزومەلوول و بێ خولق و چەک وەک خۆڵی مردوویان بەسەردا کرابێت. ڕۆژ تا ئێوارە لەملاو لەولا بێکار دەسووڕانەوە و خواخوایان بوو یەکێکیان دەست کەوێت وەختی لەگەڵ بەسەربەرن.
بەبیروبۆچوونی قسەکانی تەنیا بۆ خافلاندنە و بەس. پەست و دڵگیر بوو . و نەیتوانی چیتر دان بە خۆیدا بگرێت و:«
- دەڵێیت: بیروباوەڕی گۆڕاوە!».
- تۆ جەوابەکەی منت نەداوە؟.

بە هەناسە ساردییەوە گوتی:

- دایە پێمگوتی: چیم پێنەکرا.

مەزەندەکەی لەدڵدا سەقادرا و گوتی:

- دیارە چوونە دەرەوەت و خواردنی نانە خوساوی غەوارەیی و پەڕینی بەلاش لە سوخەت و غیرەتی بەرەی ڕووتانی دابڕاندوویت!.

پێ قەبز بوو..و بەسەرخۆی نەهێناو گوتی:

- نەخێر هێز نییە دامبڕێنێت، بەڵان هەتا من چووم ئەوان هەرسێکیان بۆ سەردانی منداڵەکانیان چووبوون،

- دەیزانی منداڵەکانیان لەکوێ سەنگراینەوەو. بە وەڵامەکە قرت و فرتی دڵی، کە بە قسەکانی پێشووی سەری هەڵدابوو ڕەوییەوە و ئەم پرسیارەش بە بزەیەکەوە لەم ساتەدا لە مێشکیدا پەپکەی کرد بە ڕووی هەڵدا:

- ڕۆڵە ژنە کورد بێ سەردا رو شاڕانگەڕ سوخەتی تێکناچێت؟.

لەبەر شەرمی ڕێز گرتن بەمە وەڵامی داوە :

- خراپ و باش مۆدیلی ئەمڕۆ. وا ئەوهایە.

- عاجباتییە((........ ........)) غەواران چاک دەکەن کەچی لەناو((........)) میللەتی خۆشییان وەک نێرەکەری حەساویی تێرشینکە دەزەڕن.

دوای باوەڕ هاتنی بە قسەکانی بیری ئەم پرسیارەی قۆستەوە.

- ئەدی بۆ نەدەهاتییەوە؟.

- فیراری عەسکەری بووم و بە جاشاتی نەبووایە، نەدەحەوامەوە.

بە بافرەی شانازییەوە بۆی ڕووانی و:

- چاکت نەهاتییەوە.

- ئەگەر پارەو پەساپۆرتم هەبووایە بە دوایاندا دەچووم.

* * *

فەیلەقــی ((٥)) پێنجــی بەعســی داگیركــەری ناوچــە شــاخاوییەكانی پارێزگای هەولێر بە هۆی ڕاپەڕینی میللەتەوە زابت و سەربازەكانی بە بتوونی، بێ خوایشتی حەزیانەوە، پەرتەوازەیان پێكەوت. زۆربەیان ڕووی ناگزووری و هیلاكی و برسێتیان لەشاری هەولێر كرد.
خەڵكەكە لەتۆڵەی لرمەی تۆپ و هاژەی فرۆكە و كیمیا و ئەنفال و زندە بە چاڵ و پەت و سێدارە و فەرهوود و كاول و. وێرانی وڵاتییان بەوپەڕی هەستی بەزەیی و مرۆڤایەتییەوە پێشوازیان كردن و زۆربەیان لەماڵانیان حەواندنەوە.
گورجی لە شەقامی سیروان گوزەری دەكرد لەناكاو نزیكەی ((٢٠)) بیست مەتر دوور چاوی بە دوو سەربازان كەوت یەكیانی ناسی، كەچی عەقڵی بڕی نەدەكرد و:«
- ئەو..و ئێرە كوجا مەرحەبا».
دوای دیقەتدانێكی كرپارانە دوو دڵی پەڕی و دەمی شاگەشكەیی بەشبووەوە و سەرفرازانە لەگەڵ هەڵبڕینی باڵەكانی گورگە لوقانە بەرەو پیریەوە چوو. پڕ بە زاری:
- عێنی عەباس، عێنی عەباس، عێنی عەباس»ێكی بوو لەباس نایەت.
بە شەوق و سۆزەوە ئاوێزانی بوو..و دوو سێ كەڕەت لەسەریەك بە گوڕەوەی ماچ كرد.
عەباس ئەوسا ناسی و بە گوراح خۆشی و كەیفسازییەوە گوتی:
- خاڵە گورجی!؟.
- خاڵە گورجیت دەبەرێ مرێ.
دۆ قەیەكی زۆر گەرمی لەگەڵ هاوڕێیەكەی كرد و یەكسەر بەرەو ماڵ بوونەوە.
سێ شەو. و سێ ڕۆژ بە خواردنی باش و حەمام و كەل و پەل شوشتن

خزمەتی کردن بۆ ئەوەی نەکەونە بەر حەملەی ڕاپەڕینەکەوە ڕۆژی چوارەم گورجی و زانا لەگەڵیان چوونە شارۆچکەی «مەخموور» و بەقەمەرەیەکی خسووسی بەرەو شارۆچکەی شەڕگاتیان ناردن و چەند پارەشیان پێشکەش کردن.

* * *

خەڵکەکە پێشتر لە ژێر زەبرو زەنگی چەوسانەوە و عەسکەری ڕێگەی نەهات و بێ شەرت و هەڵاتن و جاشی شەعبی بە زۆر هەراسانیان لێهەڵگیرابوو..وکونە فیراریان لێ بوو بووە قەیسەری و نەیاندەزانی چۆن بە چ ڕێگایەک خۆیان لەم ڕوو زەردییە و ئابڕووچوونە بەدەست جەندرمەکانی بەعسی داگیرکەرەوە حەشار بدەن.
گەرچی چەند بە تەمای قیت بوونەوەی باپیرە گەورەیان بوون، لەنێو گۆڕدا هەر هێندەش بەتەمای ڕێکخراوە بەزیوەکان بوون بتوانن بێنەوە سەر حەلەبەی چەکدارییەوە. کەچی شەرەف لە کانگەی ئەو ساتە بێ ئومێدییەدا بەرپەرچی بە گوڕ دەدانەوە و ملی تەوازوویان بۆ. ویست و حەزی زەفتییە داگیرکەرەکان لار نەکەنەوە و ڕابواردنی بیست و چوار سەعاتییان دوڕ ژوورو پەنا و پەسارگە و کونەفیرار بوو.
خەلکەکە بوو بوونە دوو بەرەی ئاسمان و ڕێسمان لە یەکتر ئایر، بێ خوایشتی حەزیانەوە «جاش و باش و پاک و دۆڕاو».
- ڕاستە دەیانگوت: فلان پیاوی باشە خۆی نەفرۆشتووە، بە بەرواژییەوە خۆی دۆڕاندووە.
- هەردوولا ئەویان لە سۆزی تۆڵە و ڕزگاربوون و پاشەڕۆژێکی ڕوونـاک و بەختیارییەوە، ئەمیش لەترسی پاشەڵی تەڕییەوە وا یەکتریان گرت موویان بە نێواندا نەچێت و لە مێژووی مرۆڤایەتییەوە

سەری هەڵنەدابێت.
- داغمەدارە سەر زلەکان ڕەنگە هێندێکیان هەتا ساڵی «ئاشبەتاڵ»ی دووەمدا هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتیان لە دەروونندا نووزەی مابووبێت و بەجارێک ڕەشدا نەگەڕابووبێت و هەڵوێستیان لە ئایندەدا هەتا ڕادەیەک خزمەتی گەل و ئازاد کردنی نیشتمان و ئاوەدان کردنەوە بووبێت، کەچی پاش ئەو ساڵە چەشەی گەشت و گوزاری نێو باڕ و تیاترۆ و........))ی کە ناران سەمعە سۆتی پێ نەهێشتوون.
- نەک پێیان لە ڕکێبی ئامانجی خەباتی ساڵەهای ساڵیان بۆ هەتا هەتایێ ترازاوە، بگرە دەستیان تەواو لەکلکی کەری هەرچی ڕەوشتی هەموار و بەجێی بنیادەمە بەربووە.
- پەڕەکەی دڵنیان بە زەڕەبینیش بگەڕێیت لەپەیکەری دۆلار و((........)) بەملاوە عەرزەباتی دیکەی لێ شک نابردرێت.
- ئەوانەی گوتت بەڵگەی ناوێت لە جیاتی پێش هەموو شتێک ئەو هەلە مەزنە بقۆزنەوەو بەسەر ئەو یەککرتنە لە ڕادەبەدەر بەجۆش و هێزەدا، زاڵ بوونایە و مێشکیان بەهەستی نیشتمانی وتەوعیەی نەتەوایەتی زاخاو بدابووایە و نەفرەتییان لە تالآن وفەرهوود و دزی بکردبووایە و ئەو چەکە زۆرەی چنگیان کەوت بەڕێک و نیزامییەوە بەسەر خەڵکە حارگرتووەکەیان دابەش بکردبووایە، نە خەسەلە چەکەقورۆسەکان نەیانفرۆشت بووایە داگیرکەری ئەو دیو..و سەنگەری ڕق و تۆڵەیان لەنێو کوچە و کۆڵان و سەربانە بەرزەکان و جادە و قەراخ شارەوە بچەسپاند بووایە، ئەوسا بێگومان هەرچیان مەرام بووایە، بە سانایی و بێکێشە و تەگەرەوە پێ جێبەجێ دەکرا و دەتواندرا هەتا ماوەیەکی زۆریش چۆکی غیرەت و بەرگری شەتەک بدەن و نەیێڵن دوژمن بە هەوەنتە تخوونی شارەکان بکەونەوە.

- کەچی بەداخەوە قوونێک فێرە ترِ بووبێت چاک بوونی زۆر زەحمەتە.
بەسەربادانی قارەوە گوتی:
- لە سەرەتای ڕاپەڕینەکەدا خۆشەویستی بەرژەوەندی تاکەکەسی وگیرفان بەملاوە عەرزەباتی دیکەیان لا شک نەدەبردرا.
- قسەکەت بەڵگە نەویستە، بەلام هەتا دوا ساڵی: «کورد قرانیێ و کوردستان ویرانیێ» لە ئاوسبوون زێتر نەلوابوو.
- بۆیە لە بریتی تۆڵەی ئەنفال و کیمیا و زندە بەچاڵ و ویران و دەربەدەری و ڕەتانەوەی میللەت وەک ئەوەندە ساڵە بۆی کۆشابن لێکرا بەموشتاقەوە، بێ پەردەی تەریقی شەرمەوە، لە پێشەوە هەڵوێستی خۆیان و لەدواوەش هەڵوێستی هێزی یەکگرتنەکەیان بە گوڕەوە بەرەو تالان و فران و دزین و کوشتن و ئاژاوە و دووبەرەکی و تێکدان وەرچەرخاندەوە.
- زۆر ڕاستە، کە تا ئەو ڕۆژە لەنێو شاردا هەرگیز نەدەزاندرا دوو بەرەکی چییە.
- بە ئەسکوردی شکاویان لەگەڵ دەرکەوتنی سەرو سەکوتیان ئەمانەیان فێرکردووین:«
- چارەنەویستی یەکتر.
- دەرهێنانی بۆڕی و وایەری ژێر زەوی.
- فڕاندنی ئۆتۆمبێلان.
- تالان کردنی مالان بە نوێژی نیوەڕۆ.
- کاول کردنی کوردستان لە هەموو ڕوویێکەوە»
- هەمووشیان لە پاداشتی بەخێوکردنی چەند ساڵەیان بەنرخێکی زۆر هەرزان پێشکەش بە ئاغا ئازیز و بەخێوکەرەکەی ئەو دیویان کرد.
- لەسایەی خەباتی کوردایەتی ئەوانە ئەو دوژمنە زگ ڕەش و داگیرکەرە

لە هەموو ڕوێکەوە بووە دەوڵەمەندترین دەوڵەت لەناوچەکەدا.
زانا و گۆران و بۆتانی خدرە لار، بەڕابەری خەلیلەوە هەرکە سەفینیان دیت، بەناوی بەگری کردن، کە دوژمن گەیشتبووە شارۆچکەی «پردێ» و ڕووی بەرەو دەڤەری قوشتەپەیە وازیان لە گفتوگۆکە هێناو بە تالووکەوە، بە دوایا فرتکەیاندایە.
هەرچوار مسۆگەریان بوو تەنیا بۆ. ڕاوەڕووتە و دەیەوێت ئۆتۆمبێلێکی تری دەسکەوێت.
لەکاتی گرتنی شاری کەرکووک دوو سێ سەیارەی خەڵکی لابەلا، لەنێو گەراج و حەوشەی ماڵان دەرهێنابوو،
هەرکە دەنگی تەقەو زرم و هۆڕی تۆپی دوژمن نزیک بووەوە و زانیشی چی دەستناکەوێت ما هێدی هێدی پاشەکشە بکات.
زانا بەهەڵیزانی و تیواوتیو،بێ ئەوەی کەسی نێو چەندین ئۆتۆمبێلی دەور و بەر هەست پێبکات لە جامی تەنیشتی جێبە ستێشنەکەی خەلیلەوە، پاش ئەوەی مگێزی سێرەی بۆ هەڵخست و دەستی لێ بزاوت و ڕمبەی لە دەرگای پشتەوەی قەمەرە ((........)) دزراوەکەی ((........)) و شاری کەرکووکی ژێری هێنا. کەلە سارای پلکی لەبەر دەرگای حەوشەیانی دزی بوو، لێکرا گوتیان:
- دەست خۆش. دەست خۆش.
کەچی بەخۆی گوت:
- تف. ف لە خۆت دەست و تفەنگت!.
سەفین وایدا بەر مەزەندە:«
- تەقەی دوژمنەو ئەللا خوایی پێکەوت».
لەو ساتەوە لەبەرچاوان ون بوو.

* * *

دنیا شرەکە بووبوو، گرمە گرمی مەترەلۆزانی دوژمن هەر دەهات لە شار نزیک دەبووەوە.
خەڵکەکە گەورە و بچووک کەوتنە پەلەقاژەی دەریای ترس و شلەژانەوە، بە هەر دەنگ و باسێکی هاتنە پێشەوەی هێزی دوژمن دڵیان پتر پێدا دەتلەکا و ئۆقرەیان دەفڕی.
شارەزای دوژمن بوون، نە خاسمە بە بیستنی قەسابخانە و کۆمەڵ کوژە بێ بەزەیی یەکەی خواروو نەترەیان بەردا و دەستی نائومێدیان بەخۆدا شۆڕ کردبووەوەو لایان وابوو بە دەردی ئەوانیان دەبەن.
- ئەو پاتە مەزنە لەبارەشمان بە سانایی دۆڕاند.
- تازە دەزانیت براگیان.
- ڕاپەڕینەکەیان کردە ڕاپەڕینی دزی و ڕاوەڕووت.
- وا لەبەرچاوانە و گوتنی ناوێت.
- کەسانی پاتار خۆریش لەکاری گەندوپووچ بەمەلاوە چیدیکەیان لێڕەچاو ناکرێت.
- زۆر. ڕاستە: پاتار خۆر، ڕێبازی حیزی وسەلامەتی دەقەبەڵ مرۆ، دەکات.
- بۆیە بەهەلەداوان لە حوشتر قەلەزراوتر ڕەوینەوە و مەیدانیان بۆ داگیرکەران چۆل کرد.
- کوڕە. وەک مەڕ گورگ ببینێت چۆکی غیرەتیان شکاو بە ئاستەم هەر ئەوەتە پێیدەگوترا چنگ قژکردنەوە. ئەویش هەتا بە خەڵکەکە بسەلمێنن، شتێک هەن و بەس.
زانا ئاخێکی لە قووڵایی چەپی دڵیەوە بەڕووی هاوڕێکانی هەڵکێشاو جا گوتی:
- تۆخوا کەسانێک لە تاڵان و ڕووخان و کاول کردنی وڵاتی خۆیان

قسور نەکەن و لە تاوانی کیمیا و ئەنفالدا هاونیری دوژمنی داگیرکەر بن، عەیب نییە چاوە ڕووانی دەسوەکەریان بین.

- هەزار. ڕەحمەت لە خۆت و شیری پاکت.

بۆتان ئاگاداری کون و کەلەبەران نەبوو، کەچی پەیمانی دابوو هەتا دوا هەناسەی پشتیان بەر نەدات و هیچ ساتێکیش لێیاندانەبڕێت و گوتی:

- ئەوا دەزانین ئەنفال دەستی خۆمانی تێدا بوو، کیمیا چۆن بووە!؟

زانا کەیفی بەپرسیارەکە هات و گوتی:

- پاسداریان بێ ئەوەی چاوەڕووانی مرتەیەکی لێ بکرێت کردنە براو میراتگری خۆیان و بەدەست لەسەر سینگی تەوازووەوە بۆ ناو((........، ........)) یان پەڵکێش کردن و نەشییان هێشت خەڵکەکە هەتا((........، ........)) پەلەقاژە بکەن.

خەلیل بەر سینگی قسانی لێگرت و گوتی:

- وێڕا ئەوەش((........، ........))

- گۆران و بۆتان چیان لەم ڕووەوە بەر گوێ نەکەوتبوو، بە شڵەژانەوە گوتیان:

- قەت نەبێت!؟.

دەیزانی هەموو عەقڵێک باوەڕ ناکات بە ڕوویەکی گرژەوە گوتی:

- ئەگەر باوەڕتان نایەت دەتوانن لە خەڵکی شارەکە بپرسن.

بە «لاحەولە و وەلا قووەتە»ی خەفەتەوە ناو لەپ بەیەکدا دان و گوتیان:

- دەوجا وەرە ئەو تەرحە کەسانە ببنە ڕابەرمان و لە کۆتی داگیرکەرانمان ڕزگار بکەن.

- خوا عالیمە لە بەڵاو نەگبەت بەملاوە چیدیکەیان لێرەچاو ناکرێت.

- زۆر ڕاستە: تالآنکەر و پاتارخۆر و خزمەت کردن کوجا مەرحەبا.
- بۆیە دۆڕاندمان، دۆڕانێکی زۆر بێزەوەڕیش.
ئەمە بووە هۆی دڵساردبوونی یەکجارەکیان دەرحەق داغمەدارەکان و بڕیاریاندا لەمەودوا بەهەموو تەرزێک پەیڕەوی ئامۆژگاری و وەسیەتەکانی حەمەڕەحیم بکەن و هەرگیزاو هەرگیز ناوی پێشمەرگاتییان پێ لەکەدار نەکەن.
زۆری نەبرد نزیک کەوتنەوەی هێزی دوژمن و لرمە لرمی مەترەلۆزان قەلە زراوانی دەتۆقاند و خەڵکەکە بیلبتوون لە ترسی گیانیان، کەوا لە مێشکیانەوە سەقادرابوو سەر زلەکان توانای بەرگری کردنیان کەم وزۆر نییەو دوژمن و نێرومێیان بە پەند دەبات. هاتنەسەر ئەوڕایە:
سووک و سانا بێدەست هەڵێنان شار چۆل بکەن و دوژمن بێ تەقە داگیری بکاتەوە. کەچی سەر زلەکان بۆ پێکانی مەرامی تایبەتی خۆیان ئەنفالی یەکەم و دووەم و سێیەم ئاسا بەمهانەی بەرگری کردن سەیتەرەیان لە هەرلاوە دانا و بەهیچ جۆرێک ڕێگەی ڕەوکردنی خەڵکەکەیان تاکو شەوە نەدەدا.

* * *

- ڕۆڵە ئێمە قوونمان لای بەعسی درندە پیسە و هەتا کار لە کار نەترازاوە خۆمان گرد کەینەوە.
- دایە چاک دەزانم، بەلآم خەڵکەکە تێکڕا بەگری دەکەن و بە هەوەنتەش کۆڵنادەن.
پێکەنین دایگرت و گوتی:
- ترحێو. دوای ترێ خەپشەی بڕێ، لەهیچ جێگایەک بەئاستەمیش بەرگری نەکراوە و دوژمن وا بێ مل گەرم بوون لە ڕێگەی کەرکووک

و دیبەگە و موسڵەوە، بە دەبابە و مودەرەعە و کۆپتەرەوە گەمارۆی داوین، تازە بە تازە ئەو باوکەمان مرد جارێکی تر توانای دەست کردنەوەمان ببێت.

دیسان حریتاندی و گوتی:

- رۆڵە ئەو هێزو گوڕ و سۆزەی بەرگریان پێدەکرا ئاو و ئاوچوون و بوونە بەلاگێڕی پەرۆ. و پاتاری دزی و فەرهوودەوە و ناگەڕێتەوە. نەیاندەویست لەم ڕووەوە ڕکابەری یەکتر بکەن هەر زوو بەردێکیان لەسەر دانا.

ئەویش ناچار بوو مل بۆ خواستی لەم ساتەدا لار کاتەوە و دڵنیای کرد ئەگەر چنگ قژکردنەوەی لە توانای دانەبوو بەدوایاندا بخزێت.

شەو بەترێکی بەسەرچووبوو لرم و هۆڕ و نرکەی تۆپان خانووبەرەی دەلەراندەوە و هەر دەهاتیش نزیک دەبووەوە.

خەڵکەکە وەک ئاویان بە ژێروەر بووبێت چاشمیش و شپرزەیی بەسەریاندا زاڵبوون و عەجمانیان لێهەڵگیراو ترسی گیان، کە لەبەرایی هەموو شتێکە شالاوی بۆ هێنان و خۆشی و ترشی هەر بابا بوو پەلەقاژەی دەرپەڕینی لەماڵەوەی پێکەوت.

گورجی بە پەلە پەل هێندە پروپرپیاسکەی پێویستی پێچاوە و لەگەڵ یەک دوو نووردییە نانی ڕۆژی پێشتر تایبەت کردبوونی خستنە خورجەیەکەوە و بە کۆڵیدا داو کلاشینکۆف بەشان هەڵواسی و خۆی و نەبەز بەیەکەوە گەیشتنە سەر جادە سەرەکییەکەی گەرەک. چ ببینن، ڕۆژی حەشر و واوەیلایە و دنیا هەستاوە. ئەوەی بزر بووبوو لەوێ دەدیتراوە و دەڕۆین و ناڕۆن و دەبێت و نابێت و هەللایەک بوو سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە.

چەند چەکدارێک مەرامیان بوو بە زەبری چەک بەربەستی ویستی

خەڵکەکـە بدەنــەوە.

ئەوانیـش لـە ترسـانا ئارامیـان لێهەڵگیرابـوو. دەیانویسـت گـوێ بـە فەرمانیـان نــەدەن.

لە کانگەی ئەو کێشمە کێشـە دوو دڵییەدا دوو سۆپەر و موسـەلەحەیەک لە دواوە دەرکەوتن و شێخ سـەدرە و سیروانی جێگری هەڵۆ دابەزین.

ئەمیان باریکەڵە و تۆزێک کەڵەگەت و ڕەنگ گەنمی. خەڵکەکـەش پاش هوتـاف لێدان بەناویـان و:

- بژی سەرکردە تێکۆشەرەکانمان.

- بژی شێخی کۆڵنەدەر و تێکۆشەرمان

- بژی کاک سیروانی پاڵەوانی هەردوو کێوان.

- بژی پێشمەرگە بە جەرگ و نەبەزەکانمان.

چەپڵە کۆتانێکی زۆری بەدواداهات.

بە هێمای هەردووکیان لێکرا بێ مرتە و هەست و خوست چاوەڕووانی گفت و لفتیان بوون. لەگیانی خۆیان خۆشتر دەویستن.

شێخ سـەدرە هـەر زوو بـە ئەمێـک قورگـی خـۆی بـۆ دوان وەک پێـک خـۆش کـرد و گوتـی:

- خوشـک و بریانی زێدە ئازیزمـان تکایە گوێتـان زەریـف بۆ قسـەکانمان شـل بکـەن.

- ئێمـەی پێشـمەرگەی کورد و کوردسـتان لە ناخی دڵمانەوە سوپاسی بێ پایانمـان بۆ ئـەم هەڵوێسـتە مـەردە و جەسـوور و نیشـتمان پەروەرییـەی پـڕ سـۆزەتان،کەوا ئێـوەی شۆڕشـگێڕ بەدەسـت و بـازووی بـە هێزتـان توانیتـان بـە مـاوەی چەنـد ڕۆژێـک کـەم بـە خوێنـی گەشـی ڕۆڵـە ئازیـز و نەبەردەکانتانـەوە سەرتاسـەری کوردسـتانی داگیرکراو لەژێر چەپۆکـی کوشـندەی دوژمـن و خوێنڕێژان پاک بکەنـەوە و بۆ مێژووتـان دەرخسـت

هەر هێزێک بێ پاڵپشت و هاریکاری ئێوەی میللەت بوو پووچە و گریمان کێویش بێت بەکون کوفەیەکونێک ئەتوێتەوە. بە پێچەوانەوە بەهیچ هێزو نسکۆیان بۆ سونەتیش ناچەمێتەوە.
تەرجی سڕینەوەی کەفی لالغاوانی، بەهۆی دەنگی بەرزەوە سەری هەڵدابوو پەنجە درێژەو دۆشاو مژەو ئەسپێ کوژەی بە هەردوولا دەمی دا هێنان و باگۆیداوە و:
- ئێمەی پێشمەرگەی ئازیزتان، ئەگەرچی هەتا ئەمڕۆی حازری لەبەر دەست نەهاتنمان بووبێت یاخۆ لەبەر کەمتەرخەمییەوە سوودی دەرزییەکمان بۆ جەنابتان نەبووە.
«ئـ هـ لەئەوەیان ڕاستت فەرموو».
- بەلام لەمەودوا بەڵێن بێت لە بەڵێنی پێشمەرگاتییەوە هەتا ئێوەی ئازیز چەشەی خۆشی و کامەڕانی ژیان نەچێژن لە خزمەت گەورە و گچکەتانەوە بە قەدەر هێز و توانامانەوە درێغی نەکەین.
«ئـ هـ دنیا خرابوونە: گورگ سوود بەمەڕ بگەیەنێت!».
لە ناخیانەوە باوەڕیان هات و لەکەیفان بووە چەپڵەڕێزان و فیت و هۆڕ و هوتاف لێدان و هەللایەک ئەوسەری دیار نەبێت و:
- بژی پێشمەرگە.
- بژی خەبات و تێکۆشانی بەردەوامیمان.
- بژی سەرکردە قارەمانە ئازیز و کۆڵنەدەرەکانمان.
- بژی کوردستانی ئازاد کراو.
گورجی وا پڕ هەڵمابوو پتت لێ بدابووایە لە حەیفان دەتەقی نەخاسمە دەربڕینی خۆشی خەڵکەکە.
بەخۆی نەوەستا لەدرۆی دوو زەردێنەکانی ببووریێت و پەردەی باری کۆمەلایەتی:«

- زێدە لەو عالەموللایە ئافرەت نارەزا بێت و جوێن بدات» دڕاند و لەگەڵ قوپانی بەرزکردندا ملی خۆی بستێک لەنێو عەشاماتەکەوە هەڵکێشا و هەتا دەنگی لەبەردابوو نەڕاندی و:
- دەگ لەهەشت نێن لەگەڵ درۆت!.
خەڵکەکە تا حەدێک هۆپێکیان لە خۆزانی و زۆریان لەبەر دڵ بوو، هەر هێندەشیان لەدەست دەهات ڕووی خۆیان بە قولاخییەوە بۆ کەرخی دەنگەکەوە وەرچەرخێنن.
شێخ دەلحاز لە بنەڕەتی گەیشت و لە دڵەوە پێڕاچلەکی، بەڵام زەینی بەلای هیچ شتێک نەدەچوو:«
- مەگەر سەر زارەکی و ئەللا خوایی».
لەم ساتەشدا چی لەتوانادا نەبوو، خۆی بەئاستەمیش لەگوورە نەبرد و دوای پشوویکی کەم و خەماوییەوە بەردەوام بووەوە و:
- خوشک و برایانی زێدە هێژا پێویست ناکات لەم ڕووەوە چیتری لەسەر بڕۆم. لەمەودوا کردەوە دەبێتە حەکەم و بەرپەرچدانەوەی کەم وکووڕی و قسوورییەکانمان. بەس ئەوەی ڕاستی بێت دەمانەوێت پێتان ڕاگەیەنین:
- ئێمە بەهۆی ڕاپەڕینە مەزنەکەمانەوە چەکی قورس و زددی جەومان زۆر بەردەست کەوتووە. بۆیە دڵنیابن بێ مەدح و خۆهەڵکێشان زۆر باش ئەتوانین بەرگری لەشارە ئازیزەکانمان بکەین و دوژمنیش ئەو باوکەی مرد جارێکی تر پێ بنێتەوە ناو شارەکان و گڵاویان بکاتەوە.
دەنگی زیاتر هەڵبڕی و:
- ئەوجا داوا لە هەمووتان پیاو و ژن، گەورەو گچکەتان ئەکەین پێویست ناکات بەم دنیا سارد و تەڕوتووشەوە جێگە و ڕێگەی خۆتان لەق بکەن و.........

گورجی وەک حوشتری حایج کەفی غەزەب و توورەیی پەڕییە زاری و تەریقی و شەرمی تورهەڵدان و نەیهێشت تەواوی بکات و بە لێچوونە پێش و دەنگی حیلەوە گوتی:

- جارێک غەدرت لێکردم خوا بتگرێت، دووەمجار غەدرت لێکردم خوا بمگرێت.

خەڵکەکە ئەمجارە زۆر سرک و چاشمیش بوون و حەپەسان. زۆربەیان وایاندا بەرمەزەندە:«

- پیرێژنە و لەترسی نرکەی تۆپانی دوژمن شپرزە بووە». بە سەلیە دەهات:

- هۆشی تەواو لە خۆ نەماوە و ئەو قسە عەلەق و بەلەقانەی بێ خوایشتی حەزی دڵی ئاوقای زاری بوونە.

ئەو زەیندارانەی پیرێژنیان دەناسی حسیان پلارێکە و شتێکی گرنگی لە ژێر دایە.

شێخ سەدرە ئەم کەرەتە، گەرچی لەبەر عەشاماتی خەڵکەکەو تاریکیش بوو... وخاوەن دەنگەکەی نەکەوتە بەرچاو، بەڵان دڵی دەلحاز خەبەریدەداو:

- ئەم جۆرە تانە و تەشەرەیە لە زاری نەوەی ڕووتان نەبێت کەسی تر لەم کاتە ناسک و حەرەجەدا جورئەت ناکات.

گفتوگۆی ئەحمەدە گولەی هاتەوە یاد: کەهەر ئەو ڕۆژە دیدەنی کردبوو.

ئەحمەدە گولە. لەوسەری گەڕابووەوە، بەڵام بۆ وێکەوتن دواندی.

- تۆ..لای خۆت بە قاسیدێکی تایبەت مژدەی لەناوچوونی ئەو بنەماڵە خوێڕی و چەتوون و ئاژاوەچییەت بە مندا کەچی ئەمڕۆ... وا پیرێژنە قۆترەکەی و کوڕ وکوڕەزاکەی لە نێو شار دەسووڕێنەوە.

ئەویش چەند ڕۆژێک پێشتر بەرگوێیکەوتبوو، لەگەڵ ئاخ هەڵکێشانێکەوە گوتی:

- ئەوەی ڕاستی بێت ڕزگاربوونیان منی لەئاست جەنابت خەجالەت بار کردووە و هەرچەند سەر ئەهێنم و ئەبەم نازانم چۆن بووە، هەرچیش لەبارەی پلانەکەی دامرشتبوو بۆت هەڵڕێژم حاشاکی جەنابت بە درۆ دەرئەچێت.

هەتا لەم بارەیەوە دڵگیر نەبێت، کە نیشانەی خۆشەویستی بوو.. وگوتی:

- نا... نا تۆ قسووریت نەکردووەو هیچ حەرەجیشم لەوبارەیەوە لێت نییە.

ئەمە گوراح خۆشی گەڕاندەوە و بەڕوو گەشییەوە ما بۆ زاری بنوارێت.

- وەکو زانیومە خۆی بە عەجەمەرگی لەنۆکرە سەلمان تۆپیوەو ئاواتی هەرە گەورەی من بوو. سەری مارەکە لە کوڵ خەڵکی شارە ئازیزەکەمان بووەوە، کوڕەکەشی بە فیتی بابەگوڕبەگۆڕچووەکەی لەگەڵ گەنجێکی ئاوایی دوا بە دوای ڕۆیشتنی جەنابتان لە ناوچەکەدا خۆیان دەخیلی جاشانی دەڤەرەکە دەکەن. ئەوانیش بە ئەسکوردی شکاویان چەپاڵەیان دەدەن. کەچی ئافرەتەکانی بەر ئەنفال کەوتوونەو پیرێژن و کوڕەزاکەی هەتا هەنووکە لای عەبدی بێ شەرێکیان نەدرکاندووە چۆن بووە.

ئەحمەدە گولە دەستی پەشیمانی خۆی دەشکاندەوە:

- بەداخەوە من لە هەوەڵەوە غەڵەتێکی زۆر گەورەم کرد: دەبووایە جەوابم بناردبووایە، شەوێک درەنگانێ لە خافڵەتەوە قومبەلەیەک باوێنەماڵیەوە.

لەگەڵ پەنجە گەستنندا گوتی:
- خۆ. ئەوە زۆر ئاسان بوو، ئەوکات تەحقیقێکی سەرپێیمان ئەکردو خەڵکەکەشمان وا حاڵی ئەکرد دوژمنی خۆیان بەم کارە هەستاون.
لەگەڵ ئاخ هەڵکێشانا گوتی:
- بەداخەوە تازەچوو ناگەڕێتەوە.
زۆری خۆشدەویست تەرزی ئامۆژگاریی پێیگوت:
- کوڕەکەی زۆر بیژی و چاوقاییمە و..
لە زاری گەیشت و نەیهێشت تەواوی بکات و بە بزەی سەر لێوان و دەست خستنە سەر کلاشینکۆفەکەی شانی و گوتی:
- خەم مەخۆ. مادام ئەم چەکەم لایە بێ منەتم.
بە تەوسەوە گوتی:
- ڕاست دەفەرموویت قوربان، بەقسەکانی پێشتریشت دوژمن حەدی نەبوو پێ بنێتە ناوچەی «ت»ە و گوندی «ش» هەتا سەتان ڕۆڵەی بێ تاوانی ئەو میللەتە قوربەسەرەت نەهێشت خۆیان لە مردنی موحەقەقی زندە بە چاڵەوە قوتار بکەن. هەنجەتیش: گوایا فکرییەن پێ نەگەیشتبوون.
ئەمەی لە خەلیلی بەرگوێ کەوتبوو.
شێخ سەدرە لەدڵەوە وەک کوندەی دوو بۆنگی کەسکوون هەڵگەڕا. دەستی خەڵکەکەی شکابوو ئەگەر نا هەر ئەو دەم تیکەبەتیکەی دەکرد. ما سەر کۆنەی خۆی بکات و:«
- تف و نەفرەت لەخۆم ئاجەراتی ئەو بنەماڵەم کاتی خۆی بە یەکجاری نەبڕیتەوە. ئـ.هـ ئەوە قەت من نەبوومە ئەوەندە لەگەڵ ناحەزان حەوسەلە داربم!»
- ئەمڕۆش هەر گۆردە، دەم بە خوێنەکەی جارانیت و هەمان تەڵە

و فاقە نەگریسەکەت بۆ ئەم خەڵکە پڕزە بڕا و..و بێ خاوەنەت داناوەتەوە:

- گوایا بەزەییت پێیاندێتەوە و ناتەوێت بەو دنیا ساردو سڕە هێلانەیان لێ تێک بچێت.

دەنگی قاییمتر کرد و گوتی:

- دەگ لەخمت نێن، دەگ لە هەشت نێن لەگەڵ ئەو درۆ. دوو زردێنەیەت!. نازانم چۆن چاو..و ڕووت هەیە و کوو زمانت گەڕا پاش ئەوەی بەو نەوعە درۆ. قەبە قەبانەت نزیکەی هەشت و نۆ هەزار کەسی بێ ئەنوا و قەلەندرت بە((........)) دان و هەننۆب بەتەمای ئەوپیلان و موئامەرە نەگریسەی دامەزرێنیتەوە.

لەبەر قاییم قسەکردندا کەف لالغاوەکانی سپی کردن و سڕییەوە.

- بۆیە پڕ بەزار بەو خەڵکە بێ ئاگایە لەدنیای کارەساتی ئەمڕۆ . ڕادەگەیەنم شێخ سەدرەی چەمەری ودارودەستەکەی خائینی کورد و کوردستانن و دەستیان هەتا بن پیلان لە خوێنی میللەتی خۆیان سوور کردووەو هەرچەند خۆمان لێیان لاگر بگرین و سکتریان لێ بکەین بێگومان ئەوسا لە بەڵاو کارەسات دوور دەکەوینەوە.

خەڵکەکە جار لەجار هەستیان سرکتر بۆ ڕادەگرت. بۆ ئەوەی میللەت باوەڕیان لەسەری کز بێت، بە ئەوەندەش نەوەستاو گوتی:

- عەنتیکە لێرەدایە، ئەو ڕۆژەی کلکی حیزی لەنێوگەلانی خوێ ناو، بەرزەکی بانان بێ تەقە ئاسا تێیتەقاند و لە پەلەپەلی ترسی گیانی دەفتەری تێبینی دوڕ بەرکی خۆی لێ بەجێدەمێنێت، کە تا ئەمڕۆش بۆ یادگاریم هەڵگرتووە. زۆر کەسیش دەسخەتەکەی دەناسێت تفەڕکی زادی هەرماڵێکی کردبێت نووسیبووی:

- ((........، ........)).

ئەمەپرتەو بۆڵەی ناڕەزایی خستە سەر زارانی هەزارە زیلەکەوە.
- تەنیا ماڵێک نەبێت یەکجار زۆر. ڕێزیان دەگرت و هەر جارێک بچووبووایە گۆشتی یا خۆ عەلەشیشیان بۆ دەگوشتەوە، نووسیبووی:«
- ........» چەند....، ........
بەحریتەکەیەکی حیلەوە، سەرنجی زۆربەی خەڵکەکەی بکێش کرد و:
- ئا. ئەوەیە سەرکردەی شۆڕشی نوێی کوردایەتی!.
- ئەوەیە بەرپرسی شۆڕشی ئازادی و سەربەخۆی کورد وکوردستان!.
ئەو کەرەتە لەوغەو هەژان و قاریش دەروونی زۆربەی خەڵکەکەیان داگیرکردو ما بەڕابیتەکردن بەناو یەکتردا بقژقژێن و هەر بابا بوو لە ڕاستەخۆی، بێ ئەوەی گوێ بە ئەوەی تەکییەوە بدات و دایە بەر نەزیرۆکان.
بوونە دووبەش، ئەوانەی باوەڕیان زۆر بە شێخ هەبوو پەست و مرومۆچ هەڵگەڕان و بەدرۆیەکی سرفیان دەخەملاندو ئەگەر بۆیان بلوا بووایە وایان دەپەستاوە، بەقوربانی مردنیان دەکرد.
ئەوانی دی ئەگەرچی دووڕابوون، بەلام لێکرا نەیانهێشت کۆڵی دڵی خۆی لە ئاست پرتۆخی شێخ تەواو داکەوێنێت و هەڵیاندایە و :
- ئەو پیرێژنە و ئەو قسانە کوجا مەرحەبا!.
- ڕاستە قەت لە ئەوانە نییە عەقڵی بەو جۆرە شتانە بشکێت!.
- ڕەنگە پاڵ پێوە نرابێت.
- زۆر لەگینە.
- دنیایەو هەموو شتێکی لێڕوو دەدات.
- دیارە نیازی وایە ئەو پاتە لەبارەی بۆمان ڕەخساوە لە قیس بچێت.
- زۆر. ڕاستە ئەگەرنا لەو سەرکردانەمان زێتر نینە هەتا لەو ڕۆژە ناسکەدا ڕابەرایەتیمان بکەن.

- کەوا ساڵەهای ساڵە لەپێناو هێنانەدیی ڕۆژێک ئاوا. سستیان لەکۆڕی تێکۆشانا نەنواندووەو گیانی خۆیان هەردەم لەو ڕێبازە پیرۆزەدا کردووەتە قوربانی.
- ڕۆژی خۆشی و پشوودانیان چیاو هەڵەت و غەریباتی بووە.
- لەبریتی ڕێزگرتنیان و دەستمان دانێن پێ لەسەر دانێین ڕیسوایان دەکەین.
- ئەوە خۆی لە خۆیدا کارێکی ناڕەوایە.
- بۆیە پێویستە هەتا چیتری بەدوا دا نێت تەمبێ بکرێت.
- ئەوەی فەرمووت سەری هەموویەتی.
- دەبێ تەمبێ بکرێت و زیاتریش.
- ئـ هـ خـۆ ئەوەش دوژمنی داگیرکەر نییە هەرچی بکات و بڵێت نەتوانین بڵێین: لەل.
زۆر کەس خۆیان تەیار کرد و ویستیان بیدەنە بەر سالدرمان.
لایەنەکەی تر. زانیان دنیا چ باسە و بەرپەرچیان دانەوەو گوتیان:
- کوڕە پێیناوێت بە هەندی هەڵگرن و ئافرەتە و لێیناگیرێت.
- ئافرەت هەر لە ئێجارەوە تەختەکیان نوقسانە.
- سەگ بەسەگاتی خۆی بە ژنان ناوەڕێت.
- نە خەسەلە دوو سێ کوڕی شەهید بوونە و چەند کەسیشی بەر ئەنفال کەوتوونە.
- ڕاستە و مادام ئەو نەوعە دایکەیە پێویستە ڕێز و قەدری بگیرێت.
سیروان و شێخ سەدرە هاروهاج بوون نەخاسمە ئەمیان پتت لێبدابووایە دەتەقی. دەسەڵاتی هیچیشی نەبوو. ناچار هەرکە زانیان زۆربەی خەڵکەکەیان پاڵپشتە هەتا لەم ساتەدا نەبێتە ئاژاوە و دەم تێکنان وایان بە پەسەند خەملاند و گوتیان:

- لێیگەڕێن هەرچی ئەڵێت، با بیڵێت. بە درۆ. ودەڵەسەی ئەو دنیا ناڕووخێت و ئێمەش تاوانبار نابین.
ئەمە جەلعە ئاوێکی شەوێ بوو بەسەر خەڵکەکەدا کراو ساردی کردنەوە.
گورجی لەمرازیان حاڵیبوو، تەنگەتاو دوورکەوتەوەو پراسکەکەی دادەست نەبەزو کلاشینکۆفەکەی سوار کردو هەتا دەنگی لەبەردابوو گوتی:
گریمان ئەو ((........ ........))وکەپوو ژنانییە نەبووایە، کە ئێوە ئەمڕۆ وا بەسەرکردەی مەزنی ڕزگارکەری خۆتانی دەچووێنن خەڵکی ناوچەی «تەقتەق» و دەوروبەری گەورە و گچکە دە ڕۆژ زیاتر پێش هاتنی هێزی ئەنفالی عەرەبان چۆلیان دەکرد و عەبدی خوا نە دەکەوتە بەر حەملەکەوە و دوژمنیش ئەوسا فەشەل دەبووەوە، بەڵان ئەوەی ئەو دەم بە خوێنە، دەرحەقی ئەو خەڵکە هەژارو دەسواڵا و خانەوادە و پەناهەندەی ناوچەکەی ئەنجام داوە، بڕواناکەم ڕژێمی بەعسی دڕندەش بە خەیاڵیدا هاتووبێت.
هەتا شێخ سەدرە ڕیسوا ببێت واریقاتی ئەنفالەکەو چی بەچاودیبوو..و یاخۆ بەسەری هاتبوو خڕی بۆ هەڵڕشتن و ئەوسا هێمای بۆ شێخ کردو گوتی:
- ئەم سینگ شێر و پشت ماکەر و ژن پیسکەرەی بەرچاوتان گوێی خۆی نامەردانە شۆڕ کرد و بەچەکی سەر بەرەو خوار، پێش هێزە بەزیوەکەی تێیقوچاند. وێڕای ئەوەش بەهیچ چەشنێک ڕێگەی یەک لەگەنجەکانی ئێمە مانانی بێچەک نەدا لە گەڵیان بچن و قوتار ببن. هەتا بەسانایی خڕمانی خستە بەر کەلبەی تیژی وەلەکی ئەنفالەوە.
بە زۆر پێکەنینێکی تەڵخی پەڕاندە ڕووی خۆی و:

- هەنووکـەش وا خـۆی کردووەتـە فسـۆس پاڵەوانـی مەیدانـی خەباتـی کوردایەتـی تاکـو ببێتـەوە سـەرکردەکەی گۆڕیـن و بەرژەوەنـدی وڵات بدزێـت و ئافرەتەکانیشـمان ((......، ......)) هەمـان تـاس و حەمامـە شـوومەکەی تایەنـی دامەزراندووەتـەوە.

لەهەڵس وکەوتـی خەڵکەکـە هەسـتی کـرد قسـەکانی لـە تـڕی نـاو ڕانـک دەچـن و لەتێـک ئـاڵان و. وڕووژانـی بڵمـە بڵـم چیترنابەخشـن، بـە ساردییەوە دوای گوتنـی ئەمـەی خـوارەوە بـە دەنگـی بـەرزەوە سـکوتی کـرد:

- من وا دەڕۆم ئەوجا ئەوکەسەی ژنەکەی قەحبە نییە دێ دەمگێڕتەوە.

عالەموللایەکەی بە شڵەژان و حەپەسانەوەی جێهێشتن.

تاکوتەرا باوەڕیان هات و بەدوایە فرتکەیان دایە.

شـێخ لەوەتـی چـاوی لـە دنیـا هەڵێنـاوە ئـەو قسـە تڕووهاتانـەی بـە قەبرغـە نەکەوتبوون. نـە خاسـمە لـە بنەچـەی شـێخانە و ماڵیـان پێشـتر بیسـت و چوارسـەعات مۆنجـەی لەشـێت و هـار و زیارەتکـەران دەهـات و سوێند بە پیرۆزی سـەریان دەخورا و ئێسـتاش سـەرکردەی ناوچەیەکی بەرفرەوانـە و ڕێـزی یەکجـار زۆرە، کەچـی پیرێژنێکـی ڕمـووزەن و چرۆچـاو جنـاوی ئـاوا. بـە جوێـن و قسـەی تەڕاوزانـە، لـە دیـار عـەرەب و عەجەمـان بیشـواتەوە. ئێـ. هـ لەوکاتـە تەنـگ و حەرەجـەداو بـە زیـل و جەمـاوەر گەمـارۆ دراودا دەم لـە دەمـی نانێت. ناچار خۆشـی و ترشـی، بـە پـڕ هەڵماوییـەوە خـۆی لـێ گێـل کـرد و نقـەی لەخـۆ بـڕی.

- ڕۆڵـە باپیرت دەیگوت: شـێخ گریمـان بـوون بـە پـردی ڕزگاریش قـەت نەکەیت بە سـەریدا بپەڕیتـەوە.

- داپیـرە خـۆ هەموومـان دەزانیـن ئـەو زۆڵـە بـوو باپیـرم و دایکـم و خوشـکم و خەڵکـی ئاوایـی «ش» ی بـەر ئەنفالـدان.

- ڕۆڵە ئەوە نكۆڵی لێناكرێت.
- ئەدی لۆ ئەو خەڵكە ئا. وا خۆشییان دەوێت.
بەئاخێكەوە گوتی:
- كورم ئەو خەڵكە ساویلكەو خۆش باوەڕن. بەپەیڤێک بە حەوا دەچن و بە پەیڤێكی دی دادەمركێنەوە، هەزار تاوان و خیانەتی وەكی شێخی چەمەری ئەنجام بدە و دەتوانی بە دوو قسەی لووس و ڕزی خۆت لە نێوانیاندا بكەیتە شێخی سەنعان، یاخۆ بڵێیت «سەیدم» سەیدیش بە بیروبۆچوونیانەوە هەموو شتێكیان لە دنیا و قیامەت لەبەردەست دایە و ئەگەر ببنە سەگیش گڵاونابن. ئەوانیش لە وەتی هاتوونەتە وەڵاتمان لەسەرەوە ئەلـلا ئەللایانە و لە بنەوەش نە عوز و بیللایانە. خۆ ڕەپێش كردن و دۆستاتی و نزیک بوونەوەیان لەكار بەدەستانی زۆڵ و ستەمكاری سەردەم سامیان بەسەر خەڵكەكەدا سەپاندبوو..و بەكەیف و ماشای خۆیان بەناوی دین لەسەر ورگیان ساڵ دوازدە مانگ دەڵەوەڕێن. خەڵكەكەش ڕابەرێكی ڕاستەقینە و دڵسۆزیان نییە ڕێنوێنیان بكات و لە بن چەپۆكی بێویژدانی ئەو سەید و شێخە غەوارە و ستەمكارانەیان دەرباز بكات و بە ئاواتی دوارۆژیان بگەیەنێت.
نەبەز ئاخێكی درێژی لە سكۆلەی چەپی دڵیەوەی هەڵكێشا و گوتی:
- وەلـلا وەكی گەورە بم دەبێ لە تۆڵەی باپیرم و. وان ئەو كافر و زەندیقانە بتۆپێنم.
زۆری كەیف پێهات و گوتی:
- ڕۆڵە ئەوەی دەڵێیت وەكو نوێژ و ڕۆژو لە سەرمان فەرزە. بەڵان هەتا ڕۆژی دادێت ئارامی دەوێت و ناشبێت كەس لە زارت بزانێت.

* * *

پاش مەلا بانگدان و قڕوقەپی منارەکان، بە ماوەیەکی کەم ئاسمان ساف و هەوایەکی فێنک و گوڕبەخش بە جەستاندا نرک و هۆڕ و تەق و تۆقی تۆپ و قازیفە و دۆشکەو گرەی دەبابە و ئۆتۆمبێل و نەڕە نەڕەی تەرەکتەر و غەڵبەغەڵبی عالەمولـلا بەو سبیانە سەحەرییەی لەهەر لاوە توندتر و گوڕتر بەرگوێیان دەکەوتن.
لەگەڵ دنیا ڕوون هەڵگەڕاندا قوونی ڕەش و سپی، مەڕ و گورگ، نیشتمانپەروەر و خائین، هەڵوێستداری ڕەند و قەڵەزراو، زەریف لەیەکتر هاوێر دەکران.
شاڵاوی بەردەوام و نەپساوەی ژن و پیاو..و زارۆک و پیرونەخۆشی پەککەوتەی پیادە مێرووولەیی بەرەو..ڕێگای پیرمام و کەسنەزان، کەرویشکەیان دەکرد و مێژووی شارەکە کۆڕەوی ئاوای بەخۆ..وە نەدیوە.
نزیکەی ملیۆنێک کەس، بەیەک کەرەت و بێ خاوەن و جلەودار، لەترسی گیان و زندە بەچاڵ و کیمیایەکی دیکەوە ملی ناچاریان لە ئاسۆیەکی نادیارناوەو تەنیا سەرسەلامەت بێت و بەس. تخ لە ماڵ و سامان و خانوو بەرەو شارە ئازیزەکەیان. ئاسمان سپی زیوین و زەویش لەبەر ئۆتۆمبێل و تەرەکتەر و عارەبانە و ڕەوکردنی سەرتاپای خەڵکی شار وەک پۆلە ڕەشۆڵە داپۆشتووبێت و لە دوورەوە ڕەش دەچووەوە.
گورجی لەسەریەک لە ملە بەرزەکانی پشت کۆمەڵگای کەسنەزان، لەگەڵ چەند کەسانی شارەکە، هەڵتووتکابوون و لە دڵیان چەقی بوو قەدەغەکردنەکەی ئێوارە، لەبەر هەنجەتێکی تایبەتی بووە. نەک بەرژەوەندی خەڵکەکە.
گورجی مەراقی وێکەوتن دایگرتبوو، ئەگەر نا لەمێژبوو ناوچەکەی

جێهێشتبوو.

لە هەوەڵەوە لەگەڵ سەراکێشاندا کەل وپەل و چەک و تەقەمەنی و سەیارەی دزراوی لە ژمارە نەهاتووەکان بەسەرکردایەتی «سەر زلەکانی بەرە»وە لەگەڵ خاوو خێزانیان پێشڕەو بوون.

تڕە بەرگری و دووره تەقەیەکیان کرد، بەڵام ملی دوژمنیان گەرمدا نەهێناو. ..و ڕووژاندنی دژی خەڵکە بێ ئەنوا و دەسەڵاتەکە بوو. بەس.

پاشدان قەتارە بەستنی ئۆتۆمبێلی دەسڕۆ و خوا پێداوەکان هتا لەقەوامی مەرگ دەرباز بوون.

ئەوجا بەری چینە فکرییەن پێنەگەیشتوەکان بەڕەللا کراو لەدواوە تەرزی مێگەلە مەڕ لە کەلداندا بەتێک قژقژاوی گوڕەوە سەریان هەڵگرت. هەتا ئەوساتەش کار لەکار ترازابوو..ودوژمن بە دەبابە و مودەرەعە و هەلیکۆپتەرەوە سەیتەرەی لەسەر تەواوی ڕێگاکانی دەوروبەری شار کردبوو..و.

- هەستی ویژدان و مرۆڤایەتی لەنێو دڵی دەسەڵاتدارانی خوێنڕێژی غەوارە، یاخۆ خانەزایی لە ئاست ئەو عەشاماتە بێخاوەن و پرزە بڕاو و لێقەوماوەدا بارگەی تێکنابوو.

- وا لەبەرچاوانە و حەوجە بە گوتن ناکات.

گورجی بە ئاماژە کردن و دەنگی بەرزەوە:

- توخوا. ئێوە تەماشاکەن تەماشا!. درندانە بێ تۆزێک هەستی مرۆیاتییەوە وا لەسەر عەردی بە تۆپ و دۆشکە و شەست تیری دەبابەوە، لە ئاسمانەوەش هەلیکۆپتەر هێرەیان پێدەکەن!.

- ئەی هاوار هەیش.. ش بۆ ئەو خەڵکە قوڕ بەسەر و بێ شوانە!. قڕکردن و کلۆ..و ڕەشەکوژی دراونەتە بەرێ.

- هیچ دڕەندەیەک، زۆردارێک دڵی بەروەست نادات ئاوا بەو جۆرە کۆمەڵی خەڵکی بێ چەک و دەستواڵا قەتل و عام بکات!.
- لە سایەی بەرەی خیانەت و سەرکردەی دز و تاڵانکەرەوە ئێمەیان بە دەستی ئەنقەست دوا خست هەتا بەو ڕۆژە ڕەشە گەیاندراین.
- ئەوە گوتنی ناوێت.
لەتاو قیژەو هات و هاوار..و ڕۆ ڕۆیان کافری حەوت دینانیش لەبڕا ڕۆی دەدا:
- ئووی. ئووی....
- هاوارە هاوارە خەڵکینە هاوارە.
- وەیڕۆ. برا ڕۆ....
- وەیڕۆ. لەخۆمان قەلەندەر و ماڵوێرانێ ڕۆ....
- وەیڕۆ. لە خۆمان چارەڕەش و قوڕبەسەرێ ڕۆ....
- وەک کۆمەڵە سپیانێک دوو سێ گورگ سەراو دوویان بنێن چارەیان تەنیا پشت تێکردن لە شار و تێقوچان بوو. بەس.
- ساڵ دوازدە مانگ دڕندەی غەوارە و خانەزایی ئەو خەڵکە هەژارەی بە هەموو هێزو تواناىانەوە دەڕەتێننەوەو بەرهەمی خاک و شانیان هەڵدەلوشن. ئەوجا ..چاویان بە ئاستەمیش تێرنابێت و هەر دەڵێن:
- هەل مین مەزید؟!.
- هەرکە بێنە قسانیش:
- بەخوا بابە میللەتێکی سەگ و سەگبابمان هەیە!.
- کەسیش نییە هاواری بۆ بەرن.
- هاوار بۆ کێ بەرن؟. ئومەمی و نەتەوەپەرستەکان بە درۆزنێکی ڕوو..ڕەش دەرچوون. چەندین ساڵە وا لەنێو قوڕەشینی خۆفرۆشتن، بەناو خەبات و تێکۆشانی کوردایەتی و سۆسیالیستەوە گێرە دەکەن

و لەمشە لەسەر . ورگیان دەڵەوەڕێن و ئەوجا لە وتەی پان پانی دڵخۆشکەری دە قۆناخ دوورەکردەوە، داوەلێکیان بەرهەم نەبووەو ناشبێت.

- هێزی جیهانیش «ڕۆژهەڵات و ئاوا» لەسەر ئەنفال و زندە بە چاڵی ژن و زارۆک و کیمیاباران و تێکدانی دەیان شار و ئاڤایی بە جەواب نەهاتن، تازە بە تازە بە جەواب دێن!.

- ئەوهات و هاوار و کورەوە چڕە تەنیا بۆ ئەوەیە لە کارەساتی کوشتن و هەتک و نامووس بردن و بەندیخانەی نەمانەوە دوورکەونەوەو بەس.

- شالاوی کۆڕەوەکە، لەم مەرگەساتەی ئەرزو ئاسمانەوە بەئاستەمیش نە سلەمیەوە و درزیان بۆ سونەتیش تێنەبوو. بگرە هەنگاوی بەگوڕ و زلتریان، بەسەرلاشە و سەروپێ و..ورگ دڕاوی ڕۆڵەی نەتەوەکەیانەوە دەهاوێشت و پەلەپەلی ئەوەیان بوو شەقاوێک لەگەرووەمەی مەرگەوە دوور کەونەوە.

- ئەو کوشتن و قڕکردنە لەتام بەدەرە، کەوا عزرائیل پێڕا نەدەگەیشت و بە ماوەی سەعاتێک، دووان نزیکەی هەشت و نۆ هەزار لاشەی منداڵ و ژن و پیاو بوونە قوربانی ویستی بەرەوە. جگە لە سەتان زامدار.

- هەژان و سەرلێشواویان وا لە دڵی خەڵکەکەوە ڕواند گەڕانەوە بەرەو دواوە تخوونی خەیاڵیشیان نەدەکەوت، هەرکەس کڵاوی خۆی گرتبوو، بە هەموو هێزییەوە هەیپەی لێدەکرد.

لەگەڵ ڕوانینیدا:

- حەشرە، واوەیلایەکی کەس بەکەس نەبوو.. و باوک لە حەژمەت قوتار بوونی گیانی خۆی پشتی لە ڕۆڵەی خۆی کرد. دایک کۆرپەی

ساوای لێبوو بووە قەزا و بەس گیانی خۆی دەربچێت.
گورجی ئاخێکی کەسەراوی هەڵکێشا و ماوەی کەسانی دەوروبەری نەداو. هەر زوو باگۆیداوە:
- مرازی داغمەدارەکان، کە قەلاچۆی میللەتەکەیان ببێتە قەڵغانی قوتار بوونی ئەو سەیارەو شڕ و شاتارانەی بەرهەمی دزی و فەرهوود بوون، بە سانایی هاتە دی. ئـ هـ ئەمەش خراترین ئەنفالە.
- زۆر. ڕاستە.
- دوژمن وێرای درندەیی وبێ بەزەیی یەوە لە ئاستیاندا بە ڕوحم و ئەهوەنترە.
- گوتنی ناوێت وا لەبەر چاوانە.
- پاش دوو سەعات شەلم کوێرم ناپارێزمەکەیەوە، هەرکە زانی دەستوەکەری بە هیچ شێوەیەک لە گۆڕێ نییە دەستی لە کۆمەڵ کوژیەکەی هەڵگرت.
- بەڵێ ئەوا چوار پێنج هەلیکۆپتەر، بە کەیف و ماشای خۆیان بێدەخلانە، لە ئاست سەریان وا دەسووڕێنەوە.

* * *

گورجی دوای دەرکەوتنی زانا لەگەڵ کورە گەنجێکی ڕەشتاڵە و کاپێلک ئەستوور و ئاکار. ڕێک دڵی کەوتە عەردی.
- بە ناسینی جەنابت زۆر خۆشحاڵم.
زانا ڕووی دوانی لە دایکی کرد و گوتی:
- دەزانی ئەو برادەرە کێیە؟.
دوای لێمووڕ بوونەوەیەکی کڕیارانە و گوتی:
- ناوەللا.
بەڕوویەکی گەش و عوبابەوە:

- ئەوە کوڕی ئەو «برایم»ەیە کە مام ڕەمەزان گێڕایەوە:«
- شێخ سەدرە لەبەرچاوی عەشاماتی خەڵکەوە دەستی لە پشتەوە بەست و بە شەروالی پڕ بەردەوە بەڕووباریدا دا».
یەکسەر بۆ ڕێزگرتن لەبەری قیت بووەوە و بێ پەردەی شەرمەوە ئەملاو ئەولای هەڵمەتی بە سۆزەوە راموسین و گوتی:
- کەواتە ڕۆڵە مادام دوژمنمان یەکە لەمەودوا تۆش بوویتە یەکێک لە بنەماڵەی رووتانەوە.
لەگەڵ سەردانواندنی ڕێزەوە گوتی:
- من شانازیتان پێوە دەکەم و هەر ئەمەش بوو وای کرد خۆم بە جەنابتان بناسێنم.
دوای ئەوە بە چاوێکی تەژی بەزەیی یەوە سێرەی لێگرت و گوتی:
- ئەری ڕۆڵە پێمناڵێیت ئەو زۆڵە بۆ ئەوها وەحشیانە باوکتی بە فەتارەتداوە!؟.
ماوەیەک سەری خەفەتانی باداو فرمێسک دوای ڕەنگ پەڕینی، بە پرسیارەکەوە لە هەردوو چاوانی زرچەی بەستاو:
- بڵێم چی؟. تەنیا لەبیروباوەڕی سیاسیدا نە دەگەیشتنە یەک و بەس.
زانا پەڕەکەی وەرگێڕاو گوتی:
- دایە ئەو خائینەم دیت؟.
لە ژێر زاری حاڵیبوو..و گوتی:
- شێخ تەڕەماش؟.
- بەڵێ. لۆرییەک پڕ چەک و سەندووقە فیشەک و لۆری و پێکابێک شڕوشاتاری ناومال، قەمەرەیەک تەنیا جل و بەرگ و وردەواڵە. قەمەرەیەکی دیکە ژن و منداڵی تێدابوو. سێیەمیش خۆی و دوو چەکدار.

بە زەردەخەنەوە:
- دەتگوت نێریی بەرایی مێگەلانە لە پێشەوەی هەمووان بوو.
دیقەتی تەواو دەم و چاوی دایکی داو حسیا شتێکی لەدڵدایە کەچی ماوەی نەدا و گوتی:
- هەڵۆش ئاوا بە بارگە و بارخانەی تالانەوە، دوا بەدوای ئەو تێپەڕی. پاشدان سیروان و سەفین و شوان.
گورجی دامانێکی کەمی کردو ئەوەی مەرامی بوو بەم تەرزەی هەڵڕشت.
- کەواتە دەرکەوت: داغمەدارەکان، بۆ بەرپەرچی ڕۆیشتنی خەڵکەکەیان دەداوە.
- ڕاست دەفەرموویت!. هەتا ئەگەر دوژمن شاری زوو داگیرکرد، بە کوشتنی خەڵکە هەرەمە بێ چەکەکە خەریک بێت و ئەوانیش ئەو سەیارە و پەڕۆ . و پاتارانەی بە نسیبیان بووبوون دەرباز بکەن.
گورجی بە زیرەکییەکەی بافرەدار بوو..و:
- بۆ ئەو نیازە گلاوەشییان هەشت نۆ هەزارکەسیان بە کوشتندان و سەریش کەوتن.
- بەڵێ سەرکەوتن و کەسیش نییە پێیان بڵێت:«
- پشت چاوتان دوو برۆیە».
- ئەوجا ئەو خیانەتە گەورەیەی بە عەمرە هێنانەوەشی دەژمێرن.
- ئەوە گوتنی ناوێت.
گورجی سەری غەزەبی بادا و گوتی:
- هەمان تاس و حەمامەکەی ئەنفالە شوومەکەیە!.
وەک نەبایان دیبێت و نە باران، یاخۆ کەسێک لە پاشملەوەش ناویان بە خراپ بهێنێت گەڕانەوە سەر کورسییە خۆشەویستیەکەی تایەنیانەوە.

- لەمـەودواش، پـاش ئـەو نەهامەتـە گەورەیـە کـە ئـەوان سـەبەبن هەمـان جـل و جەوەنـدە دەبێـت.
- هیچ گومانی تێدا نییە.
- ڕۆڵـە ئێمـەی کرمانـج لەبـەر ئـەوە زۆر سـاویلکە و خـۆش بـاوەڕ و بـێ جلـەو داڕیشـین هـەر ئـاوا زولممـان لێکـراوەو لێشـمان دەکرێـت ئەوجـا هەسـت ناکەیـن دوژمنمـان کێیـە.
ئەمەی لەم ساتەدا بە یاد هاتەوە و بە پێویستی زانی بیدەرێنێت:
- حەمە ڕەحیم گۆڕی پڕ نوور بێت هەر جارێ دەیگوت:
- هـەر دوژمنێـک دەسـت بەسـەر مەملەکەتمـان دا بگرێـت جـارێ لـە پێش هەمـووان ئـەو کەسـانەی لـە ئیجـادەوە خەڵکـی وڵاتەکەمـان نیـن و غـەوارەن و بـە بەروبوومـی هەنگـڕاون وەک بەرزنجـی و«........» تورکـەکان، لـە بریتـی خەڵکەکـەی بـۆ بەرگـری خاکـی نیشـتمان هـان بـدەن و دژی بووەسـتن هـەر زوو بـێ پـەردەی خەجالەتـەوە دەبنـە خەفیە و کارمەنـدی بـەر دەسـتی و خاکـی بەرپێـی و ئەوجـا بـە جووتـە شـان بەشـانی یەکتـر خەڵکەکـەی دەرەتێننـەوە و کاتێکیـش کـە دێنـە قسـان خۆیـان بـە ئەشـرافی میللـەت لـە قەڵـەم دەدەن..
هەڵمەت دوای حاڵی بوونی لێیوەرگرتەوە و گوتی:
- کەواتـە بـە فەرمـوودەی مامۆسـتای ڕەحمەتـی ئەشـراف لـە وڵاتمانـدا ئەو کەسـە غەوارانەنە کە بەکردەوە سـەپاندوویانە هەسـتی نیشـتمانیان بـۆ دەرمانیـش لـە دڵدا شـک نەبردرێت و هـەرزووش ببنـە جاسـووس و گۆردەی داگیرکـەران.
- بەڵێ بەڵگەی ناوێت.
بێنی لەگێڕانەوەکەی نەداو:
- دەیگـوت: «هەتـا زمانـی عوسـمانلییە داگیرکـەرەکان بـوو ناویـان

نابوون «ئەمیرەلمولمینین» و باوکی موسڵمانان و ژن و ئەو قاچپانەی کە سواریان دەبوون دایکی موسڵمان و کوردان بوون. هەرکە ئینگلیز جێگەی گرتەوە بە هەمان شێوە بوونە عەمیل و ئەلقە لە گوێی. تەنیا بۆیان نەدەلوا «ئەمیرەلمولمینین» دەقەبەل بکەن.
تۆزێک کپی بەسەرداهات و گوتی:
- ئەمڕۆش وا بۆ بەعسی فاشی و داگیرکەر. زۆربەیان بوونەتە جاش و ئەمن و ئامیر فەوج و موستەشار.
دەنگی بە ئەنقسەت بەرزتر کرد و گوتی:
- بۆیە هەتا ئەوانە لە کوردستان نانی زندووان بخۆن و گوو بە کڵاویان بپێورێت کورد خۆشی لەخۆی نابینێت.
هەڵمەت زەردەخەنەی خۆشی و سەرسوڕمانی بە بۆچوونەکەی دایگرت و:
- دەگ بە قوربانی زاری بم کە ئەو..وتە بە نرخانەی درکاندووە!.
بەڕوویێکی بافرەدارەوە، لە هەڵمەتی ڕووانی ئەمەی لەم ساتەدا هاتەوە یادو بۆ پاڵپشتی بۆچوونەکەی هەڵڕشت و:
- بە بیرم دێت سەردەمایەک خەڵک لە دێهاتەکاندا بەوپەڕی توندوتیژی. دەچەوسانەوە و هەرکە بۆ پێویستی ماڵەوە دەچوونە شار گەلەکۆیی یان لێدەکرا. بە چەند تورکی نەوەی عوسمانلی داگیرکەر و زڕ کوردێک «قەساب و جامباز و دەلاڵ» لە تاقە کرمانجێک هەر لەبەر ئەوە کرمانج بوو بەس، بە دوژمنی خۆیان دەقەبڵاندو وەردەهاتن. هەتا ڕەپ دەبوو دەیانکوتا، یان بە پەلکە شفتی ڕیسوایان دەکرد.
جارێکیان هەمزەی زاوامان بەردەکەوێت تاسیر هەنجنی دەکەن و دەستێکی دەشکێنن لە کۆڵی نابنەوە. ئەوجا عەولا ئاغا لای خۆی

براگەورەی ئاوایی بوو، لە جیاتی لەسەری بە جەواب بێت و هەتا جارێکی تر ئەو کارە ناهەموارانارە سەر هەڵنەداتەوە، بۆ خاتری بەرژەوەندی خۆی کە ئاڵ و وێڕی لەگەڵ خەڵکی شار هەبوو نەکەوتە خەتەر ناوە ناوە بۆ پێکەنین و کات بەسەربردن پێیدەگێڕاوە.
کەفی لالێوی بەهۆی قسەکردن سەری هەڵدابوو سڕییەوە و گوتی:
- بە قسەی ڕەحمەتی سمایلە خڕەی باپیری بەر ئەو گەلەکۆیی یە دەکەوێت و دەست نادات و چنگ قژ دەکاتەوە و هەر زوو چوار پێنج خڕکە بەردان هەڵدەگرتەوە و سەری یەک دووێکیان دەشکێنێت. ئیدی لە ترسانا لێیدەکشێنەوە و دەڵێن:
- جانم لێیگەڕێن کرمانجە کرمانج.
بە ئحمێک قوڕگی خۆی خۆش کرد و گوتی:
- ئەوشالاوە مەکرووفە هەر بەردەوام بوو هەتا ساڵی سوێند خواردن خەڵکی گوندەکان، ڕەویان بەرەو شار کرد و پەرەیان ساند و بووە بن بڕی گەلە کۆیی یەکە و شۆڕشی «١٤»ی گەلاوێژی ساڵی «١٩٥٨»یش چەوسانەوەکەی بەرباد کرد.

* * *

سەرشەقامە سەرەکییەکە دارت هەڵبدابووایە لەبەر ئۆتۆمبێل و تەرەکتەری عارەبانەی وڵاخ و دەستی بە عەردی نەدەکەوت.
خەڵکە نەبووەکە بەر بەیارو لابەلا هەڵەت و زورگ و بستی و کەندو جۆم و تەلانیاندا بووە بەرێ.
پیادە بڕی لەسەیارە پتر بوو. لەبەر زۆری پیادەکە ڕێگە بەر. ڕێگە نەدەکەوت و ناوە ناوە لە هەورازو نشێوی ڕێگاکەدا یەکێک نەترەی دەبرد و هەڵدەدێرا و ئەسکورد، یان قاچی،دەستی دەشکا و لەڕەوەکە، بێ خوایشتی حەزیەوە دادەبڕا.

لێرەوە بۆ حاجی ئۆمەران و ڕانییە و ئەو دیو، بەپێ و کۆڵ بەشانەوەتە بکرێت گۆترە نییەو هەر بە قسە خۆشە. دنیا ساردو سڕو شەوداهاتنیش سەربار.
زۆر پیرونەخۆش شنگیان بڕاو لەملاو لەولا دەکەوتن و شوێنەکە بۆ ڕەبەن و بێکەسان دەبووە گۆڕ.
زۆر دایک لەتاو شەکەتی و هیلاکییەوە کۆرپەی ئازیزی خۆی بە ئاو دادا.
بەدەیان منداڵی ساواو سەرکە و بنکە و فەراقە لەدایک و باوکیان بوونە قەزا و لەخۆیاندا بڕاندن و بوون بە نەوەی کەسانی لاییدە.
ئەو کەسەی دنیا دیتەو هزر تیژ بوو، پێشتر چەند نوردییە نانی دە هەگبە هاویشتبوو، زوو لە ئاوایی و شارۆچکەکانی سەر. ڕێگا پەسارگەیەکی بە ناسیاری و دۆستایەتی یاخۆ بە چاو قاییمی پەیدا کردو بەخاو..و خێزانەوە تێیدا سەکنان.
گورجی پێش ئەوەی بگاتە دووڕیانی دەربەندی «گۆمەسپان» هێزی لە بەدەن بڕاو چۆکی شل بوو بوو..و توانای هەنگاوهەڵێنانی نەمابوو. ناچاری ملی پێکەچ کردو هەتا لەڕەوەکەدا نەبڕێت خۆی و نەبەز بەکرێ سواری عارەبانەیەکی ولاخ بوون:
- ئاخ کرمانج لەژیاندا چەند ماڵوێرانیت. چەند قەلەندەر و قوڕبەسەریت!. چەند چارەڕەش و دەمۆریت!. تۆزی زەبرونەگبەت تەنیا هەر لەسەر پشتی تۆیەو پەراگەندەیی و لێقەوماوی هەردەم نسیبی تۆنە. لە دێرزەمانەوە هەتا ئەمڕۆی حازری هەر چوار ئالت. وێڕای خۆخۆریت دوژمن و ناحەزی دوو سەرە: غەوارە و خانەزایی. هەردوولا دەست لەنێو دەست هەوڵ و تەقەلایانە بەرهەمی خاکت و ڕەنجی شانت بدزن و ساڵ دوازدە مانگ لەسە،

ورگی برسیت مشەیان بێت. تۆش بێ ئاگا لەسەروبەری دنیا و لە دەریای ساویلکەیی و کەم تەرخەمی پشتە مەلەتە و هتا ئەو ساتەش جلەوداریکی ڕاستەقینەت شک نەبردووە پیلت بگرێت و ڕێنماییت بکات. بگرە خراپتریش لەپاش. مەگەر «ئەڵلای ئەرمان لە جێی نەرمان» لە ناخی سۆز و گوڕتەوەت لەو تەرزەکار لە مستە زۆڵانەی خۆت ڕاپەڕیت و بە کون فەیەکونێک بیانکەیتە پەڕوپیسی ئافرەتان. ئەوکات بە بابەوە خەنی دەبیت و کەلەکەی ئۆخەت، بە یەکجاری دەکەوتە عەردی».

ماندوبوون ماوەیەک مرتەی لەبەر بڕی و:«

- ئای. ئەگەر سەرکردەیەکی ڕاستەقینەی خۆت دەبوو، سەرکردەیەک لە شین و شایی دەستەوات بووایە ئەوسا بێگومان نانی ئازادیت لە دوڕدەمی شێر دەردەهێنا و هیچ دوژمنەکیش حەدی نەدەبوو پەنجەی هەڕەشەت لێهەڵشەقێنێت».

هەڵمەت سوود و زانیارییەکی زۆری لەبنەماڵەکە وەرگرت و لە دووڕیانی گۆمەسپان، پێش ئەوەی دابڕێت و..وەگەڵ کەس و کاری خۆی بکەوتەوە بەڵێنی بە نەوەی ڕووتاندا:

- شالالا بەیەک دەگەینەوە.

زانا ڕووی تێکرد و گوتی:

- خەم مەخۆ. خوا یاربێت ڕۆژێک دا دێت دەسەلاتت بەسەر دوژمنەکەتدا بشکێت.

- ئەگەر جەنابتم لە پشت بێت بە مسۆگەری دەزانم.

- دڵنیابە تازە دایکم بڕیاریداوە و تۆ بوویتە ئەندامی خێزانەکەمان و براوە.

بە بزەیەکەوە گوتی:

- لە گەورەیی خۆتانە.
پاشدان ئەمەشی کردە سەربار و:
- بەڕاستی دایکت ئەوەندە بەگوڕو شەوقەوەی ماچ کردم وام هەست کرد کوڕیمە و چەند ساڵ و حەیام لێیدابڕاوم.
- زەردەیەک ئاوقای ڕووی بوو. و گوتی:
- ڕەوشتی ئاوایە ئەگەر لە ژیاندا یەکێکی بەدڵ خۆش بووێت.

* * *

لە دووڕیانی دەربەندە کە هێڵی ئەستووری کۆڕەوە کەس بە کەس نەبووە کە شەقامی دەستە ڕاست و ڕووە و شاری «کۆیە»ی گرتەبەرو ئەوانی تر دەستە چەپ بەرەوشاری شەقلاوە.
حەد وسەدی نوێژی خەوتنان خۆیان کوتا: «دێگەڵە»وە. هەرچۆنێک بوو لە نێوناندینی ماڵێک شەویان بێ پێخەف،تەنیا ساقۆنەبێت بەسەر برد. بە هەندێ باش بوو پێویستیان بەنان نەبوو.
گورجی دڵی دوو سێ منداڵی برسی داکەواند، کە بۆ نان دەگریان.
بەیانی دوای ڕۆژوبان کەوتن سۆزان کە دوو ساڵ لە نەبەز گچکەتر بوو، لەسەر پردەکە هەرکە چاوی بەماڵی مامی کەوت، لە ماڵی مەلا سمایل دابڕاو بە گریان و ڕۆ ڕۆیەکی زۆر بە حوجەتەوە: «
- وەیڕۆ. بابەڕۆ....
- وەیڕۆ. دایەڕۆ....
- وەیڕۆ.. لەخۆم بێکەسێ ڕۆ....
- وەیڕۆ. لەخۆم لێقەوماوێ ڕۆ....
بە پرچ ڕنینەوە زۆڕە زۆڕ بە پیریانەوە چوو. گورجی و زانا حسیان کارەساتێکی زۆر گەورەی بەسەر هاتووە. پاش ماچ کردنی سۆزی دڵدانەوەو:

- ڕۆڵە پێمان ناڵێیت چیت لێقەوماوە!؟.
لەبەر گریان وەڵامی پێنەدراوە.
مەلا سمایل کە دراوسێی عەلی عەولا ڕووتەبوو. گوتی:
- شـەو لـە «کانـی قرژاڵـە» بەیەکـەوە گەیشـتینە گەڕەکـی «نـەورۆز» و ڕەحمەتـی منداڵەکانـی بـە سـواری تەرەکتـەری خۆیـان لەسـەر جادە سـەرەکییەکە چەکدارانـی هەلۆ. ڕێگەیـان دەگرن و ئـەو کیژە نەبێت بۆ ئیحتیاجـی ئـاو چەنـد شـەقاوێک دوور دەکەوتـەوە. لـە نـکاو بەداخـەوە بـەر گوللـە تۆپێکی ڕژێم دەکـەون و لەگـەڵ تەرەکتەرەکە پارچە پارچە بـوون.
گریانی شروان هەوگی گرت و دوای چەند سانییەک ملی لەبەرناوەو:
- ئێمە ناچار بووین سەروپەل و لاشەکانیان دەسبەجێ بنێژین.
ئـەو ڕۆژە نیـوەڕۆ گەیشـتنە سـەیتەرەی کۆیـە و چاویـان لـە فرمێسـکی خەفەتـان وشـک نەببـووەوە.
گورجی لەبەرخۆیەوە هەردەپیرتاند و:
- ئەوەیە بەرهەمی خەبات و تێکۆشانی بەرەی ڕابەر و سەرکردەمان!.
- ئەوەیە پاداشت و ـەدالیای شان و شەپیلکی سەرکردەکانمان!.
- ئەوەیـە دەسـکەوتە مەزنەکـەی بـەرەی چەمـەری کـە چەنـد سـاڵە ئێمەمانانیـان پـێ هەراسـان کردبـوو.
گریان وەستاندی.
قـەدی کێـوی «هەیبـە سـوڵتان» مۆنجـەی دەهـات و لـەدوور..ڕا ڕەش دەچـووەوە.
گورجـی لـە پـەل وپۆکەوتبوو..وزانیشـی کۆچەکـە بـە هەوەنتـە کۆتایـی نایـەت و ئەگـەر بەردەوامیش بێت ڕەنگە وەک دەیان کەسـی پیرو بێ توانـا سـەربنێتەوە.

هەڵوەستەیەکی کردو بێ خوایشتی حەزیەوە لاچەپی سەیتەرەکە دانیشت و گوتی:
- ڕۆڵە من شنگی ڕۆیشتنم لەبەر بڕاوە و شەقاوێکی ترم پێناهاویشترێت.
ناحەقی نەدەگرت و بەزەیی پێداهاتەوە و بە هێمنیەوە گوتی:
- دایە ئەمشەوکە لەبەر تۆ لەشار دەمینێینەوە.
بە دڵی نەبوو. گوتی:
- ڕۆڵە خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێکردووە و جێمان دەست ناکەوێت.
بۆ ئەوەی مەرامی بوو دەراندی:
- ڕۆڵە من پارچە پارچەشم بکەن بێزم نایەت لە سنوور ئاودیو بم.
بە حەیرمانەوە گوتی:
- بۆ. لەبەرچی!؟
- ئەوە ڕاستی بێت نامەوێت پەردەی جاشاتی داگیرکەری ئەو دیو بەسەر خۆهەڵکێشم.
- بە قسەیەکی خەلەفاوی خەملاند و دەمی لەم ڕووەوە قرمساو متەقی لەبەروە نەهات.
- هەرکە پێت لەو دیو سەنگرایەوە، باوکی ڕەحمەتیت گوتەنی:«
- جاشاکی تەواوی بە قایش و قرۆشەوەیت».
هەرکە زانی بۆچوونی باوکێتی مەزەندەکەی فری نەیتوانی کەم و زۆر بەرپەرچی بداتەوە.
- من وای بەباش دەزانم بەرەو «هەرمۆتە» شۆڕ ببینەوە.
نزیکەی کیلۆمەترێک باشووری شەقامەکە بوو.
زانا زانی نیازی ئەو ماڵەیە، لە کۆنەوە دۆستی باوکی بووە. کەچی

لـەو ڕۆژە ڕەش و لێقەوماوییـە کـەس بەکـەس نەبـووەدا، بـرا پشـتی لەبرا کردووەو خزماتی هەڵگیراوە نەخەسەلە دۆستایەتی. بە ڕەوای لە قەڵـەم نـەدا و ملی نەهێنابـەرێ و سکوتی بە هەموار خەملاند. لـە دواییدا حەبرەیـی دایکـی هانیدا زۆر نـەرم بنوێنێت و بـە ساردییەوە گوتـی:

- عەیب نییە!؟.

لەزاری حاڵیبوو، بەحەپەسانەوە گوتی:

- ئەیرۆ. ڕۆڵە بۆ عەیبە!؟.

هەتـا بـاوەڕی پـێ بهێنێـت بـۆ ئـەوان شـتێکی ئاسـایی یـە و بۆنـی شـوورەیی هەرگیـز لێنایـەت بـە ڕوویـدا زیـت بـۆوەو گوتـی:

- باوکـی ڕەحمەتیـت ئەوەنـدەی چانـدووە، ئێمـە ئەمـڕۆ بیدوورینـەوە. خانـە خوێیەکـەش پیاوێکـی ئەوەنـدە مـەردو چـاو گەورەیـە گریمـان مانگێـک لەسـەر . ورگیـان بلەوەڕیێـن ئەوجـا بـەز پێدەگرێـت.

لەبـەر حـەزی دڵـی سـەری ناچـاری، بـێ نقـەو ڕووگـرژی بەخـۆ..دا شـۆڕکردەوە.

تاکو غەللەی لەم ڕووەوە بەبابدرێت هەڵیدایە:

- ڕۆڵـە تـۆ لێـرە نەبوویـت: مامۆسـتا «مەرقـۆس» بـە بیسـتنی کارەساتەکەمان زۆر تێکدەچێت و بەخۆی و خێزانییـەوە شـەوێک هاتـە لامـان و دوو سـێ جاریـش بەتەنیـا سـەردانی کردوویـن.

پیاوێکـی ڕەشـتاڵە و تێکچەقـی و بەخـۆ..وە لـە دوورەوە بـە پیریانـەوە چـوو..و بەوپـەڕی خولـق خۆشـیەوە گوتـی:

- ئەوە چۆنە دایکی زانا ئەو ڕێیەتان غەلەت کردووە!.

بە کزییەوە گوتی:

- غەڵەت نییە لێقەوماوییە.

بەسەربادانی ناڕازیی یەوە گوتی:
-ماڵی برات خۆت و لیقەوماویان گوتووە!.
هەوەستی زۆر پێهات کە مەزەندەکەی لە ئاست زانادا ڕاست دەرچـوو..و:
- لەگەورەیی خۆتانە.

* * *

گورجی بۆ دەنگ و باسێک لەسەر ئاو و ئاگر بوو. پشووی ئەو ڕۆژەی تەواو نەداو گەڕاوە سەیتەرەکە. بەیانیانیش زوو هەموویان بۆ هەمان مەرام دەچوونە نێوشارو شەو بۆ نووستن دەگەڕانەوە. لە هەوەڵەوە ویستیان نەبەز و سۆزان لە ئاواییدا بەجێ بێڵن، بەڵام لەبەر ئەم هەردەم لەبەرخۆیەوە بە کڕی دادەما، نەیانتوانی لە خۆیان دابڕێنن. نەبەزیشیان تێگەیاند هیچ کات لێی جوودا نەبێتەوەو زوو زوو بیدوێنێت.
- سۆزان بۆ..وا بێدەنگیت؟.
بە ئاخێکی کەسەراوییەوە گوتی:
- بێدەنگی لۆ من نەبێت ئەدی بۆ کێ دەبێت.
هەناسەیەکی زگ پێسووتانی هەڵکێشاو:
- ئەوەی خوا بکات ئەو باشە.
بە کزی و مەلوولییەوە گوتی:
- دەزانم، بەڵام ئەوەی من بە چاو دیومە تۆ بتدیت بووایە شێت و هار دەبوویت.
مەراقی وێکەوتن دایگرت و هەر زوو گوتی:
- پێمناڵێیت چۆن بووە!؟.
دەمێک کورکایەوە و سرپلە بازرەقەی لە دیدانی بەستاو بەچاوی مۆلەق و سوور هەڵگەڕانەوە:

- زریـان و کاروانـی بـرام، لێـڵاییـم بۆیاندایـەت سـەریان پەڕیبـوو..و دایکم هەنـاوی هاتبووە دەرەوەو هـەردوو لاقیشی قرتابوون. باوکیشـم دەسـتێکی نەمابـوو..و پشـتە سەریشـی کـون بـوو بـوو.

لـە حیلکـەی گریانیـداوە و بـە حاڵەحـاڵ و نزرگـرەوە ئەمـەی بـۆ تـەواو کـرا:

- چابـوو خەڵکەکـە خواخێریـان بنووسـێت زوو گەیشـتنی دەنـا تەرکتەرەکـە ئاگـری گرتبـوو، تێـدا دەبوونـە ڕەژوو.

هەننـۆب گریـان بەرسـینگی لێسـاندو لـەدوای سـڕینەوەی دەم و چـاوو لـووت فـن کردنـدا گوتـی:

- بەو شەوە درەنگە شاردیانەوە.

بۆ دڵدانەوەی خۆشی گەزەگۆشتی پێ بەرداو گوتی:

- چاکـە تـۆ هەتـا ئـەو عەمـرەت باوکـی خـۆت دیتـووە، مـن باوکـی خـۆم بـە بیرنایـەت و باپیرەشـم، بـێ شوشـتن، بـە شـمەکی بەریـەوە گۆڕغەریـب کـراوە و دایـک و خوشـک و پلکیشـم زنـدە بـە چـاڵ.

بەسەربادانی خەماوییەوە گوتی:

- دەزانم، دەزانم، بەڵام تۆ وەکو من بەچاو نەتدیتووە.

بۆ بەرپەرچی خـەم و کەسـەرانی دوو سـێ کـەڕەت دەستی بەهێدییەوە بـە قژە زەرد و درێژەکەیـەوەی داهێنـاو گوتـی:

- چدەکەیـت وا خـوای گـەورە ئـەو نەگبەتانـەی بەسـەر ئێمەمانانـی هێنـاوە و دەبـێ شـکور بیـن.

- هەر بەسەر ئێمەمانانی هەژار دێت نەک بەسەر گەورەکان.

- زۆر. ڕاسـتە گەورەکانمـان چ بەلایـان ناگاتـێ و عزرائیلـی میللـەت و نەگبەتانـن و ئـ هـ ئەزیـەت کێشـانیان لەهـەردوو دیـودا تەنیـا سـوار بوونـی ئۆتۆمبێڵـی نـوێ و شـاران گەڕییـەوە بـەس. هەویـەی سـەر

سەلامەتیشـمان لـە دوڕ باخەڵـە.
لەم قسانەدابوون، بە ڕاچەنینەوە بەرگوێی نەبەزی هەڵداو:
- ئا. ئەوە بوو ڕێگەی نەدا ئێمە بڕۆین و پێشمەرگەکانی((........)).
- نەیهێشت تەواوی بکات و گوتی:
- مەڵێ پێشمەرگەکانی، بڵێ پێشفیتنەکانی.
ئەمەی نەبیستبوو، کەچی نەیدەویست لە قسەی لابدات و گوتی:
- پێشـفیتنەکانی بەنـاو ڕانەوەمـان دڵیـان نـەرم بـوو بـوو، کەچـی ئـەو سـەگبابە مـل ئەسـتوورو بێدینـە دایـە عینـادی.
- هەرکە هەڵۆی وەبەرچاو ڕەت بوو ئەمەی گوت.

* * *

- سـەر زلەکانـی «بـەرە»ی چەمـەری دەسـتە گوڵـی خۆیـان بـاش وەشـاند و دنیـا بـە کەیفـی ئەوانـە:«.
- خوایە هەر لەو قایدەی ڕاگرێت».
- کـەل و پەلـی ناومـاڵ و سـەیارەو چـەک و عتادێکی یەکجار زۆریـان دەسـگیر بـوو.
- غەرەزیش لەچوونە قەڵات دۆڵمە خواردنە و بەس.
- زۆر. ڕاستە مەخزەنە چەک و تەقەمەنی. فەیلەقێک گۆترە نییە.
- کێ کردی و کێ خواردی؟.
- خەڵکـە هـەژار و نیشـتمان پـەروەر و کۆڵنەدەرەکانـی ژێـر زەبـری کوشـندەی بەعسـەوە ڕاپەڕینیـان بەرپـا کـرد و زەفەریـان بـە قۆشـەنە سـەختەکان برد و کەچـی سـەت جـار بەداخـەوە، بەزیـو..و گەشـتکەری کەنـار دەریـا و خـاوەن ئاشـبەتاڵ و جاشـاتی ئـەو دیـو کـەوا بـەزار دروشـمی پێشـڕەوێتیان چەنـد سـاڵ بـەرز کردبـووەوە، بوونـە سـەر وەسـیەت.

- پێشـرەوی چـی؟ ئەگـەر تۆزقاڵێـك هەسـتی پێشـرەویتیان لـەدڵ بووایـە، وڵاتـی بـاب و باپیرانـی خۆیـان کـە گوایـە هـەوڵ و تەقەلایـان بەنـاو بـۆ ڕزگاری و ئازادیـی بـووە، تـاڵان نەدەکـردو نـاوی پیـرۆزی خۆیـان «پێشـمەرگە و شۆڕشـگێڕ» بـە دز و جـەردە و فەرهـوودەوە ئاڵوگۆڕنەدەکـرد.

- ڕەحمەت لەو باوکەی کە تۆی لێ پاشکەوتووە.

- ئەمە دوانی نێوانی زانا و هەڵمەت بوو.

* * *

بـەری ئـەوەی جێـی قوونیـان گـەرم ببێـت چەنـد چەکداریـان هـەر زوو لـە دەوروبـەری موعەسـکەر، بەنـاوی پێشـمەرگەو هێـزی پاراسـتنی نیشـتمانی ئامـۆژگاری کـراو تەرخـان کـرد. هەرکەسـێك چەکێکـی کلاشـینکۆف بەسـەرەوە، لە«مەشـجەب» ی فەیلـەق دەسـگیر بووایـە، بـە زۆر و خورتـی لێیاندەسـتاند. نـە خەسـەلە یەکێـك دووانـی بەدەسـت بووایـە.

دەسـکەوتی زانـا دوو کلاشـینکۆف، یەکێـك بـۆ مامـی عەلـی و شەشـاگرێکی ناوپاکەتیـش.

زەفتییـە نسـحەتکراوەکانی سـەر.. ڕێـگا بەنێچیرێکـی قەڵەویـان حسـێب کـرد و بـە گـوراح خۆشـییەوە بـە پیرییـەوە چـوون.

ئەویـش هەرچواریانـی ناسـی و زانـی دنیـا چ باسـە و هـەر زوو، وەخۆکـەوت و چـە گەورەکانـی سـوار کـردن و بـە دەنگـی بـەرزەوە گوتـی:

- بـە حەقـی خـوا یەکێکیـان بـێ کوشـتن نادەمـە باوکـی خـۆم و ئـەوەی بێتـە پێشـیش دوڕ هەنـاوی ئاگـر دەدەم.

بـە هەندیـان هەڵنەگـرت و هـەروەک چەنـد کەسـیان بـە فیتـی گەورەکانیان،

پێش ئەو دەسخەرۆ کردبوو. ویستیان لێی نزیک ببنەوەو بەزۆر لەدەستی ڕاستێنن. بۆ هەڵفریوانی زاریان پچڕاند و:
- خوێڕی تۆ چیت. ئێمە بەناوی پێشمەرگە و بەرەوە، بە زۆریش بێت هەر لێتدەستێنین.
- گەلحۆ. بەرگری پێ لە نیشتمانە ئازادکراوەکەمان دەکەین.
- بۆ ئەم مەبەستەش «بەرە» سوپایەکی تایبەتی دامەزراندووە.
گریانی بەو سەردولکانە نەهات و گوتی:
- نەخێر عەفووتان فەرمووو، ئێوە هەرگیز پێشمەرگە نین. بگرە دزو تالانکەر و پێشفتینە و دوژمنی سەرەکی میللەت و. وڵاتن و قەتیش بەرگریتان لە نیشتمان نەکردووە و ناشی کەن.
دەنگی زۆر قاییم کرد و گوتی:
- منیش لەو جۆرە کەسانە نیمە بە فرت و فێڵ و تەڵەکەبازییەوە دەستم لە قۆتی بنێن و هۆ بابینە.
ئەمە قونبولەیەک بوو. و یەکەمجار بەڕوویان تەقییەوە و دەلحاز پێ هاروهاج بوون و بەدیقەتەوە لەسەرو سەکوتیان نواڕی و لەبەر دەمامکەکەی نەیانناسی کێیە ئا..وا خورت لێدەخوڕیت.
بەردەوام بووە و :
- ئێوە نۆکەر و گۆردەی سەفین و هەڵۆن و لە هەموو ڕووییێکەوە بوونەتە قەسابی ئێمە مانانی کوردی هەژار و خاوەن هەڵوێست.
بێ ئەوەی شکیان بۆ هیچ کەسێک بچێت وا وەک شارەزایەک پاشەڵی تەڕیانی تەبەڕا کردو بەملیاندا هات، بەحەپەسان و بەرگرییەکی شەق و پەقەکەوە:
- تۆ کێیت. تاسای ئەو درۆ..و بوختانانە لە ئاست ئێمەی پێشمەرگەی کوردستان دەکەیت!؟.

ڕووی خۆی بێباکانە هەڵماڵی و بەغەزەبەوە بەسەریانیدا نەڕاند و گوتی:
- من درکی دوڕ چاوتانم. خاوەنی سێ پێشمەرگەی شەهیدو چوار شەهیدی ناو تەرەکتەرو پێنج شەهیدی ئەنفالی دزێوی عەرەب بەدەستی چەپەڵی ئێوەی بەناو پێشمەرگەوە.
بەناسینی تاوانە نامرۆیەکانی خۆیان هاتەوە یاد و بە ڕاچڵەکینەوە ڕەنگیان پەڕی و تاسانیش هەر هیچ. بەتایبەتی دەروێشکانی سەفین. بەرۆکی هەڕەشەکەی بەرنەدا و گوتی:
- ئەوجا زانیتان من کێمە و پیاوبن، مەردبن وەرن لێم بستێنن شەرت بێت هەتا تۆڵەی ئەو چەند هەزار شەهیدەی ئەنفالی دووەم و سێیەم بەدەستی چەپەڵتان زندە بە چاڵ کران، لە هەر چوارتان نەکەمەوە پەنجە لەسەر پەلەپیتکە هەڵنەگرم. ئەوکات خۆشم تێدەچم بە گونی بارگینم.
ئەمەی دوو بەش بۆ داخزانی ورەیان بوو..و بەس.
هەرکە ناسییان لە نەوەیەکی وایە گێلمەگێلمە نازانێت و دەست ناپارێزێت، لەلایەکی دیکەوە خیانەتەکەیان هەتا ئەو ساتە لە بن بەرەی نهێنی دابوو لێیان هەڵماندراو بوونە سرەی نێو پشتیران و چاوی بیمیان بەخۆدا شۆڕکردەوەو هەتا لێیان بزر نەبوو جورئەتی شەکرشکانێکی دیکەیان نەبوو.
لە عاجباتی ڕزگاربوونیدا سەفینی دەم ڕاستیان هەر ئەو سات ئاگادار کرد. لەموعەسکەر لەگەڵ هەڵۆدا سەرپەرشتی چەند دەستەی تری چەک وەرگرتنیان لەخەڵک دەکرد.
- نەک خۆی بگرە دایکی و برازاکەی و گۆرانی ڕەمەزانە خێڵیش لە ئەنفال دەرباز بوونە.

* * *

- چۆنی تێدەگەیت؟.
لەژێر زمانی گەیشت و:
- لەو. وەزعە؟.
زانا و هەڵمەت لە نێو بازاڕی شاری کۆیە، یەکتریان گرتەوەو خۆیان خزاندە نێو چایەخانەیەکەوە و:
- بەڵێ.
دوای مڕدامانێکەوە بە زەردەخەنەیەکی تەڵخەوە گوتی:
- هەروەکو پێشتر گوتم:
- خوا بۆ سەر زلەکانی بەرەیداو بەهاریان بۆ هاتووەتە چۆکان و بە بابەوە خەنی بوون و بە کونفەیەکونێک بوونە حەمە قەدۆی زەمانە.
- ڕاستە. سەدەی بێخمە یان جگە لە ئەوەی فرۆشتنی خیانەت بوو، ئەگەر مرۆیانە سەرپەرشتی فرۆشتنەکەی بکردبووایە، بێگومان بەشی «ئاردی» دوو ساڵی خەڵکە برسییەکە دەکرد. کەچی ئەوەی لای ئەوان مەبەست نەبێت تەنیا میللەت و نیشتمانە و بەس.
- لەگەڵ ئەو دۆستە دێرینەیان کەوا پشت لە دوای پشت گۆردە و چەورە و خوبزەی داگیرکەران بووە ڕێککەوتن و تەرزی پاداشتێکی ئافەرین لە کردەوەکانی:
- بەرپەرچی کوردایەتی، بەشێوەیەکی ڕەمزی بە پێنج شەش ملیۆن دیناریان پێشکەش کرد.
- ئەدی خڕکردنەوەی ئەو چەک و تەقەمەنیانەی موعەسکەر؟.
- ئەوە هەر لە ژمار نایەت.
- ئەوجا لەبریتی لەسەر خەڵکە دڵسۆز و ڕاپەڕیوەکەی دابەش بکەن و بۆ دوارۆژ هێزێکی چەکداری تەنزیمی میللی پێک بهێنن و بەرگری

پـێ بکـەن خێـرا وەک بـۆ ئـەو ڕۆژە تێکۆشـا بـن و تۆڵـەی نـان و نمەکـی مێـژەر لەسـەرە. داگیرکـەرەکان بکەنـەوە، کـە چەنـد سـاڵە، لـە مشـە بەخێویان دەکـەن. هەموویـان لەنرخی سـەدەکە، کەمتر ئاوا کرد. سـەیارە دزراوەکانیـش هـەر هیـچ.

- بـە بۆچـوون و مەزەبیـان ئـەو بـە مـراز شـادبوونەیان گەلێـک لـە کورد و کوردسـتان پیرۆز و بـە نـرخ تـرە. هەربۆیـەش میللەتیـان کردە پـاش قـەرەوری بارگـە و بنەگاکانیـان.

هەڵمەت لەزاری حاڵیبوو..و:

- ڕەحمەت لە شیری خۆت و ئەژدادت.

- ئەوجـا بـۆ ئـەوەی وەک سـەرکردە سـەیتەرە لەسـەر خەکەکـە بکـەن و بـۆ چـاو پۆشـین و لـە خشـتەبردن خۆیـان و خزمەتکارەکانیـان سـەلتە زەلام بـە ئۆتۆمبێلـی گچکـەی مۆدێـل تـازە و سـووک بـۆ قوچانـدن مانـەوە.

بە خەندەیەکی ڕەزادارەوە گوتی:

- ئەوە یان کەسی عولعولی و منداڵیش هەست پێدەکات.

- دەڵاڵێـک کۆمەڵـە کاوڕێـک دادەبەسـتێت و بـە هەمـوو توانایـەوە خزمەتیـان دەکات هەتـا دوا ڕۆژ پـاش قەڵەوبوونیـان بیانفرۆشـێت و شـتێکی قازانـج بێتـە دەسـت، یـا خـۆ نـاوە نـاوە یەکێکیـان بکوژنـەوە خۆشەویسـتی ئـەو خەڵکـە نـەدارو کۆسـکەوتە لـە دڵـی داغمەدارەکانـدا ناگاتـە ئاسـت ئـەو خۆشەویسـتییە. ئـ.ـە. شـوانەکە بـە نەخۆشـیانەوە، یاخۆ مرداربوونـەوەی یەکێکیـان زۆر دڵتەنـگ و خەمبـار دەبێت. کەچـی ئەوانـە بە ورگ دڕانـی ئـەو هەزارەهـا کەسـەوە تەقـەی سـەریان دەهـات. بەیانـی ڕۆژی دووەم تاکـو خەڵکـە کۆ..ڕەوەکـە نەترەیـان بەیەکجـاری بەربدەن و لەناخـەوە بڕووخێن ئـەوکات هاتنـە بن باریـان زۆر ئاسـان

دەبێت و دەتوانن «عارەبی» سواری سەرملیان بن و نقە لەکەسیشەوە نەیەت پڕوپاگەندەو درۆی زل زلی لابەلایان لەبەرو بازاڕو شوێنە گشتییەکانی شاری کۆیە بڵاوکردەوە. گەورەو بچووک نەمان چەند جار لەگوێیان نەزرینگێتەوە.

- ڕژێم قەسابخانەی لە شاری هەولێر دامەزراندووە.
- بە سەتان کەسی گوللە باران کردووە.
- کێشکەی ببینێت ڕەمی دەکات.
- هاتنە دەرەوە بۆ ئاوخواردنەوەش قەدەغەیە.
- کەس خاوەنی ناموسی خۆی نییە.
- وێڕای ئەوانەش بازاڕ و ماڵەکان زۆربەیان تاڵان کراون.
- ئەوانەی ماویشن هێشتا پێڕانەگەیشتوونە.
- زۆر خانوو..بەرەو بینا لەبن و بۆتکەوە تێکدراون، یان تەقێندراونەتەوە.

گورجی لەحەیفی شارە ئازیزەکەی و نەخاسمە خانووەکەی خۆیان، لەدارەتی دنیادا هەر ئەوەندەیان شک دەبرد. دواڕۆژ تێیدا بەحەوێنەوە، ئەویش ڕووخابێت دەکەونە سەرساجی عەلی و ئابوپ دەمینێنەوە کاری لەهەست و هۆشی کردو تەرزی ساواری سەرسوپای بە قشپل لە هەناوەوە بڵقە بڵقی بوو.

هەتا دەنگ و باسێکی یەکلایانەی چنگ کەوێت لە عەردو بەردی خوا تۆتکەی نەدەگرت.

بۆ بەیانی لە ڕۆژان زۆر زووتر خۆی گەیاندە سەیتەرەکە و عەرەب و عەجەم لای هەولێر دەرکەوتبووایە تەنگەتاو بە پیریەوە دەچوو..و:

- ئەرێ دەنگ و باسی ناوشارچییە؟
- من لەوێڕا نەهاتوومە هیچ نازانم.

- بیستوومە ئاتاری لەسەر پاتاری نەماوە.
- چۆنت پێناخۆشە وای لێکراوە.
- زندەماڵ و مردە ماڵ نەماوە فەرهوود نەکرابێت.
- ئـەوەی راسـتی بێـت مـن خەڵکـی شـار نیمـە، بـەڵان هێندێـک دەڵێـن کوێربووەتـەوە، هەندێکیـش دەڵێـن دەرزییەکـی دەسـت لێنـەدراوە.
جـار لەجـار پتـر دادەتڵـەکاو پرزەبڕاوتـر دەبـوو، ئـەو ڕۆژە هەتـا نوێـژی عەسـریش چ خەبەرێکـی خۆشـی بەرگـوێ نەکـەوت.
دوای بانگـی مزگەوتـەکان لەنـکاوڕا پیکابێـک دەرکـەوت و لـە دوورەوە ناسـی و بـە گـوڕی گورگـە لۆقـەوە بـەرەو. ڕووی چـوو، پێـش ئـەو بگاتـە سـەیتەرەکە چـووە پێشـی و رایگـرت و خـدرەلار بەتەنیـا و پشتەوەشـی لەکـەل و پـەل و زەخیرەی پێویسـتی ئاخنـی بـوو، لـە جیاتـی ماندووبـوون لێکـردن بـە هەشـتاوییەوە گوتـی:
- کاک خدر ئەوە بۆ دواکەوتوویت و ئەدی مندالەکانت؟.
- ئـەوەی ڕاسـتی بێـت ئۆتۆمبێلەکـەم تێـک چووبـوو..و فیتەریـش چنـگ نەدەکـەوت، منداڵەکانیشـم پێـش خـۆم کەوتوونـە.
چیتر ماوەی نەداو بە دەنگی بەرز و مەراقەوە گوتی:
- ئەدی بە قوربان ئەمڕۆ لە هەولێر ڕا هاتوویت و دنیا چ باسە!؟.
ئـەو پرسـیارەی لـە ڕێـگادا زۆر لێکرابـوو، دەیزانـی حەبـرەی چییـە و بـە ڕووێکـی گـەش و عوبابـەوە گوتـی:
- بەڵـێ ئەمـڕۆ. پـاش نیوڕانێکـی درەنگیـش لـە ماڵـەوە بەڕێکەوتـم و مزگێنـی شـارچی بەسـەر هاتـووە، تەنیـا ڕۆژی یەکـەم نەبێـت بەهـۆی چەنـد تەقەیەکـی داغمەدارەکانـەوە بەنـاوی بەرگرییـەوە خەڵکێکـی زۆر کـوژراو و چەنـد مـاڵ و دوکان تـاڵان کـران. ئیـدی لـەو ڕۆژەوە دنیـا شـامی شـەریفە و شـارێکی کش و مـات و خەڵـک بـە کەیـف و ماشـای

خۆیـان دەسـوڕێنەوەو و بەکەسـیش ناڵێـن:«
- پێت خوارداناوە».
گورجـی پشـووێکی ئۆخـەی سـەرفرازانەی خـواردەوە و ڕنگـە ڕنگـی دڵـی هێـور بـووەوەو ئەوسـا بـۆی یـەکلا بـووەوە:
- داغمـەدارەکان ئـەو خەڵکـەی بـەگاو کـەر حسـێب دەکـەن و وەک مەیمـوون بۆ بەرژەوەندی خۆیان هەڵیاندەپەڕێنن.
- ئـەو هەمـوو درۆ..و دەلەسـانەیان تەنیـا بـۆ چەواشــە و سەرشـێواندنی میللەتـە و هەتـا ئاگایـان لە»مەحموودی بێزەواد»ی قەسـابخانەکەی پێری ببڕێـت و هەننـۆب قـۆڵ و باسـکی تاوانیـان لـەدزی و ڕاوەڕووت و فـڕان هەڵماڵنـەوە و هیـچ هزرێکیـش کـەم و زۆر تاوانـی بەلایانـدا وەنەچەرخێنتەوە.
کـە دوو ڕۆژ بـوو مقۆمقـۆی نارەزاییـان لەمـلاو لـەولا بەرگـوێ دەکـەوت:
- نازانین ئێوارە بۆ ئەو خەڵکەیان قەدەغە کرد؟
- بڵێین چی.
- ئەگەرنـا هەتـا ڕۆژ دەبـووەوە زۆربەیـان لـە قـەوام دەردەچـوون و ئـەو مەرگەسـاتە مەکرووفـە ڕووی نـەدەدا.
- ناوەڵلا ڕووی نەدەدا.
- مەگەر بەدەگمەن، ئەویش تاک و تەرا لەملاو لەولا.
- ئەمەش بەهەند هەڵنەدەگیراو هەرگیز نەدەبووە سۆی سەر دڵمانەوە.
- ئەوە گوتنی ناوێت.
- گوایا بەناوی بەرگری کردن بوو.
- تەڕ بەرگریان کرد.
- ئەگەر بەرگری پاشەکشەشیان بە ئاستەم بکردبووایە هەرنەییسە.
- ڕێوییانە سەر قافڵەی قوچاندنی بەزین بوون.
- ڕێگە لەبەر ئەوان بەرکەسی تر نەدەکەوت.

هـەر لـە پێنـاو سـەیتەرە کـردن و خافـڵان و پێکانـی مەبەسـتی تایەنیـان، هەرکە ئەمەیان لێ سپی بووەوە، جگە لـە خدرەلار هەتا بەیانی هیتریشی بـەدوا داهـات، ڕۆژی دوایی لژنـەی «درۆسـاز دان و هەڵبەسـتان»ی سـەر زلــە بەرژەوەندارەکنــی بــەرەی چەمــەری درۆی تــازە بابــەت و هەســت بزوێنیـان بڵاوکـردەوە:

- دوژمـن لەبـەر هەلـلای باشـوور هێزێکی ئەوتـۆی لەنێو شـاری هەولێر و دەروبـەری نەمـاوە.

- لە پێنج شەش دەبابەی کۆن و فریشقە بترازێن چیدیکە بەدی ناکرێن.

- بـە شەسـت حەفتـا پێشـمەرگەی بـە جـەرگ و ئـازا و جەڕبـاوی جەنـگ دەتواندرێـت شـار بگرنـەوە.

لەهــەر لاوە دەنگــی گەنجانــی ڕاپەڕیــوی ڕاســتەقینە و دەروون مەڕانــی لەدنیــای سیاســی و فیشــاڵی ســەر زلــەکان نــا بەڵەدانــە بەرزبــووەوە و گوتیــان:

- بەسەرو گیان هەر ئێستا ئامادەینە بەم ئەرکە پیرۆزە هەڵبستین.

زۆریان هەوەست پێهات و گوتیان:

- یاللا دەی لەوچاوەنانە لە هەنووکە زووتر نییە.

هێندێکی تر هەرزوو بەسەربادانی قار و ناڕەزاییەوە گوتیان:

- ئێمە بەم ئەرکە نیشتمانییە پیرۆزەی فەرمووتان هەڵناستین.

خەنجەرێکیان لێبدرابووایە لا ئەهوەنتر بوو.

ڕوویان دڕدۆنگ هەڵگەڕاو بە هەڵچوونەوە گوتیان:

- مــادام بەرگـری لەشـارە ئازیزەکـەی خۆتـان ناکـەن دەبـێ هــەر ئێسـتا چەکەکانتــان تەسـلیمی بــەرەی نیشـتمانی بکــەن.

سەریان کەم و زۆر نەهێنا بەرێ و بە قارەوە گوتیان:

- چەک چەکی خۆمانە و بە کوشتن نەبێت نایدەینە دورچاومان.

لەملیان زۆر گران بوو، کەچی بۆ ئەوەی لەم ساتە ناسکەدا نەبێتە ناکۆکی و ئاژاوە خۆیان بوارد.
چەند کەسانێک لەسەردەرخستنی درۆ بەبارەبارەکانیان لەملاو لەولای بازاڕی کۆیە دەسگیر کران.
ئەوەی لەکاتی تەحقیق کردندا ناسیارێکی لەسەر زلەکان بەرچاو بکەوتبووایە، هەر ئەودەم بێ پرسیار ئازاد دەکرا.
بە پێچەوانەوە ە ژووری دەپەسترا.
خدرەلار یەکێک بوو لەسەر خەبەرەکە بانگ کراو ڕۆژێک ماوە هەتا بە کەفالەت لە کۆڵی بوونەوە.

* * *

لەگەڵ نوێژی عیشادا چەند گەنجی خوێن گەرم و نیشتمان پەروەر و ساویلکە و خۆشباوەڕ خۆیان بۆ ڕزگارکردنی شارەکەیان بەسۆزەوە تەیار کردو شەو مابوو گەیشتنە بەرزایی یاڵەکەی پشت «کەسنەزان» کاتێک دنیا ڕوون بووەوە، لەهەر لاوە درانە بەر گوللە تۆپی ئەو دەبابانەی چەشنی پەرژین گەمارۆی شاریاندا بوو..و بە پرەپرو هەڵەداوانی سەر سەلامەتییەوە قوتار بوون.
«حەیاقەترە ئاوێکە هەرکە ڕژا هەڵناگیرێتەوە».
گورجی وەبەر گوێی زانای هەڵدا، یەکێک بوو لەو قەلقەلاشکانەی وەبەربای درۆی کەوتبوون.
- کاربەدەستانی بەرە هیچیان تێنەهێشتەوە، وەک میللەتی خۆیان بە بنیادەم حسێب نەکەن گوێیان لەئاستیدا هەرگیز بەخەجاڵەتی درۆ سپیبوونەوە نابزوێت.
زانا بە ملیدا هات سەری تەوازووی بۆ لارکاتەوە.

* * *

ڕۆژی چوارەم دیسان لە پێناو بەرژەوەندیاندا درۆی دیکەیان خستە بەروبازارەوە:

- شاری زێڕی ڕەشمان گرتەوە.
- شاری کەرکووکی ئازیزمان دووبارە ئازاد کردەوە.
- شاری دڵ و قودسی کوردستانمان ڕزگار کردەوە.
- شاری بابەگوڕگوڕ و قەڵاو خاسەمان ساندەوە.

ئیدی لاوە دڵ پڕسۆزی هەستە نەتەوایەییەکان بەم پفەش بە حەوا هەڵچوون و ماسوسکانی دەست بەشایی و هەڵپەڕین و گۆ..وەندان بکەن.

تەقا ئەوەشیان هەر بۆ ئەوە بوو میللەتەکەیان ببنە قەڵغانی دەربازبوونیان.

گورجی بەجارێک حەپەسا هەرکە دیتی زاناش هەنتۆب بەشدارە، ئیمانی لە بەدەندا نەماو چاوی تار هەڵگەڕاو پشوو سوار خۆی پێنەگیراو لەنێو عەشاماتە گڕگرتووەکەدا بەدەنگی بەرزەوە بە ڕووی تەقییەوە:

- بریا باوکت بۆ ئەم ساتە بمابووایە و تۆی بەچاو بدیتبووایە کە ئا..وا بە پیکی بوختانکەران بۆ بەرژەوەندی دزو بکوژ و خوێنڕێژی ئەو میللەتە قوربەسەرە ئاوا بەجۆش و خرۆشەوە هەڵدەپەڕێت!.

پێشتر لە چوونی بۆ شاری هەولێر بۆی نەسەلماند کە بە ڕووی هەڵشاخاو:

- ڕۆڵە تۆ هەتاکەی بە درۆی ئەو پێشفیتنە خائینانە بڕوا دەکەیت!. ئـ هـ وا دیارە ئێوارەکەت لەبیرچووەتەوە هەتا دایکی خەڵکەکەیان بە ((........)) چ شەکریان دەشکاند.

لای وابوو هەرلەگەڵ ئەویشی نییە، کەچی بەپەند بردنەکەی پێشتر

پشتە دەستی خۆی سووتاند بوو..و کاتێک لێی حاڵیبوو دەلحاز کزەکەی کرد. لاوەحارگرتوو..و دوورنەبین و عولعولییەکان بە چاوی قارو دەغەزەوە بۆیان ڕووانی و بە ڕوویدا هەڵچوون و گوتیان:
- پیرێژن وا دیارە لەدڵت گرانە ئازیزترین شارمان هاتەوە ژێر دەست.
گریانی بۆ مێشک بە تاڵەکانیانەوە هات و:
- هەر ئەوەندەی دەڵێم:«
- سەلاو لەخۆتان و عەقڵتانەوە، ئ.هـ هەتا خاوەن لاوی عەقڵ قورە و تووڕ تووڕ بەجۆیانی وەک ئێوە بین حاڵمان هەرگیز لەئەمڕۆ چەلەنگتر نابێت».
بەسەربادانی نارەزاییەوە گوتی:«
- ئەوانەی دەڵێن بەو هەموو چەکە زۆر و چاکەی دەستیانەوە بەرگەیان بۆ سونەتیش نەگرت و شارەکانیان بەسانایی تەسلیمی دوژمن کرد تازە بەتازە دوای تڕێ خەپشەی بڕێ دەتوانن بیانگرنەوە هۆ بابینە».

* * *

کاربەدەستانی داگیرکەری شاری کەرکووک، هەرکە دەنگ و باس ڕاپەڕینی میللەتی کوردیان لەسەرتاسەری کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ دەبیست کەوتنە نێو دەریای دڵەڕاوکێی ترسەوە. تەرحی ئاویان بە کون وەربوو بێت ڕۆژ تا ئێوارە بە هەلیکۆپتەر هەر چوار ئالی شارەکەیان دەپشکنی.
تاکو بەیانییەکی زوو لەگەڵ دەرکەوتنی تیرێژی جوقەی خۆرەوە ئاگادار کران:
- هەر لەدوڕ شاری هەولێرەوە، بگرە هەتا شارۆچکەی «پردێ»

سـەیارەی هەمـە چەشـن، بەپانـی شـەقامەوە، دوو، دوو..و سـێ سـێی بـێ پسـانەوە وکەلێـن تێبـوون، بـە هەلەداوانـەوە ڕوویـان لـە شـارە. ئەمـە ناوکـی ورەو غیرەتـی کەتانـدن و دەسـت و پێـی جورئەتیانـی شـەتەکدان.

ئەوانـەی تۆزێـک بـە جـەرگ و غیـرەت بـوون تێیـان نەقوچانـدو تـڕە بەرگرییەکیـان کـرد، بـەڵام هـەرزوو حسیان بەرگـەی هێزی وڕووژانـی میللەتـی چەوسـانەوە ناگـرن دێلەحیتانـە، بەپاشـەڵی تـەڕی سـتەم و خەجالەتـی ((٢٣)) بیسـت و سـێ سـاڵەوە فرتکەیـان دایـە.

خەڵکـە پـرزە بـڕاو..و کۆسـکەوتەی سـاڵەهای سـاڵی ژێـر چەپـۆک و پۆسـتاڵی بەعسـی داگیرکـەرەوە، بـە عەزرەتـی ئەمـڕۆژەوە بـوون و پشـووی ئۆخـە و ئومێدیـان بـۆ یەکەمجـار لەناوەڕاسـتی حەفتاکانـەوە هەتـا ئەمـڕۆی حـازری بـە سـەرفرازی و خـۆش گوراحیـی بخۆنـەوەو لەهـەرلاوە، شـەقام و کوچـە و کـۆڵان و بەرقاپـی ماڵانـەوە بەچەپڵـەو هەلهەلـەی ئـازادی و سەربەسـتییەوە ڕژانـە پێشـوازییانەوە:«

- بژی پێشمەرگە. بژی پێشمەرگە.
- بژی پێشمەرگەی مان و نەمان.
- بژی هێزی کوردایەتی.
- بژی خەبات و تێکۆشان.
- بژی هێزی کوردستان، یان نەمان».

ئـاوی دەسـت خۆشـی و پیرۆزبایـی یـان لەگشـت لاوە بەسـەریاندا دەپڕژانـدن و نۆباتیـش دەسـت لەمـلان و ڕامووسـانیش دەچوونـە پـاڵ و هاواریـان دەکـرد:

- هەر بژی ڕۆڵەی چاونەترس و جەسوور و ڕزگارکەری کوردستان.
- یاخوا بەخێربێنەوە سەر گلێنەی چاومان!.

- پێ و قدوومی موبارەکتان شارەکەمانی پیرۆزو ڕووناک کردەوەو هەرچی خەم و کەسەرو داخی داگیرکەران بوو لە ناخمانەوە، بە یەکجاری سڕانەوە.
شایی و زەماوەند و بەستەو گۆرانیش سەربار.
- بە هیممەتی بازووی ئەو هێزە مەزنە، کەوا شوێن نەما لە نێو شاروشەریکەی نەوت دەستی بەسەردا نەگرن. پشتی دڵنیایی یان بۆ هەتا هەتایە کردەوەو جارێکیتر بە خەونی شەوانیش ناگەڕێنەوە ژێرچەپۆکی کوشندەی عەرەبی داگیرکەرەوە، کە ئاواتی هەرە گەورەیان بوو..و مردەی ئەو ڕۆژە پرشنگدارە.
کەچی کامەرانی و سەرفرازییەکەیان دوو سێ سەعاتی نەخایاند و بەرەواژیی حەز و خواستی بۆچوونیانەوە تاک و تەرا نەبێت، قارەمەندی تێکڕا، ئەوەی لەسەر شەقام و کوچە و کۆلانان پاشدان گەراج و حەوشەی ماڵان، کەوتە بەر سێرەی دیدانەوە خڕیان بێ پەردەی شەرمەوە ڕامالّی.
هەر بابا بوو «ئۆتۆمبێل، مەکینە، سەلاجە، موجەمیدە، موزەخە. هەتا بوتلەغاز»ی هەڵتەک هەڵتەکی سەرشانان بەرەو دواوەی قوچاند.
بۆ خەڵکە تامەزرۆی خۆشی و عەزرەتی هەستی ئازادی و دیدەنی هێزی پێشمەرگایەتی ساڵەهای ساڵیان زۆر چاک والابووە:
- کەر لە کوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە!.
- سەت حەیف و مخابن ئێمە هەتا ئەمڕۆی حازری لەڕاست ئەوانە سەرچیغ چووبووین و لامان وابوو هێزی ڕاستەقینەی کوردایەتین و ڕۆژێک هەر دادێت لە ژێر باری عەدالەت و ڕەحمەتییان بسێینەوە.
کەچی بەداخەوە لە کەم فامی و عەقڵ قوندەیی خۆمانەوە، نەمانزانی

هێـزی دزیـن و ڕاوە ڕووتـن. ئەمانـەش لای عـەرەب و عەجەمـان ئاشکرایە جگـە لـە پاشـە ڕۆژێکـی ڕەش و شـووم چیتریـان لێڕەچـاو ناکرێت.

- ڕەحمەت لەو باوکەی کە تۆی لێبووە!.

دەلحـاز شـپرزەیی و نائومێـدی و خەمبـاری لـەم ڕۆژە پرشـنگدارە بەسـەریاندا زاڵ بـوون. بـە خەیاڵیانـدا هەرگیـز گـوزەری نەدەکـرد پێشمەرگە بەم تـەرزە ببینن پەڕۆ..و پاتاریـان لا لەئازیزترین شـاریان گرنگتـر بێـت.

هـەر ئـەو سـاتە بـەم کارە چـرووک و قەڵـپ و نامرۆیانـە هەسـت و سـۆزی نەتەوایەتـی و نیشـتمانی لـە ناخـی زۆران، کەتـا ئـەو ڕۆژە واچەکەرەیـان کردبـوو بەهیـچ هێزێـک نەدەهـەژا هێـدی هێـدی فـس بۆوەو کورکانـەوەی خەفەتـاوی لەبەرخۆیـەوەی چەنـد ڕۆژ شـوێنیانی پڕکردەوە، بۆ یەکەمجـار باوەڕیان لەمێژووی ژیانیاندا واشلۆقا هەتا ڕۆژی حـەلاو. وەلایـێ نەگەڕێتـەوە دۆخـی جـاران».

زۆریان لەدڵ گران بوو. بە هەڵچوونی غەزەبەوە:

- بۆ پیرێژن!؟.

دەیزانـی لەلایـەن سـەر زلەکانـەوە مێشـکیان لـە «کاوکـۆت»ی درۆ..ی دوو زەردێنـە وا زاخـاو دراوە بـە هیـچ بەڵگە و قسـەیەک داناوەرێتـەوە و قڕوقەپـی زۆر لا هەموارتـر بـوو.

لێکرا بە پێکەنینێکی تەوساوییەوە گوتیان:

- وا دیارە لاسیلکی غەیبت بۆ کراوە!.

حێل تر لە حریتەیانداوە و بووە سەرنج کێشی کەسانی دووریش.

- کوڕە شایی یەکەتان بە قسەی پیرێژنێکی خەلەفاو تێک مەدەن.

* * *

گورجی شەوی پێنجەم بەڕووی زانای هەڵداو گوتی:

- ڕۆڵە بەو دانی ئێوارەیە خەڵکێکی زۆر چوونەتەوە هەولێر، منیش بە تەمامە خوا عەمر بدات سبەی وەکات لەگەڵ نەبەز و سۆزان بچینەوە.

چی لەم بارەیەوە دەسەڵات نەبوو لە ئاستیدا و ئەمەی گوت:

- لەخۆتان ناترسێن؟.

- ئێمەش سایلی ئەو خەڵکەی چوونەتەوە.

مەرقۆس بە ڕەوای نەزانی و گوتی:

- دایکی زانا وای بەباش دەزانم چەند ڕۆژێک هەتا خەڵک زۆر بچنەوە و لە هەولێریش ڕابێنەوە سەبر بگرن.

بە ئاهێکی کەسەراوییەوە گوتی:

- مامۆستا بۆچوونەکەت جوان و ڕەوایە، بەڵام من کەریمە کوڕی دۆستمان دیت، پیاوێکی دنیا دیتە و لە شتانیش دەزانێت و گوتی:

- دوژمن لە شاری کەرکووکەوە بە ڕێگەی دارەمانەوە، بە دەبابەیەکی زۆرەوە ڕووی لەشاری کۆیی یەو منیش بەو تەمەنەوە گۆزەگۆزی دیکەم پێناکرێت و ناشمەوێ ئەو دیوبم و دووماڵیشمان بێخاوەن بەجێماون.

بەحەیرمانەوە گوتی:

- ئەدی ئەو کەرکووک کەرکووک گرتنەوەمان لە چی!؟.

بە بزەیەکی تەڵخەوە گوتی:

- مامۆستا بە قوربان هەر هەمان پیلانەکەی شاری هەولێرە. تەنیا بۆ خافڵاندنی ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووت و بێدەرەتانەیە و بەس.

مەرقۆس دەمێک سەری داخ و ناڕەزایی لەراندەوە.

- مامۆستا بڕوابکە ئەگەر بۆ ئۆتۆمبێلێکی دزیاری چەند کەسان

بەکوشت بدەن ئەوجا خۆیان بەسەرکەوتوو دەژمێرن.
ڕووی ئامۆژگاری تێکرد و گوتی:
- ڕۆڵە چەکەکان دوان بفرۆشەو پارەی ئەوەی مەلا سمایل هێنابووی بۆ سۆزانی بنێرەوە و ئەویدیش بۆخۆت.
چێشتان گەیشتنەوە ماڵ و دوای پشوودان و دڵنیابوون هیچ شتێکیان دەست لێنەدرابوو، هەتا ئێوارە بە گریان و نووزانەوەیان لەسەر قەبران بردە سەر.
گورجی کەلوپەلی ماڵی سۆزانی ڕۆژی دوایی گواستەوە.
بۆ نیوەڕۆ بەرگوێی کەوت دوای ئەوان بە سێ ساعات سوپای دوژمن چووەتە شاری کۆیە و خەڵکە ئاوارەکە دووبارە پەراگەندە بوونەتەوەو زۆری دەغەز خوارد و هەزار نەفرەتی حەواڵەی سەر زلە درۆزنەکانی بەرە کرد و:«
- نەفرەت لە خۆتان و هەڵس وکەوتتان.
- نەفرەت لە مامۆستاکانتان.
- نەفرەت لە ئاغا داگیرکەرەکانتان.
- نەفرەت لەوکەسانەش لەگەڵتانن.
- دەگ داوەشێن. بمرن. داڕزێن بتوورێنەوە چۆن دڵتان بەروەستیدا، بەناوی شۆڕشی کوردایەتییەوە ببنە گورگی دەم بەخوێنی میللەتەکەتان».
سەری قارو خەفەتانی بەخۆ داشۆڕکردەوەو لەگەڵ بەرزکردنەوەیدا:«
- ئـ هـ چۆن باوەڕم بەخوا هەیە، ئاواش باوەڕم هەیە تاکوو ئێوەی ئەندامی بەرە سەرکردەو جلەودار بن حاڵی کورد لە ئەمڕۆ شەنگتر نابێت».
لە دەروونەوە پێچیداو لەم سەین و بەینەدابوو ئەمەی بەیاد هاتەوە:«

- لـە شـاری کۆیـە هەرکـە هەڵـۆی سـەرکردەی لەنێـو سـوپەرێکی نوێی ڕەنگ سووری دیت، هەتا خەڵکەکەی دەوروبەری پێ بحسێن بەدەنگی بـەرزەوە گوتـی:
- کاک هەڵـۆ پیـرۆزە، پیـرۆزە، ئـەم سۆپـەرە سـوورت موبـارەک بێـت، بەڕاستی ڕەنگێکی قەشـەنگ و دڵگیرە! ڕابردووی خوێناوییە و لەگەڵ نرخەکـەی پێتداوە دەوەشـێتەوە.
زەینی بۆ ئـەوەی مەرامـی بـوو نەدەچـوو، نەیدەزانـی مەرامـی چییـەو بە هەندی هەڵنەگرت و. ویستی بێ نقە پێی پێوەنێت کەچی گورجی خێرا چووە پێش سـەیارەکە و دەسـتێکی هاوێشـتە سـەر بۆدیەکـەی و بە هەمـوو دەنگییـەوە، لەگـەڵ هەڵشـەقانی دەسـتەکەی تری و گوتی:
- هـۆ. خەڵکینـە هـۆ... ئەوسـۆپەرە نـازدارەی نابینـن وا لەژێـر کاک هەڵـۆی قارەماندایـە.
نەیدەناسـی و لـە هەوەڵـەوە پێی عەنتیکە بـوو. بۆ ئـەوەی دوا ئەنجام وێکەوێت بۆ.. وا دەکات بـە زەردەخەنـەی کپییـەوە لەسـەرو سـەکوتی ڕووانـی.
- هەڵۆی ڕزگارکەری کورد و کوردستان و ئەندامی بـەرەی نیشتمانی چەندی بڵێیت: پیرۆزو خۆشەویستە.
- بەمـاچ کردنـی بۆدییەکـە بـە سـۆزی تـەوازووەوە بیـری وایبۆچـوو تەنیـا:
- دیارە تێک چووە!.
پاشـدان قسـە زل زلەکانـی لێیهەڵوەشـاندەوە، زێتـر بەگڕبوونـەوە زەینـی بـۆ راگـرت.
ئەمیش لەسەر دەنگ بەرزیەکەی بەردەوام بووەوە و:
- لەسـەر هەمـوو کوردێکـی بـە شـەرەفی شـاری هەولێـر پێویسـتە

بەتفەڕکـی دابنێـن و بـۆ بەرەکـەت وهێنانـەدی مـرازان ڕۆژی چوارشـەممان زیارەتـی بکـەن و خۆیـان لـە دەوری بگێـڕن.
بەم وتەیە حسیا:«
- ئیللا بیللا شتێکی لەژێر سەردایە، بەڵام چییە نازاندرێت».
خۆ لـە دیـار ئەوعالەموللایـەی ملـی لێنانێت.ناچـار هەسـتی پێویسـتی حـەزی خـۆی لەسـەر دەقـی پێشـتر، لەگـەڵ دەم بەشـبوونەوەی حەپەسـاندا بەڕووانیـن ڕاگـرت.
خەڵکەکـەی ئەمبـەرو ئەوبـەری جادەکـە بـەواق وڕمانـەوە دیقەتیانـداو بـە بارێکـی لابەلایـان لەقەلەمـدا. کەچـی هـەر زوو نیـازی بۆیـان واژی بـووەوە هـەر کـە گوتـی:
- بەڵـێ ئەوەنـدە پیـرۆزو خۆشەویستە نزیکـەی حـەوت هەشـت هـەزار کـەس بوونـە قوربانـی و پەرژینـی دەربازبوونـی لەژێـر تـۆپ بارانـی شـاری هەولێـرەوە.
بە قاییم ترەوە گوتی:
- تۆ خوا لە ئەمە پیرۆزتر دەبێت.
هەرکـە زانـی «قاوەیـت»ەو دەداتـە بـەر تەوژمـی بـای هـۆڕەو گـوو بـە کڵاوی قسـەکانی ناپێورێـت. تەنیـا داتلەکانـی دەروونـی هەڵـۆ. نەبێت. ئەویش بەچ ناچێت. بگرە هێندێکیش هـەر ئەوەندەیـان دەزانـی قسـەیە و بەرگوێیـان دەکەوێـت و بـەس. تاکولـۆک نەبێـت. ئەمانیش پـێ هەڵنەچـوون هەتـا تەکانێکـی مرۆیانـەی بـۆ بـدەن و لەبـەردەم خائینـان زیـت ببنـەوەو بیاندەنـە بەرپارەسـوانی نەفرەتـەوە.
خەجالـەت دایگـرت و لەحەیفـان ئارەقـەی ڕەش و شـین لـە سـەرەتاپای لەشـیەوە زرچـەی بەسـتاو بـە چـاوی دەغەزاوییـەوە لەملاولـەولای ڕووانـی و هەتـا:«

- تفـ .. فـ» گرتی لێیانی کردو ئەوجا بەهەناسە ساردییەوە پێشی بەرداو ماڵ لەگەڵ لەتەشک دانا. بمنگێنێت:«
- دەگ دافەتێیت ژن لەگەڵ خۆت و عەقڵ قورەییتەوە!. پێم ناڵێیت: ئەو گووخورادنەت لەچی. بوو..ها؟. ئاخر خەڵکانێک سەگ و گورگ لە یەکتر هاوێر نەکەن و لەڕاست خائینی گەل و نیشتمان خۆیان گورگە هەڵنەخەن. بەڵکو چۆکی تەوازوویان لەبەردەمیان بنووشتێننەوە و بەسەرکردەی دڵسۆزو ڕابەری خۆیان دابنێن قسەو تاندان بەچ کەڵک دێن گەلحۆ!».
کە دیتی هەڵۆ. لەگەڵ گڕدانیدا بەڕوویکی مچومۆڕەوە تفێکی زارجوانەی لە زەوی ڕوو کرد، بیری پەشیمانی بەسەریدا زاڵ بوو:«
- ئەوە پێیدەگوترێت لەوچە لەوچ و زۆر وەڕی. ئـ هـ بەسە واز بێنە و هێشتا زۆر ماوە حەمەڕەحیم گوتەنی بگەینە ئەو ڕۆژە. ڕەش و سپی لە یەکتر جودا کەینەوە. ئـ هـ دوژمنی میللەت و بنەماڵەکەت ئاشکرایەو خۆت مەخەرە بەردەستیان و ملیان بۆ کەچ مەکە و ئەگەر بۆت هەڵکەوت تۆڵەی خۆتان بکەوە. ئەگەرنا داسەکنێ باڕۆژێک دانێیت داغمەدارەکان بە خوبزەیەک بۆ بەرژەوەندی پاشەڕۆژی خۆیان، بەناوی کوردایەتییەوە لە ناوەڕاستی بازاڕدا دەرپێت جیڕ بەجیڕ بکەن و وات بە فەیز ببەن بتکەنە «حاجی فاتمە»ئ ئاخر زەمان».
بەو قسەیەی خۆی سلەمییەوە و:
- ئەوانە والەبەرچاوانن سوخەتی مرۆڤایەتییان لەبەردا دڕاوە. لەکەسانێک کێوە هەتکی وڵاتی باوک و باپیرانی خۆیان بکەن. هەموو شتێکیان لە دەست دێت.

* * *

- کاربەدەستانی بەرە دەستە دەستەی نێوان ئاسمان و زەوی لەیەکتر جوایەز، نەخاسمە لەڕووی بیروبۆچوونی بەرژەوەندی خاک و میللەتەوە. ڕەش و سپی و ئاگر و پووش.
- هەر بابایە خۆی بەنێرەکەری سووری دەشتی هەولێر حسێب دەکات و بەرامبەرەکەی ماکەریش تەواو نییە. لەهەموو شتێک دانەڕێیەک لە یەکتر دوور. تەنیا لەڕووی ئابوورییەوە موویان بەمەعبێن وە ناچێت و کلک تێک پەڕی وا بەتەوریش نەپچڕێت و برای دایک و باوکی و دادپەروەرانە، هەرچییان لەرێگەی فڕان و دزی و تالان و گومرگ و قاچانەوە و ڕووخان و ڕمانی ساختمان و تێکدانی دیمەنی شار و، وایەری هێڵی سەرەکی کارەبای نێوان شارو گوندەکان دەسگیر دەبوو، بە گوێرەی سەر زلی و دەسەڵاتەوە، هەر یەکیان چەند شایەنی بووایە، دەبووە نسیبی.
لە «٣٥٪» بەرەو خوار».
- هەتا میللەت باوەڕیان پێ بکات و لە ژێردەریاندا خۆنەخورێنێت هەر لە هەوەل ڕۆژەوە یەکگرتنەکەیان ناونا:
- بەرەی نیشتمانی».
- ئـ..هـ هەموو شتێکیان لەنێوانیاندا سەربگرێت بەرەی ڕاستەقینە هەر ناو.
گورجی بە ئاشکرا، بێ پەردە و بە دەنگی بەرەزەوە دەیگوت:
- ئەوانە بەزێن و شێنیانەوە هەستی مرۆڤایەتیان بە ئاستەمیش لە دەروونیانەوە شک نابردرێت: کەچی لە ڕواڵەتدا خۆیان کردووەتە شێخی سەنعان و حەزیان هەردەم وا دەخوازێت خەڵکە نەدار و چەوساوەکە سەلاواتیان لەسەر لێ بدەن و بە بالای مەزنی و دادپەروەریان هەڵبڵێن و مەدح و سەنایان بکەنە ویردی سەرزاریانەوە.

بە بەرەواژییەوە تف و نەفرەت و گوڕ بەگۆڕچوونیان دەقەبەڵ بکەن.
نەختێک بە خورانی قژە دەژوون وشانە نەکراوەکەی لێیگرتەوە و:
- سەر زلەکان لێکرا لەجیاتی دەست بەسەری خەڵکە ڕاپەڕیو..و کۆڵنەدەرەکەیاندا بێنن، کەوا حەیامێکە لەژێر پۆستاڵی نەگریس و ستەمی بەعسی عەرەبەوە، لەگێژاوی کارەسات و هەتک و نەگبەتانیان دەگوزەراند، ڕێزیان لێنێن و دڵیان بدەنەوەو کوردستانیان ئاوەدان بکەنەوەو یەکێتی ڕێزەکانیان پتەو..و بەهێز بکەن و پەرە بەتەوعییەی نەتەوایەتی بدەن و خۆشەویستی و دڵسۆزی لەئاست گەل و خاک دووشاخ بکەنەوەو قاریش دەرحەق زۆردار و دوژمنان جۆشتر بدەن و چەندین خانوو..و ساختمانی موعەسکەر و ئەمن و ئەفسەر و ئەملاوئەولای حکومی دەست بەسەر دابگرن و ئەو خێزانانەی چەند ساڵ بوو لەپێناوی خەباتی کوردایەتی ئاوارەو پەراگەندە بووبوون و خاوەن شەهیدو ئەنفال پاداشت ئاسا لێیان نیشتەجێ بکەن.
لەگەڵ ئاخێکی درێژدادڕەوە باگۆیداوەو:
- کەچی بەداخەوە وەک چەند ساڵ ئاواتی تێکۆشانیان بێت هەرکە پێی نا موبارەکیان خستە سەرخاکی وڵاتەوە، بێ پەردەی شەرم و بەزەیی یانە بوو نە گورگی دەم بەخوێنی نەتەوەکەیان و کۆندەبۆی ئاوەدانی و مۆرانەی بیروباوەڕ..و ڕەوشتی پەسەندو هەموار.
- مەزەندەی کەسانی شاش و فیش و عەقڵ قوران وای بۆ دەچوو خەبات و تێکۆشانی نەتەوایەتی ئەو ڕێبازەیە کەوا کەسانی بەرە، لەدوای ڕاپەڕین ئاوقای بوونە.
- سەر زلەکانی بەرە خۆیان، بە مەراقەوە هاوێشتە ماڵی ئەو کەسانە، کە ساڵەهای ساڵە نغرۆی زەلکاوی خۆفرۆشی بووبوون و دەستیان هەتا بن پیلان لەهەناوی میللەت نابوو..وسەرە ڕمی

کوشتن و..وێران و کاول کردن بوون.
- عەزرەبات لەژێر بەرەی جم و جۆڵی سەرانی بەرەدا شک نابردرێت و هات و هاواری چیاو چۆڵ و هەڵەتانیان فش دەرچوو.
- پێشتر میللەت دووبەرە بوون:«
- دۆڕاو و هەڵوێستدار». ئەمانە ئەوانیان هەردەم بەگلاو و دەخەملاند و هەتا شەرمیان بەخۆ بوو سەر بەماڵیان دابگرن، کەچی سەر زلەکانی بەرە بۆ بکێش کردنی دڵیان بە موشتاقەوە بەرەو پیریانەوە چوون:
- بەم کارە دزێو..و قەڵپەیان لەدڵی ڕۆشنبیرو زەینداران چەسپاندرا، سەرانی بەرەی چەمەری خائینەکانیان لاگەلێک لەڕابردوو پاکەکان ئازیزو ڕێزدارترن.
- خەڵکە ڕاپەڕیو..و هەڵوێستدارەکان بەسەرخۆیاندا شکانەوەو بۆشییان بووە پیفۆکێکی سپیکراو:«
- سەرانی بەرە بەپێچەوانەی بیروبۆچوونی گشتی نەتەوەکەیان پێشتر کاکەو برالەیان لەگەڵ خائینەکان هەبووە. ئەگەر نا. لە ڕاستیاندا ئاوا ملکەچ و چاومۆن نەدەبوون».
- کەچی لەبەر دڕندایەتی دوژمن و لەلایەکی دیکەوە قەدرو ڕیزی گۆرینیان، میللەت لەوهەموو تاوان و هەلە زەقانەیان بوارد.
گورجی هەر جارێ دەیگوت:
- سەر زلەکانی بەرە، دوای ئازادکردنی بەشێکی زۆری کوردستان، بەهۆی ڕاپەڕینی میللەت و هێڵی «٣٦» سی و شەشەوە لە «جاش و موستەشار و ئامیر فەوج و ڕەفیق حزبی»یە خائینەکان دەترسان بۆیە ئەگەر داوای ئاوەڵکراسی ژنەکانیشیان بکەن بەڕوویان هەڵنازەقنەوە».

مەلا سمایل بۆ کات بەسەر بردن و بەهێزبوون و چڕی گفتوگۆیەکەیاندا زاری بەملایە وەچەرخاندەوە و گوتی:
- ئەو ساڵە جگە لەئەوەی ئاشبەتاڵی دووەم بوو کەچی لەڕاستیدا کورد.... و قڕان و کوردستان وێران بوو.
- زۆر.. ڕاستە.
- لەبەر ئەوە دەستی تاوانی خڕیان تێدابوو بۆیە چییان بەدوا هەڵنەبەستا.
بەزەردەخەنەیەکی تەڵخەوە گوتی:
- بووە ترێ خۆمان، سڕێ خۆمان.
- هەرچی تیشکی ئومێد بوو زەردایی لە قووڵایی دڵانەوە مابوو پەڕی.
- سەرانی بەرەی نیشتمانیش هەتا ئەو ساڵە هەستی نەتەوایەتیان شرار بوو.. بوو.. و لەسەر ترە ڕەگێک مابووەوە، ئەویش لەگەڵ گورگە لۆقەی بەزینەکەیاندا لە بن و بۆتکەوە پچڕاو ناخی هەر چوار سکۆڵەکانی دڵیان بە زەڕەبینیش بگەڕێیت عەشتەبای لەم ڕووەوە تێدا بەدی ناکرێت.
- لەو کاتەوە بەخوایشتی حەزیان نەک پشتی یەکجارەکیان لەکوردایەتی و پێشمەرگایەتی و هەستی جم و جۆڵی سیاسی و خەبات کرد، بگرە دەهۆڵ دڕانیان لەخۆشەویستی دەشت و دۆڵ و چیاو و کێوە سەرکەشەکانی کوردستانیش هەر هیچ.
- تەنیا خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەی نێو شارو کۆمەڵگاکان پێی هەڵوێستیان چەقاندو ملیان بۆ هاونیرێتی ئەوانیان لار نەکردەوەو بەوپەڕی جورئەتەوە چەوسانەوەو بەندیخانەو ڕاونان و نانبڕان و کونەفیرارو ئەها. عەرەب هاتن و «ولک جبان» و «غێر کردی جئت

من الجبال» یان لە پێناو مانەوەیان لەسەر خاکی پیرۆزی خۆیان و نەک پەراگەندەی هەندەران قەبول کرد و مۆری جاشاتی ئەو دیویان تووڕدا.
- دوژمنی داگیرکەر ماوەی بیست ساڵ زیاتر بەهەموو هێز و دەسەلاتییەوە تەقەلایدا کەم و زۆر نەیتوانی بەسەر هەڵوێستیاندا زاڵ بێت و شەقی بکات، یان کزو لاوازی وا زوو بۆ خواستی دابێتەوە. کەچی بەرەی تایەن بە نزیکەی ساڵێک بەناوی ڕەنگی جیاجیای جاشاتی تیتاڵ بەتیتاڵی کردو ئاتاری لەسەر پاتاری نەهێشت و ئەنجامی خەبات و تێکۆشانی ساڵەهای ساڵ و هەڵوێستە چەسپیو و خۆڕاگرەکەی ناو. وەیشوومەی ئەنفال و کیمیا و زندە بە چاڵ و کاولکاری و پەتی قەنارەو ڕاونان و چەمە سەرانێ بووە تۆزی قۆندەرەو سێبەری خۆشی و سانەوەی جاشە سادە و داغمەدارەکانەوە.
- هەرچی سوخەتی قەڵپ و مزیڕ بوو فێری خەڵکەکەیان کرد.
- ڕاست دەفەرموویت، ئەگەر نا کێ بیری بۆ ئەوە دەچوو زەوی بۆ بۆڕی و ئاو..و وایەری تەلەفۆنات هەڵدڕێت، یاخۆ کۆنە فافۆن خڕکاتەوەو لە مەعمەلی تایبەت بیتاوێنێتەوە.
- ئەدی ئاسنی کەچەو پەچەی سەر گوفەک و زبڵدان و دەوروپشتی سناعە و ناو فیتەران.
- بەزم لەوە دایە چەند لۆرییەک چەکی هەمە چەشنیان پاداشت بۆ ئاخوندە کورد کوژەکان ناردن بۆ ئەوەی تێ بچۆلێت و خەڵک پێ نەحسێین سەرەوەی چەکەکانیان، بەپارە شووشەو تەتوکە داپۆشت و بڵاویشیان کردەوە:
- تەتۆکە لەو دیو، وەک ئاسن و فافۆن قیمەت باش دەکات.

- ئیدی خەڵک چاو ئێشە ئاسا کەوتنە پەلەقاژەی بەدوا گەڕان، تا وای لێهات جامی پەنجەرەی بیناکانی حکومی نەما، نەخاسمە جامی قوتابخانەکان.
- پاشدان شووشە کۆکراوەکان بوونە لەکەیەکی ڕەش و دمۆری نێچەوانیان و هەتا دنیا دنیایە نەسڕێتەوە.
دوای گفتوگۆکەی مەلاسمایل و خەلیلی برازای لەگەڵ گورجیدا خواحافیزیان لێکرد. بە بۆنەی دیدەنی و وەفادارییەوە سەردانیان کردبوو.

* * *

- باری ناخۆشی و شپرزەیی و نائارامی و ترس و تالان و..فڕان و بەسەر دادان، لەسێبەری بەرەی نیشتمانیدا ڕۆژ بەڕۆژ لەپەرەسەندن دابوون و ژیان ملی بەرەو ئاژاوەو دوو بەرەکی و نامۆیی وانا هیچ کەس لەماڵی خۆی ئەمین نەبێت. تایبەت ئەو کەسانەی دووسێ هەزار دیناری پێ شک دەبردرا، یاخۆ خاوەن ئۆتۆمبێلێکی کەمێک خاوێن شەو تا شەبەقی بەیان دەبووایە خەو لەچاوی خۆی حەرام بکات و بەچەکەوە هەڵتوتکێت.
تا وای لێهات بە نوێژی نیوەڕۆ، لەسەر جادەی سەرەکییەکانی شاردا، بە زەبری چەک چەند دینارێک سەیارەیەک دەستێندرا. خاوەنەکەی حەدی شەکوا کردنیشی نەبوو، با دزەکەش زەقەزەقی چاوانی بووایە.
- پێم ناڵێیت: کوو. بوو!؟.
گورجی بە فڕاندنی پیکاب تویتەی خدرەلار زۆر پەست بوو..و بە ئاخێکی کەسەراوییەوە گوتی:
- تازە ڕۆژوبان کەوتبوو..و بۆ گومرگ دەچووم. لەفولکەی «زەعیم»

سێ چەكدارم لێڕاست هاتن و لوولەی چەكیان ئاراستەی نێوچەوانم كردو گوتیان:
- یاللا وەرە خوارێ دەنا دەتكوژین.
قار، لەناخەوە گینگڵەی پێداو بە دەغەزەوە گوتی:
- نەتناسین!؟.
- دەمامك دراو بوون.
لەدڵەوە بەهەڵچوونەوە منگاندی و:«
- لە سایەی بەرەی نیشتمان پەروەری كوردایەتیدا ئیجازەی ڕەسمی دراوەتە دز و جەردەو ڕێگران. خەڵك و شار بەنوێژی نیوەڕۆ بڕووتێننەوە».
بەدەنگی بەرزی غەزەبەوە گوتی:
- مسۆگەرە كەرخی جاشە داغمەدارەكانە. جاشە سادەكان هێشتا لە قوونی خۆیان تەواو ئەمین نینە هەتا كاری ئاوا ئەنجام بدەن.
- ئەوە گوتنی ناوێت.
دەیزانی بژێوی خۆی و منداڵێتی تەرزی ئامۆژگاری كردن گوتی:
- كاكە هەتا زووەو نەكراوەتە دۆلارو بۆ ((........، ........)) هەندەرانیان نەناردووە ڕێگایەك ببینەوە.
بەسەربادانی بێدەسەڵاتییەوە گوتی:
- ڕێگەی چ ببینمەوە، تەنیا بەرەم تێگەیاندووەو خەبەری سەیتەرەكانیان داوە.
زەردەخەنەیەكی دەغەزاوی ڕوویدا گیركرد و گوتی:
- كاكی برا ئەگەر بەتەمای بەرەو سەیتەرەكان بێت كەشكت لێدەبێتەوە فەریك.
- لەجەنابت چاكتر دەزانم سەیتەرەكان لێرە..ڕا هەتا ئەو دیو

شارۆچکەی «پێنجوێن» ەوە لەڕووتانەوەی کوردستان و ئێمە مانانی هەژار و بێچەک هاوبەشن، بەڵان چارە؟.
دوای دامان و بیرکردنەوەی چەند سانییەک ئەمەی بۆ هات و بە بافرەیەکەوە گوتی:
- هێزە بە گوێی خوشکی خۆت بکە هەر هەنووکە، بێ دواکەوتن بڕۆ سەربە حەوشەی بارەگای ((٢)) دوودا بگرە، ئەگەر لەوێ نەبوو مسۆگەرە لە حەوشەی بارەگای «٣»یە.
ئەمەی عەقڵ گرت و تا ئەو ساتە بەخەیاڵیدا نەهاتبوو. لەحەوشەی بارەگای ((........)) دۆزییەوە. هەتا واسیتەیەکی گەورەی پەیدا نەکرد نەیوێرا تخوونیشی بکەوێت.
بە ((٢))هەزار دیناری ڕەبەق تا دزە ئەزموونداره کوردپەروەرەکانی ڕازی کردن.
رادیۆو تەسجیل و تایەی سپێر قوتدرابوون و دوو تایەشی بەتایەی کۆن ساقی و باقی پێکرابوون.
گورجی پێ شێت و هار بوو..وله دڵەوە پرتاندی و:
- ئا. ئەوەیە بەرهەمی تێکۆشانی نیشتمانی!.
- ئا ئەوەیە خەباتی هێزی پێشمەرگایەتی!.
بە دەنگی زۆر بەرزەوە گوتی:
- ئەوجا وەرە ئیمانت بە گەورەو گچەکەیان بمێنێت و وەک سەرکردەیەک سەریان بۆ دابنوێنێت. خوا عالیمەو لەبەرچاوانیشە ئەگەر هەر بەو پێ و دانکەیە لێ بکەن میللەت موحەقەق بەرەو هەڵدێرێکی کاکی بەکاکییەکی وا دەبەن هەتا ئەوان نان دوولەت بکەن هەردەم تامەزرۆی تامی هێمنی و خۆشی و سەرفرازی دەبن.
گورجی هەر ئەو ڕۆژە بەر گوێی کەوت:

- حاجی فەتاح بەراز لەترسی دزی بەرەی نیشتمانیدا قەمەرە سۆپەرەکەیان بە سرینگ بردووەتە سەربان.
- بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە:
- هیچ ناحەق نییە. دزانی حکومەتی بەرە ئەوەندە مەعلان و چاپووکن بە نوێژی نیوەڕۆ کل لەچاوان دەدزن. ڕۆژێک چ لەماڵ بووایە، چ لەبەر دووکان و ناو بازاڕدا هەر لێیاندەستاند.
خدرە لار گوتی:
- خۆزیا منیش وام بکردبووایەو ئەو چەند هەزار دینارەم بەلاش نەدەدۆڕاند بووایە.

* * *

حموودی کەونە «سروود» بەرگوێی کەوت دوو کورد، دوو هەفتە لەسەر یەک بۆ کڕینی شۆفەرەکەی «کازم» چوونەتە ماڵی خەلەف.
- ئێ بەڵکی بیانناسێت چووە ماڵی خەلەف. لەهەفتە سێیەمدا بە سۆپەرێکی سوورهاتنەوە. یەکێکیان لەو دەرگایەی تیلمە پەڕۆیە ڕەنگداری تێیەخرا بوو دابەزی، ئەویتر لەدەرگای دووەم پەڕۆی ڕەنگێکی تری پێوە کرابوو.
بە زەردەخەنەو کەیفسازییەوە بەپیریانەوە چوو..و پێش ئەوەی بچنە حەوشەی خەلەفەوە گوتی:
- ماندوو نەبن.
بە زەردەخەنەی حەیرمانەوە گوتیان:
- عەمر درێژ بیت تۆ کوردیت!؟.
- بەڵێ.
- نەیناسین «ئازاد» و «سامان»ی پیاوی شوان بوون و درووشمی حیزبەکانیان بەرز کردبووەوە.

بێ سێ و دوو لێکردن بە ڕوویێکی بافرەدارەوە گوتی:
- بۆ شۆفەرەکەی مام خەلەف هاتوون؟.
- بەڵێ.
بەشێوەیەکی ئاسایی یەوە گوتی:
- دەزانن جگە لە نرخی خۆی کوڕێکی لەسەر داندراوە؟.
- دەزانین ئێمە ئامادەین نرخەکەی تەواو بدەین.
- بە مەیلەو بزەیەکەوە:
- مام خەلەف پارەی ناوێت.
پێشتر لەگەڵی لەم ڕووەوە ڕێککەوتبوو.
بەسەرسامییەوە:
- ئەدی!؟.
لەزگ بوو لە حریتە بدات، پاشدان بە سەری خۆیدا زاڵ بوو. گوتی:
- لە جیاتی ژنی دەوێت، تاکو دواڕۆژ تەرحی شۆفەرەکە لەبەرچاوی بێت و تۆزێک گڕی دەروونی دامرکێنێتەوە.
بە پێکەنینێکی گاڵتەجاڕییەوە گوتیان:
- بڵێ نایفرۆشێت، ئەگەرنا ئەمە داوا نییە.
خۆی کەم و زۆر لەگوورە نەبرد و گوتی:
- بۆ..لەبەرچی!؟.
بە زەردەخەنەیەکی تەڵخەوە:
- ئەی ژن بە ئێمە لێرە چۆن پەیدا دەبێت.
بێ ئەوەی ڕوخساری بگۆڕدرێت گوتی:
- ئەگەر مەیلتان لەسەر بێت زۆر ئاسانە.
بە حەیرمانەوە:

- چۆن!؟.
هەتا ئەو ساتەش شەش حەوت منداڵ بە فیتی حموودەوە سەرە دیقانەیان لەملاو لەولا دەرکرد.
لە وەڵامی چۆنی ئازادا گوتی:
- دەتوانن بچنەوە ژنی خۆت یان ژنی هاورێکەت بهێنن.
شێت و هار بوون و چاوی غەزەبیان چووە پشتەسەریان و سامان بە هەڵچوونەوە گوتی:
- ئەو گوو خواردنەت لەسەری خۆت و ئەژدادیشت زێدەیە.
- دیارە فێرکراوین ئەگەرنا منداڵێکی بیژیی وەک تۆ ئەو گوو خواردنەت بە خەیاڵیشتدا گوزەری نەدەکرد.
حەموود زانی کار لەکار ترازاوەو کەڵکی قسانی کەم و زۆر نەما، فیتەیەکی حیلی لێداو منداڵەکان لێکڕا بە چەپڵەڕێزانەوە دەورەیاندان و گوتیان:
وشەی «بمرێ» یش حەموود پێشتر فێری کردبوون:
- بمرێ خرقه الشمال.
- بمرێ لص الشمال.
- بمرێ بائع الشمال.
- بمرێ عميل المحتلين.
- بمرێ جحوش الخونه.
- بمرێ عدو الشعب والوطن.
هەر هێندەیان لەتوانادا ما خۆیان بەپرە پرکوتاوە نێو ئۆتۆمبێلەکەو هەتا دەرباز بوون بە دە دوازدە پلووکە بەردان زەرەرێکی زۆریان بە هەڵۆ گەیاند.
خەلەف زۆر پێ سەرسام بوو..و ئەملاو ئەولای حەموودی زۆر

بەگوڕەوە ماچ کرد و بەڕووی هەڵشاخا و گوتی:
- ئافەرین ڕۆڵە ئافەرین بەڕاستی پاداشتی باشت دانەوە. دەرکەوت ئەوانە بنیادەم نینە دڕندەی میللەتی خۆیانن. بەدەستی ئەنقەست بەئەنفال و زندە بەچاڵ و ماڵوێرانی ئێوەیان بەفەتارەتدان کەچی خۆیان و منداڵیشیان لەسەر کۆشی داگیرکەری ئەو دیو بیست و چوارسەعات «عەتابە»ی خۆشی دەچڕن.
:- میللەتە چەوساوەکەیان بەهۆی ڕاپەڕینەوە ئەوانی هێناوە سەر خوانێکی حازری و لەجیاتی پاداشت دانەوەیان دار و بەردی وڵاتی خۆیان بۆ داگیرکەری ئەو دیو بێ پەردەی شەرمەوە ئاودیوکرد. ئەوەش هەرگیز خەسڵەتی بنیادەمان نییە. ئەوجا بۆ ئافەرینێکی ئاغاکانیان نزیکەی «٦٠٠» شەش سەت کیلۆمەتریان بڕیوە تاکو شۆفەری ڕەحمەتی بە هەدیەیان بۆ ببەن.
- دووجار هاتنەماڵم و هەر ئەوەتە دەست و پێمیان ماچ نەدەکرد دەجارم پێگوتن:
- بابە من دڵم بەروەست نادات لەبەر خاتری گیانی ڕەحمەتی بیفرۆشم و ڕۆژانە هەرکە دەیبینم سیبوریم پێدێت. ئەوجا هەر بەرۆکیان بەرنەدام.
بە غەزەبەوە گوتی:
- تف لەو تەرزە بنیادەمە خۆخۆر و بێهەڵوێستانە.
- هەزار نەفرەتی خواو پێغەمبەریان لێبێت.

* * *

پەردەی شرەکە دوای ماڵئاوایی زەردەپەڕی خۆرو کپبوونەوەی دەنگ و سەدای منارە بەرز..و زۆرەکانی شار لەمێژ نەبوو دەستی بەسەرجیهاندا گرتبوو، دارەبەرزەکانی «محەتە» ئەوانەی هێشتا

دەستی کەسانی نەبووەو سەرما بردووەکانی نەگەیشتبووێ، بەکزە بای شەماڵ لەنجەیان دەکردو ساردییەکی شێداریان بە دەوروبەری حەوشەی گرتووخانەکەی پەخش دەکرد.
موفەوەز سەلیم، باریکەلەی ڕەنگ سپی و سوورو چاوگەش دەرگای یەک لە ژوورەکانی کردەوە، کە تایبەت بە دوو چەشنە تاوانبار بوو.
- ئەوا میوانێکی تەمەن گچکەتان بۆ هات.
لە سێ چوارلاوە:
- بەخێر بێیت»ی بەرگوێ کەوت.
چووە تەک ئەو کەسەی لەبەری قیت بووەو بەگەرم و گوڕەوە بەپیریەوە هات، وەستا.
- فەرموو دانیشە.
واقی وڕماو بەچاوی خۆی باوەڕ نەکرد. پاش هەڵپشاوتنی دووبارە دیقەتیداوە سەرو سەکوتی خانەخوێیەکان. لەمێرد منداڵەوە تاکو هەرزەکاری زیاتری بەدی نەدەکرد.
بێ ئاگا لە مام شەهابی دنیای ژوورەکان. زۆر بەر فرەوان و سیاحی بوون.
کاتی خۆی بۆ موحەتەی شەمەندەفەر دروست کرا بوون.
بەندیخانەکەی پێشتر، لەبەر زۆر کۆنی و ڕووە و کوێستان و هۆدەشی کەم حەپسەکانی دەقژقژانە پاڵ یەکتر و بووبووە مۆڵگای چەند نەخۆشییەکی ترسێنەر، ڕوو لێرەکراو..ڕەخساوە بەیەکەوە نەبن و بەگوێرەی تاوان دابەش بکرێن. ئەمەیان بۆ مێرد منداڵ و دز و ڕەوشت ناهەمواران.
هەرچەند بیری دەکردەوە سەری لێدەرنەدەچوو لەدڵەوە منگاندی:

- دیارە تاوانبار لە شارەکەماندا هەر ئەو نەوعە کەسانەن!.
لوقمـان لای دەسـتە ڕاسـتی بـوو بارتەقـای «١٧» سـاڵی کردبـوو..و باڵابـەرزو نەختێک ئێسـک پتـەو و چوارشـانە بـە:
- فەرموو: ڕایچڵەکاند و گوتنی:
- سوپاس جگەرە ناکێشم.
پـاش ئـەوەی لـەو ترسـە سـامناکەی کەبـەری پێنانـی بـۆ ژوورەکـە، بەسەریدا زاڵ بوو بوو، تۆزێک هێور بووەوەو هەتا ڕادەیەک لەگیانی خـۆی دڵنیابـوو کەوتـە جیهانـی دامانـەوەو مـا بداتـە بـەر نەزیرۆکانـی دەروونـەوە:
- پێشـتر ئەگەر زەبرێکت لەناحـەزان بدابووایـە جێگـەی خۆ حەشـاردان دیـار بـوو. کەچـی ئەمـڕۆ لەبـەر دڕنـدەو گورگـی بەنـدەن و هەڵـەت و شـاری لێرە بترازێت جێگـەی تـر شـک نابردرێت.
- کاکە بێ قەیدی نەبێت ناوت چییە؟.
لـە ترسـانا دوو دڵ بـوو، کەچـی یەکێکیـان هـەرزوو دەسـت پێشـخەری کـردو گوتـی:
- من دەیناسم.
ئەمەی گوت و ڕووی زاری بەلایدا سووڕاندەوەو:
- تۆ نەبوویت سەرەدەمایەک پاکەت و لیفکەت لە بازاڕ دەفرۆشت؟.
- بەڵێ من بووم.
ئەوجا ڕووی بەلای لوقمانەوە سوڕاندەوەو گوتی:
- ناوم نەبەزە.
یەکێکیان لەناوەڕاستا بە بزەیەکەوە زاری هەڵێناو:
- ئەدی لەسەرچی گیرایت؟.
نەیدەویسـت هەتـا لایـەک بـە لایـەک دەبێـت هەمـوو شـتێک بەگـۆڕێ

وەربکات، بیریشی وایدەخەملاند: غەنیمەکەی دەستی بەسەر هەموو کون و کەلەبەرێکدا دەشکێت:
- پێشتر موستەشاری بەعسی داگیرکەربوو..وئەمڕۆش وا:« ئامیر فەوج»ی یەک لەسەر زلەکانی بەرەیە، بۆیە نەیوێرا دەم و دەست لەدیاریانەوە ڕاستییەکە بدرکێنێت. تەنیا بەنەرمییەوە هەر ئەوەتە تێگەیشتن:
- چووزانم.
بزە بە وەڵامەکە زۆربەیانی داگرتن و لەدڵیان زاخاو درا چەشنی هێندێکیان لەسەر بەدڕەوشتییە.
یەکێکی تر لە بنەبانێڕا، ئابڕوو..و شورەیی لەناخی دەروونییەوە تووڕ درابوون و نەیدەزانی عەیبە چییەو پاڵیدابووەوەو لەگەڵ قیت بوونەوەدا، بە پێکەنین و دەنگی بەرزەوە گوتی:
- وا دیارە ئەمەش لەخۆمانە.
هێندێکیان شەرم پەڕییە ڕوویان و سەری خەجالەتیان ژ بەر خۆناو چەندیشیان بافرەزایە لێوان و گوتیان:
- گوتنی ناوێت ئەگەر نا، نەیاندەهێنا ئێرە.
لوقمان جوانی و لووسکەیی پەلکێشیان بۆ ژوورەکە کردبوو. بەجەسارەت و غیرەت و لێهاتوویی خۆیەوە سەیتەرەی لەسەر هەمووان کردبوو..و بەرپەرچیدانەوەی بەتوندی ئەو نەبووایە زۆر کاری قۆرو ناشیرین، لە ژوورەکەیان بە ئاشکرا ڕووی دەدا.
هەرکە چاوی بەدیمەنی کەوت تەرحی پسپۆڕ یەکسەر لەهەڵس وکەوتی هێمنییەوە، لە ناخەوەی سەقادرا لەو جۆرەکەسانە نییەو بەپێچەوانەی مەزەندەی هاوڕێکانی هەر زوو لەبەردەمیان زیت بووەوەو گوتی:

- مەرج نییە ئەوەی سمێڵی سوور بێت هەمزاغا بێت.
تاسایان نەکرد چیتر لەم بارەیەوە شەکرێک بشکێنن .
نەبەز ویستی لەژێر زمانی بکات، کەچی ئەم بەدیتنی یەکەمجار ئەڤینی پەڕییە سەر. نەخاسمە هەرکە واریقاتی گیرانەکەی بەنهێنی بۆ هەڵرشت. زۆری کەیف پێهات. بەم تەمەنە مێرد منداڵییەوە ئاوا بەجەرگ و جەسوورە، هەتا وەڵامیان نەداتەوە، وەبەر گوێی پسکاند و:«
- ئەوانە هی ئەوە نینە گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێت».
لەبێ خەبەریان سەری سوڕما، کەچی لە شرووی دەردی خۆیەوە بەبای هەڵدا.
هیچ پەنایەکی شک نەدەبرد هانای بۆ بەرێت. لەهەوەڵەوە مەرامی وابوو هاوار بۆ ئەو دەستە چەکدارانە ببات کە ئەمڕۆ باویانەو غەنیمەکەشی میر پەنجۆی دەستەکەی ترە. کەچی وایدابەرێ:
- حەوانەوە لە ژێرباڵی زۆردارو خائینان هەر زۆرداری و خیانەتییە. چ حەسەن کەچەڵ و چ کەچەڵ حەسەن هەریەکە.
ئەمەش باپیری لەدڵی رووانبوو.
لوقمان سۆزی ئەو بیروباوەڕەی کە لەبنەماڵەکەی و دەوروبەری بۆ مابووەوە، لەنێو ماسولکەکانیدا نەدەپەڕی و بەو بابەیەش دەژیا، کە بە گوێرەی ویستی کەشتییەکەی شێخ سەدرەو سەفین و شوان هەڵیدەکرد.
بەگفتوگۆیەکی کەم، لەگەڵ نەبەزدا بۆ یەکەمجار لەژیانیدا لەڕێسەوە شلەقاو کەوتە نێو دەریای دوو دڵییەوەو ئۆقرەی لێهەڵگیراو ما لەنێوان چالآن و مالآنی:«
- وایەو وانییە» دا باسکە مەلەی بکات. شەو لەسەر پێخەف هەر

كه‌له‌كـه‌ی لـه‌م ڕووه‌وه‌ هه‌ڵگێـڕو وه‌رگێـڕ ده‌كـرد.
نه‌ختێک وه‌نه‌وزیدا و له‌نكاو له‌پرخـه‌ی خـه‌ودا قاقـای پێشتری نه‌بـه‌زی لێزیـت بـووه‌وه‌و ڕایجفرانـدو گه‌ڕاندوویـه‌وه‌ سـه‌ر گفتوگـۆی كاتـی ڕاكشـانیاندا.
- له‌سه‌رچی گیرایت؟.
- له‌ پێشمه‌رگه‌یه‌كی هه‌ڵۆمدا.
- له‌به‌رچی؟.
به‌ ده‌نگی غه‌زه‌به‌وه‌:
- بێناموسه‌ی له‌پێشه‌ من جوێنی به‌شێخ سه‌دره‌ و جه‌ماعه‌ته‌كه‌یدا.
باوه‌ڕی نه‌هات و بۆ دڵنیایی یه‌وه‌:
- جوێنی به‌شێخ سه‌دره‌یدا!؟.
- به‌ڵێ
عه‌نتیكه‌ی پێهات و. به‌ واق وڕمانه‌وه‌ گوتی:
- ئه‌وجا چ بوو!؟.
ئه‌مـه‌ی لـه‌ ناخـه‌وه‌ی ڕا لێنه‌بوو..وسـۆزه‌كه‌ی ده‌لحـاز وای لێكـرد دڵـی لێی سـارد ببێت، كه‌چـی حـه‌زی وایده‌خواست ده‌م و ده‌سـت تـا نه‌گاتـه‌ سـاخه‌ به‌چڕوچـاوی دڕدۆنگییـه‌وه‌ ده‌ری نه‌بڕێـت و بـه‌ ئاسـایی یـه‌وه‌ گوتـی:
- دیاره‌ جه‌نابت له‌پله‌و پایه‌ی ئه‌و پیاوه‌ تێكۆشـه‌ره‌ مه‌زنـه‌ له‌نێو دڵـی خه‌ڵكـی ناوچه‌كـه‌دا، بـێ خه‌به‌ریـت. ئه‌گـه‌ر نـا قـه‌ت دڵـت به‌رده‌سـتی نه‌ده‌دایـت ئـه‌م وه‌ڵامـه‌م بده‌یتـه‌وه‌!.
كه‌بـه‌م تـه‌رزه‌ی لێوێكـه‌وت برای «ئاسـۆ» ی قاسیده‌و له‌بریتی پاداشتی هیلاكـی ڕێـگاو هاوارهێنانـی له‌سـایه‌ی شـێخی خۆشه‌ویسـته‌كه‌یه‌وه‌ خرایـه‌ گه‌ڕۆمـه‌ی ئاشـی ئه‌نفالـه‌وه‌. كه‌وتـه‌ كێژه‌نـی كێشمه‌كێشـی

کوو بکوژی برای خۆی بەم ڕادەیە خۆشدەویت و بەرگریشی بەموشتاقەوە لێدەکات:«
- وا پێدەچێت کەم و زۆر لێیوەی ئاگا نەبێت».
دوای ئەوە لێی بیست، باپیر و دایک و خوشک و پلکی بەر ئەنفال کەوتوونە . بۆ وەدەست کەوتنی سەرە پەتێک ڕووی زاری بەهەشتاوییەوە تێکردو گوتی:
- منیش برایەکم بەدەم هاوارەوە چووە ناو خزم و خاڵوانمانەوە لەناوچەی «ت» لەو ساکەوە بێ سەرو شوێنە.
یەکسەر زانی و هەر زوو تەرحی هەنار بۆ نەخۆش ببات و گوتی:
- ئاسۆی خوارزای مام وسو نەڵێیت!؟
لەخۆشی بیستنی ناوەکە هەناوی قەپا. باریەک و بلەزو ڕووگەشییەوە گوتی:
- بەرێ وەللا!. ئەوە چۆنی دەناسیت!؟.
هەتا لە بنەڕەتی هەستی دەروونی بگات خۆی بە پرسیارەکە لەگووره نەبردو بە ئاسایی یەوە پەڕەکەی وەرگێڕاو گوتی:
- شێخی سەرکردەت زۆر خۆشدەوێت؟.
ئەمە لێیکردە دەغەزو بەهەڵچوونەوە گوتی:
- تۆ جارێ سۆراخی ئاسۆی برام پێ بڵێ. چەند. وەختە بۆ دەنگ و باسێکی لەسەر ئاوو ئاگرین و باوکی رەحمەتیشم لە سوێی ئەو بەسگیدا.
بەمە قەبزی دایگرت، کەچی بۆ یەکلاکردنەوەی ڕاستی خواستەکەی. لەسەر ڕاکەی خۆی دانەبەزی و گوتی:
- شەرت بێت هەتا پرسیارەکەم تەواو وەڵام نەدەیتەوە لەفزت لەمن گوێ لێنەبێت.

خۆشی و ترشی بە ملیدا هات مەراقی سۆراخەکەی بخاتە لاوەو بە هەناسە هەڵکێشانێکی خەماوییەوە برێک هێور بووەوەو بە هێدییەوە گوتی:

- کاری زۆر خۆشویستنە!. لە یەکێک لە سەرکردە هەرە مەزنەکانی شۆڕشی میللەتەکەم کێوە!.

لەقاقایەکی حێلی وایدا زۆربەی خەوتووەکان لەکانگەی خەودا ڕاپەڕاندو سەرنجیانیشی بکێش کرد. هەتا ئەو ساتە لەسەر ڕایەخێک بەیەکەوە پاڵیاندا بووەوەو گفتوگۆکەیان لەپسکە پسک بەدەر نەبوو. پێش ئەوەی لە هۆی پێکەنینەکەی وێکەوێت، کەپی حەپەساو.. وچاشمیش بوو بوو گوتی:

- لەبێخەبەران کەشکەک سەلاوات!. ئێمە مانانی کرمانج هەر ئاوا لەکارەساتی ورگ دڕین و خوێن ڕشتنی گەلەکەمان بەدەست گورگ و ستەمکارانی خانەزایی و غەوارانەوە جگە لەئەوەی بێ ئاگاین و هەردەم لەئاستیاندا خۆمان خەشیم هەڵدێخین، بۆیە حاڵمان ئەو حاڵەیە و ناشبین بەهیچ.

بەمەراقی گڕدارەوە گوتی:

- تۆ لەلایەک شتێک لەبارەی ئاسۆی برامەوە ئەزانیت و لەلایەکی ترەوە لە پێکەنین و ئەو قسە زل زلانەت وێئەچێت گۆبەندێکی گەورەت لەژێر سەردابێت!.

هەرکە ڕووداوەکەی لەسیری هەتا پیازی لەچنگ نا. لە سوان یەکسەر وەک «تا»یەکی حوجەت دایگرێت ڕووی سوور سوور هەڵگەڕاو بەخۆی نەوەستا و گورج قیت بووەوەو سەر چنچکان و هەتا دەنگی لەبەردا بوو. گوتی:

- وەڵڵا. وا نییە، بیلا درۆیە. تەڵڵا بوختانە!. ئاخر بە چ دەلیل و

بەڵگەیەکــەوە عەقــڵ دەســەلمێنێت کەســێک چەنــد ســاڵ ســەرکردەو پێشــمەرگەیەکی دڵسۆزی کــوردو کوردســتان بێت میللەتــی خــۆی بــۆ زینــدە بــە چــاڵ کردنــی خــۆڕا تەســلیمی دوژمنــان دەکات!. ئــەوە هــەر لەئیجــادەوە ڕاســت نییــەو هەڵبەســتراوە.

قەبرغــەی پێگرت، کەچی خۆی گورگە هەڵنەخست و زۆر بە هێدییەوە گوتی:

- ئەگــەر بەمنیــش بــڕوا ناکەیــت دەتوانیــت لەداپیــرم و مامــم زانــاو گۆرانــی مــام ڕەمەزانــە خێــل، کەخزمــی مــام وســووە بپرســیت.

لەسەر باری گورین ما بووەوەو بەلەزەوە گوتی:

- ئەزانم، ئەزانم خزمێتی.

تا دڵیا بێت گوتی:

- بــە چــاوی خۆیــان بینیویانــە: شــوانەی دڵســۆزت و پیــاوی شــێخی ســەرکردە ئازیزەکــەت، بەهــۆی هێنانی هاوارەکــەوە ســێ چــوار زڵلــەی کۆیی یانــەی لــە بناگوێی ئاسۆی سرواند و. ویستی حەپسیشــی بکات کەچــی مــام وســووی خاڵــت وای بــەڕەوا زانــی:«

- بابــەر ئەنفال بکەوێت ســەت قــات باشــترە نــەک ئەوانــەی بەتۆمەتــی جاسووســی و خیانەتــەوە گوللــە بــاران بکــەن».

- بووە کەفیلی لە ئاوایی دەرنەچوونی.

بێگرێیــی و بەســەروبەری گێڕانەوەکــە کــزەی لــە پەڕەکــەی دڵییــەوە هەســتاند.

- ئەوجــا لەگــەڵ منداڵەکانــی خــۆی لــەو زیلــە عەســکەریە ســوار بــوون کەماڵــی ئێمــەو گۆرانــی تێدابــوون.

دەنگێک لەحەپسەکانەوە:

- ئێمــەش بیســتوومانە پێشــمەرگە خەڵکی ناوچــەی «ت»یان بەدەســت

هێزی ئەنفال داوە.
- بەڵێ لەدەیان کەسی دەربازبووی ناوچەکەمان بیستووە.

* * *

گورجی ئێوارە، نەگەڕانەوەی نەبەزی لێبووە مەراق و کەسەرو دڵی داخورپا، کە شەو بەرەو نوێژی خەوتنان ڕاکشا. هەستاوەو بەڕابیتە کردن و ڕووانین بۆ دەرەوەی حەوشەو ناو لەپ بەیەکدا دان و پەکووو پەکووی:«
- چ بوو ئەو سەر بە هەشە نەهاتەوە: شتێکی بەسەر نەهاتبێت؟».
لەحەیفان ئاگای لەسۆزان نەبوو جار لەجار بزە پتر دایدەگرت.
زانا زوو هەستی پێکرد سەرە داوێکی لایەو گوتی:
- سۆزان دەڵێیت بە شتێکت شک دێت؟.
بە زەردەخەنەوە گوتی:
- بەڵێ داردوولقی دەستدایەو بەدزییەوە پێیگوتم:
- ئەگەر شەو نەهاتمەوە بزانە تۆڵەی چاوی داپیرم کردووەتەوەو لە بەندیخانەی مەحەتەمە.
هەردووکیان حەپەسان و بەچاوی مولەقەوە ماوەیەک لەیەکتریان ڕووانی.
زانا بێ ئاگا لەسەمعە سۆت و گورجیش حسیا واریقات چییەو هەتا چەپەلۆک گرتی لەسەرو پۆتەلاکی خۆیداو گوتی:
- ئۆ..ی. خوایە تووشت بە تووشی چ بنەچەیەکی بەژاروگیرەپیسانت کردوومە!.
لەگەڵ شەپی قار خواردن لەبەری ڕانیدا و گوتی:
- هەی سەروبابانت لەقورەشین نێن بڵێ ئەوەت چۆن زانیوەو لەکێت بیستووە!؟.

بەدەنگی قاییم ترەوە:
- ئاخر. ڕۆژی ئەوەیە!.
زانا هەر ئەوەندەی بۆ مابووەوە: بە وشتی و سەرسوڕمانەوە تەماشای دەم و زاری بکات.
گورجی هاتەوە یادی و بەسەر لەراندنی نارەزایی یەوە:
- ئەوە لۆیە هەتا سالێک مانگ نەبوو دە دوازدە جارم پێنەڵێت.
- ئەرێ داپیرە ئەوە چاوت چ دەردێتی؟.
- بۆ..وای لێهاتووە؟.
- ئەوە قیچێک تانەی کەوتووەتە سەر.
- دێلیت سەیری بکەم.
ئەویش لەسەرباری پێشتر سرکانە لێموورِ بوو بووەوەو لەدواییدا بە هەڵچوونەوە گوتی:
- دایە ئەو هەموو هەراو هۆریایەتان ناوەتەوە ئەوجا هەتا هەنووکە لەمن داپۆشراوە و لەڕاهی خوا پێمنالێیت: چییە!؟.
بەملیداهات بێ خوایشتی حەزیەوە بەرەکەی بۆ یەکەمجار هەڵداتەوە و:
- ڕۆڵە. لە مێژە تازە لە گەڕەکی باداوان سەنگرابووینەوەو خواخوامان بوو کەس نەماننناسێت. کوڕە بیژییەکەی «ئۆمەرە جاش»ی جیرانمان، خوا عالیمە هەر پشکێکی لەیەکێک ئیجاد بووە. شەوو ڕۆژ دەست و دارلاستیقی شەڕ بوو.
ڕۆژێک دوو تەقە لەدەرگای حەوشەمانەوە هات. منیش بەناخێری گیانمەوە سەرم بەدەرەوە داگرت و لەوی ڕامام. کە بەتەنیا لە کۆلانەکە بوو. پێش ئەوەی زارم بکەمەوە هەر هێندەم زانی ڕنگە لە دوورِ چاومی هێنا. لەتاو ژانی بەحوجەت سەرم سووڕاو و چۆکاو

چۆک بەربوومەوە.

لەوکاتەدا «مامۆستا قاسم» ی بەرامبەرمان هاتە دەرێ و ماڵی ئاوا بێت ڕاستی کردمەوەو گەیاندمیە خەستەخانەو پاش تەداوی دختۆر گوتی:«

- ڕەنگە تانەیەکی گچکەی لێ پەیدا ببێت».

زانا هەتا ئەو ساتە پێ نەحسیا بوو. دیقەتیدایەو بەدی کردو قاروخەفەت لەناخییەوە گینگلەیان پێداو بە:

- لاحەولە وەلا قووەتە ئیلا بیلـلا»ی سەربادانی توورەیی یەوە ویستی بێتە گۆ، کەچی گورجی ماوەی نەداو بەردەوام بووەوە:

- مامۆستا بەدزی پێیگوتم شکایەتی لێ بکەم. هەرکە وەزعەکەمانی زانی گوتی:

- وا باشە تەپس بکرێت.

زانا هەننۆب ویستی نۆرە وەرگرێت. پاشدان وای بەهەموار لە قەلەمدا هەتا دایکی دەستی بەردەبێت ئارام بگرێت.

- ڕۆژی دوایی دایکی هاتە لام و تەوازووی زۆر خواستەوەو سوێندێکی مزری پێدادا و:

- وەلـلا وەبیلـلا وە تەلـلا هەرسێک ناوی خوانە تازەم زانیوەو کوڕەشم زۆر چاک دارکاری کردووە.

- بە کوڕی خۆم بڵێم: ئێوارە کە نەبەز لەبازاڕ گەڕاوە پێمگوت:

- دەردێکی زۆر پیسەو پاش ڕۆیشتنی تۆ برووسکێکی بەحوجەت لەچاوم وەستاو دختۆریش گوتی:«

- هەتا چەند ڕۆژان مەیکەوە».

- بەدزی ئەو دەرمانەم تێدەکرد. بەس من لەوە حەیر ماوم چۆنی زانیوەو لە کێی بیستووە.

- زانا بەوپەڕی دەغەزەوە گوتی:
- باشە ئەدی بۆ بە منت نەدەگوت؟.
تاوێک بە وەڵامەکە خۆی بەبیرکردنەوە بواردو لەگەڵ سەیری کردنیدا گوتی:
- ئەوەی ڕاستی بێت لەحەیفی ئەو سێ نێرەکەی کەوا هەموو ڕۆژێ لەبەر چاومان جرت و فرتیانە دڵم بەردەستی نەدا ئەمەشی بخەمە سەر.
- دایە چاوەکەم کوشتن و چاو کوێرکردن هەریەک حسێبەو لێخۆشبوونی محاڵە. بەڵام هەتا دەخێوێتی سەبرو پشووی درێژی گەرەکە.
هەرکە لە بنترنەی مەسەلەکە حاڵیبوو بە بافرەکەیەوە گوتی:
- دەگ دەستەکانی خۆشبن!. بەڕاستی کاری مەردانەیەو بەخۆی هاوار دەکات.
بەلای سۆزانەوە ڕووی وەرگێڕاو گوتی:
- ڕۆڵە ئەو دار لاستیقەی لە کێ پەیدا کردبوو؟.
- لەمێژە لەکنیتی، وەکی لەهەرمۆتە بووین دەچووە پەنایان نیشانەی دادەنا.
گورجی بەجارێک کەوتە دەریای داتلەکان و واق ورمانەوە کەلێی بیست.
- وەکی ئێوەش لە ماڵ نەبوونایە ئەوەندە مەعلان و لێزان بووبوو دەرزی دادەناو یەکەوجار لێیدەدا. هەرجارێش دەیگوت:
- مەریوانۆک کێوە دەچیت ڕۆژێک هەر دادێت دایکەکەت بەکەر بگێم و تۆڵەت لێ بکەمەوە.
- ئەو مەریوانۆکەی دەڵێت کوڕی ئۆمەرە جاشە.

- بەڵێ. بیژی لە بیژیان پەیدا دەبێت.
«بەلمووز بڵندیەوە دوو ڕۆژ دوای کەتنەکە پێیگوتم:
- دایکم لەسەر پیرێژنە قاحپەکەی داپیرت زۆری بەداران لێداوم، بەڵان بابۆی بمێنێت شەرت بێت چاوەکەی تریشی کوێر بکەم)).
زانا بەزەردەخەنەی شانازییەوە گوتی:
- ئەگەر رەنج بەخەسار نەبووبێت و تۆڵەیەکی پڕ بەپێستی کردبێتەوە هەر نەییسە.
بە هاواریەوەچوون و لە موفەوەز سەلیم ویکەوتن:
- ئێوارە پێش ڕۆژئاوا خۆی تەسلیم کرد.
مەریوانی ئۆمەرە جاش لەبەر دەرگەی خۆیان دەبینێت و داردوولقێکی لە دورچاوی چەپی دەدات و تێیدەقوچێنێت. پشتیوانی برای دەیداتە بەر گوللان. گوللەیەک بەناو پستێری شەروالی دەکەوێت.
بەمە هەردووکیانی سەری غەزەباویان بادا و ئەویش بەردەوام بووەوەو:
- پاش تەوقیف برینەوە تەلەفۆنمان بۆ باوکی کرد و گوتی:
- کاکە من لەهەوەڵەوە زۆر پێی هەڵچووم و بڕیارمدابوو بەدەست بیگرم تۆڵەی لێ بکەمەوە. لەدەستیشم دێت. کەچی بڕوا بکە تازە مەسەلەکەیم لە مامۆستا قاسمی جیرانمان بیست.
ئەوجا دایکی منداڵان پێی لێناو لەئاخرو ئۆخری هەشتاکاندا ڕوویداوەو ئەو بنەماڵەش بەخۆت لەمنیان چاکتر دەناسیت و ناو دەنگیان بەوە دەرکردووە ڕەنگ نییە غەدرێکیان لێ بکرێت تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە ئەگەر شاهەنشاش بێت.
ئەگەرچی بە قسەی دختۆر ڕەنگە چاوەکەی کوێر ببێت. بەڵام من بە حەقی خۆیان دەزانم و بۆیە هیچ دەعوایێکم لەسەری نییەو بۆ منی مەگرن.

گورجی هەرکە بیستی بە ڕوویێکی گەش و عوبابەوە گوتی:

- جاش و ئەو تەرزە هەڵوێستەیان نەگوتووە، بەلاّن وا دیارە بەرۆکی نوێخوازی و عەلمانییەتی داغمەدارەکانی نەگرتووەو بەپێ و دانی سەلەفییەت لێدەکات.

دەنگی بەرز کردو گوتی:

-: مادام ئەو جۆرە پیاوەیە ئەوا ئێمەش لەگوللەکە خۆشبووین. ئەگەر نا دامنابوو دواڕۆژ شەروالّی پشتیوانی کوڕەکەی بەگوللە کون بکرێت.

بەردانەکەی بۆ بەیانی ماوە.

زانا زۆری لەبەردڵ بوو. بەخۆی نەوەستاو بە دەغەزوە گوتی:

- دایە عەیبە، عەیبە!.

هەرکە دیتی دایکی بەدەنگێکی زۆر بەرزەوە، لەگەڵ هاتنە دەرەوەی نەبەز لە بەندیخانە:

«تلیلیلی»یەکی تێهەڵکردو پۆلیسەکان بەسەریاندا قژقژان.

بە شاگەشکەبییەوە گوتی:

- ڕۆڵە عەیب لەگۆڕێ نییەو باوکی ڕەحمەتیت گوتەنی:

- تۆڵە سەندنەوە دەبێ هەموو خەڵکی دەوروبەر بزانن.

ڕووی بەبزەیەکی شانازییەوە بەلای نەبەزەوەی وەرگێڕاو گوتی:

- ڕۆڵە بە قوربان جارێ وەختی ئەوەی کردت نەبوو.

- داپیرە ئەگەر ئەمڕۆ چاوپۆشی لە غەدری ئاوا بکەین مسۆگەر سبەی چاوپۆشی لە ستەمی گەورەتریش دەکەین.

بەزەردەخەنەوەی گوت.

* * *

- زۆربەی خەڵکەکە دایک و باوکیان کاربەدەستانی بەرە بوو..و بەو «با»یە دەژیان لای ئەوانەوە دەهات. لەبیلبیلەی چاوی خۆیان خۆشتر دەویستن و حەزیان وای دەخواست دەست ڕاگرن پێ لەسەر دابنێن. لایان وابوو لە ئاسمان هاتوونەتە خوارەوەو لە نێوکێژەنی ڕووبارێکی تیژڕەو..و لەئاخر و ئۆخری هەناسەیاندا بە بازووی هیلاکی ئەوانەوە ڕزگار بوونە.
لەمەودواش تاکو بەڕێگایەکی ڕاست و زانستیانە بەرەو ئاسۆیەکی گەش و پرشنگداریان جلەوکێش نەکەن ڕیشەمەی تەقەلایان بەلای چەوتی و قەڵپاتی لار ناکەنەوە.
گورجی لەزانای وەرگرتەوە و گوتی:
- ڕۆڵە پێمان خۆش بێت، یا ناخۆش ئەوە بیروباوەڕی چینە چەوساوە و دەربەدەر و لێقەوماوی میللەتەکەمانە.
- ئەم ڕێزگرتنەیان خۆی لەقەرەی ڕێزگرتنی پێشمەرگانی ساڵانی شەست و سەرەتای حەفتاکان دەدات. حەقداریشن چەندین ساڵە تینووی ئازادی و گوزەران خۆشی و سەرکردایەتییەکی ڕاستەقینەی خۆیان بوون و ناڵەی بێدەسەڵاتیان لەژێر چەپۆکی بێ ئامانی بەعسی زەندیقەوە دەگەیشتە پانتایی حەواوە.
زانا زۆری لەمل خۆش بوو، دایکی ئاوا گوێی بۆ هەڵبخات.
- ئەمڕۆش وا پێشەنگیان، کە ئاواتی هەرە مەزنیان بوو لەکۆڕی ژیاندا و حەیام زەمان بۆی لەسەر ئاو و ئاگر بوون، ئەندامی بەرە ڕۆڵەی خۆیانن کاروباری ڕۆژانەیان لە هەموو ڕوویێکەوە بەڕێوە دەبەن.
- کوێرە چیت دەوێت؟! دووچاوی ساخ.
- ئەم باوەڕ پێبوونە لەڕادەبەدەرە بووە چاوپۆشینی خیانەتی ئەنفال

و کیمیاو کۆکوژەکەی کۆمەڵگەی «قوشتەپە»و گەرمیان وناوچەکانی دیکەی کوردستان.
گورجی تەواو خۆی خزاندە نێوگفتوگۆکەوە و گوتی:
- کەمێکیان ئەگەرچی لە نێوان چاڵان و ماڵانی دوو دڵیدا: «شیاون و شاونینە» دا هەڵبەزو دابەزیان بوو: کەچی هێزی هەراو هۆریا و چەپڵە و هوتاف لێدانی بە گوڕەوە، لەکاتی پێشوازی حەوجە بوونەوەی حۆتر حۆتریاندا مل کەچ کردن.
- تاک و تەراش کە نرخیان لە بلقی سەر ئاو زێتر نەبوو:«
- سەگی ڕەشمان لەکۆڵ بووەوە کەچی بەداخەوە سەگی سپی جێگەی گرتەوە. ئەو لەدوورەوە ڕەش دەچووەو دەناسرا، ئەمەیان هەتا گڵاوت نەکات هەست پێناکەیت».
کردەوەی زەقی بەرچاوان مێشکی هەردووکیانی ئاو دابوو:
- بەرە هەموو شتێکی لێدەوەشێتەوە تەنیا ڕاستی و خزمەت گەل و نیشتمان نەبێت.
زانا هەرگیز نەیدەویست گفتوگۆکە بپچڕێت و گوتی:
- سەرانی بەرە بەچەشەی ڕابواردنی سەراوو دەراوی ساڵ و حەیامی هەندەرانەوە کارزان و مەعلان و لەهەزار ویەک ئاویان داوەو قولەقاپیان تەڕ نەبووە.
- جاقی و کەمۆیەکی واجۆی بەدیوار هەڵدەگێڕن و دەتوانن غەنیمی خۆیان کەمیللەتە لێقەوماوەکەیانە ڕۆژی چەند جاریان ببەنە سەر ئاوو بەتینوێتی بیانهێننەوە.
- هەرکە جێگەی قوونیان لەسەر خاکی ئازادکراوی باوک و باپیران، یەکەمجار بێ ترس و سەراودونان گەرم کردو پارووی کەچەند ساڵ بەناوی خەباتی نەتەوایەتی و سۆسیالیستەوە، بەدوایا عەودال

کەوتە ڕۆنەوەو پێش هەموو شتێک سێ لیژنەیان پێکهێنا.
زانا هەوەستی پێهات و زانی دایکی لەوسەری ئەو تەرحە بابەتانە دەگەڕێتەوە.
- یەکەم: لیژنەی دەست و داوێن.
بەسەرپەرشتی شوان و هەردی پیاوی هەڵۆ ماڵە ڕەفیق حیزبی و موستەشارو ئامیر فەوج و جاش و خائینان نەما سەری مێچکە مێچکەو لیبانلێسی سێ چوار جار پێدانەگرن و دەست و داوێنیان نەبن. هێندێکیان لەترسان و عولعولاتی خۆیانەوە بەچەند شێرێک هێنان لەملای زارییەوەو چەند ڕێوییەک لەولا ملی تەوازوویان زوو دانواندو خۆیان خزاندە کۆشی حیزبەکانی بەرەوە.
کەچی خائینە جاقی و دنیا دیتەکان زۆربەیان بەخشەی قەلقەلاشک نەڕەوینەوە. هەتا بەپارەو قەمەرەی نوێی ڕێزلێنانەوە مڕ نەکران ویستی لژنەکەیان بەهەند هەڵنەگرت.
- هەشیان بوو نەک هەر بێزیان نەدەهات چڵمیان پێ بسڕنەوە. بگرە کارە خیانەتەکەی خۆیان سەت قات لا شەریف و ماقووڵ و ڕەواتریان دەزانی.
ئۆمەرە جاش لەنێوان دەستی بینەو بگرەی هەردی و شوانەوە لەموزایەدە دابوو.
- جەنابت بەس ببێتە لایەنگیری ئێمە هەرچی بڵێیت لە خزمەت وەستاوین.
- فەرموو: ئەو «٥» هەزار دینار لە منەوەت پێشکەش بێت.
- من دە هەزار.
- پازدە هەزار.
- کوڕە ڕکم مەکەوە، لەبەر ئەوە کاک ئۆمەر هەر لە هەوەڵ ڕۆژی

شۆڕشەوە پیاوێکی پاک و تێکۆشکەرێکی بێوێنەی میللەتەکەمان بووە ئەوا من «٢٥» هەزار دینارو سۆپەرێکی نوێشم پێشکەش کرد.
گورجی هەتا لەسەر تیلەقەی پشت کەوت لە حریتەیدا و گوتی:
- مالە لهەوا لیلهەوا» ئـ.هـ بە ناخێری گیانی سەرانی بەرەوە ئەوا شەش مانگە بەناو حکومەتن مووچەی ژیانی فەرمانبەرانی خۆیان نەداوە، کەچی وا بە ملی شکاویان «٢٥» هەزار دینار و سۆپەری ٧٥ هەزار دینار باوی پێشکەش بەخائینی کوردو کوردستان دەکەن.
بە دەنگی بەرزی قارەوە گوتی:
- هەتا سەربمێنێت پاشەڵ عاجباتیان دەبینێت.
بە پێکەنینێکی تەوساوییەوە گوتی:
- ئەوە بەڵگەیەکی ئاشکرایە: ئەوانە فریان بەسەر سیفەتی سەرکردایەتی ڕاستەقینەی میللەتەوە نەماوەو تەنیا مەرامیانەو زۆریشیان مەراقە بە حوکمی تەماع دڵی ئەو کەسانەی کەتوزێک زەبر بەدەست بوون و بۆ دواڕۆژ مەترسییان لێرەچاو نەکرێت، جا با «شان و شەپیلک» یان بە حەتوتە و مەتوتەی «نەوتولشوجاعە»ی ئەنفال و کیمیاو زندەبەچاڵی میللەتە ڕەچاڵ بڕاوەکەی خۆیان و کاول کردنی کوردستان ڕازابێتەوە، بەلای خۆیانەوە جەلب بکەن.
بە پێکەنینێکی تەڵخەوە گوتی:
- دیارە ناشزانن پەتی تەماع زۆر کورتە و ناگاتە سەرو هەرکاتێک هات و پچرا دەستیان لەگونی کوڕیان بەردەبێت.
گورجی هەرکە زانی ماڵی ئەحمەدە گولە ڕۆژ هەتا ئێوارە لەسەر زلەکانی بەرەوە مونجەی دێت و کات بەچایە و قاوە خواردنەوە بەسەر دەبەن بە تریقانەوە گوتی:«
- لەبەر نەبوونی پشیلان مشکان تلیلییە».

هەرکە لیژنەکە زاری لەم بارەیەوە بەڕوویدا کردەوە یەکسەر پڕهەڵماو چاوی سوورڕ هەڵگەڕاو بەتەماشایەکی غەزەباوییەوە گوتی:
- تۆخوا قەت عەیب ناکەن و شەرمتان بەخۆ نییە ئەو داوا قۆڕەی لە یەکێکی وەک من، کە چەند ساڵە لەنێو دەمی عەزیادا، لە یارمەتیدانی جەنابتان بەماڵ و سەروەتی خۆم قسووریم نەکردبێت دەکەن!.
شوان خۆی پێنەگیراو هەر زوو لێیوەرگرتەوەو گوتی:
- ئەشەدو بیللا ئەمرۆ دنیایەو سبەی قیامەتە درێغیت کەم و زۆر نەکردووە.
هەردی نۆبەت بڕی کرد و گوتی:
- یارمەتییەکی وا لەمێژووی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی هەستی کوردایەتیدا کەس بەخەیاڵیش خۆی لەقەرەی نەداوە.
لەناخەوە پێکەیفدار بوو..و بە بزەیەکی دەهایانەوە گوتی:
- ئەوا لەبەرچاوانە و پێویست بە گوتن ناکات.
- لەوبارەیەوە ئێمە لە ناخەوە، بە ناوی سەرکردایەتی هەردوولامانەوە زۆر سوپاسی پایەبەرزی و دەست و کەرەمی جەنابت ئەکەین.
دوای ئەوە کەزانی زۆر نەرم لێدەکەن بە خەندەیەکی تەوساوییەوە گوتی:
- کەواتە پێم ناڵێین من ببمە لایەنگیری کیهانتان. ها!؟.
هەردووکیان ئەوینی پارە لەدەروونیانەوە هەموو کەل وبەرێکی پڕ کردبووەوە، دەلحاز سەری تەوازوویان بەسکوتی، بە خۆدا شۆڕکردەوە. کەچی ئەو کۆڵی دڵی تەواو دانەسکنابووەوە و دڵنیابوونی لە هەڵچوونە بە سۆزەکەیان فس بوونەتەوە لە ناخەوە دوا:«

- دەرکەوت ئەوانە بێجگە لەخۆشەویستی پارە چیدیکەیان لەبار شک نابردرێت».
بێ پێچ و پەناو بە جەسارەتەوە بەڕوویاندا تەقییەوەو:
- ئەوەی ڕاستی بێت من خۆم لەخزمەت کردنی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانیدا لەسەرکردەکانی هەردوولاتان ئەگەر مەزن تریش دانەنێم گچکەتر هەرناو.
بە پارەی موستەشاری و ئیستخباراتی «مەرکەزی» سەر بە کوشکی کۆماری بەعسی داگیرکەرەوە هەردوولای وا مڕ کردبوون گریمان عارەبی سواری سەر ملیان ببێت کەم و زۆر دار لەخۆیان نادەن.
ڕووی قاراوی هەڵخست و گوتی:
- ئێوە لە دڵی من دا مرۆی زۆر ئازیزو ڕێزدارن ئەگەر نا بەم داوا ناهەموارەتان دۆ..و دۆشاوم تێکەڵ دەکردن.
دووەم: لژنەی سووک کردنی حەسار لەسەر دوژمنی داگیرکەر.
سەفین و سیروان پێهەڵدەستان، لەبەراییدا دەستیان بەسەر گومرگی شارداگرت و بێ باج وەرگرتن قەدەغەیان کرد هیچ شتێک چ بۆ ناو دوژمن چ لەناوەخۆدا باربکرێت. کەچی ئەوانەی خۆیان شەوان بەقاچاخیان ڕەوانە دەکرد گوایا کەسنەزانە:
- دانەوێڵە و شەکر و چاو ڕۆن و برنج و... ئەو بابەتە پێویستیانەی کەلای حکومەتی بەعسەوە داوایان لێدەکرا. بەپێچەوانەی ویستی «U N»وە کە لە زەبروزەنگی کوشندەو بێ ئامانی پاراستبوون. ئەگەرنا بە بیست و چوار سەعات خاکیانی لەتوورەگە دەکرد، بەبێ باج ئاوا دەکران، شەوان هەتا شەبەقی بەیان تۆزی لۆری وپیکابان هەرگیز نەدەپساوە.
- گریمان ئەو لژنەیە نەبووایە باری حەسار دوژمنی داگیرکەری

هەتا رادەیەک شڕ دەکرد.
- کەچی ئەو لەسەر ئەو حاڵە شپرزەیی یەشی خاوەن بیروبۆچوونی تایبەتی خۆی بوو. نەیدەهێشت هیچ شتێک لە دیوی خۆی ئاوا بکرێت.
ڕۆژ نەبوو بە سەتان شتی زۆر کەم لە سەیتەرەکان بەدەست خەڵکە هەژار و برسییەکەوە رانەستێندرێت و تووڕ هەڵنەدرێت. گورجی لەسەیتەرەی «شێراوە»دوو کیلۆ خورمای ڕەشی کەسارای ئامۆزای بە زۆر پێی ناردبوو لێقەدەغەکرا.
چەند کەسانی گالۆنە «نەوت» و شووشەی ئاوی تەماتەو تەحین و. بە دەستەوە تەرحی ئاژەڵ بۆ گەڕانەوە بەرەو دواوە ڕیز کردبوون و ئەگەر بابەتەکانیان جێ نەهێڵن.
لەلایەکی دیکەوە چەند لۆری و پێکاب و ترێلەی پڕ زەخیرەی حکومەتی کوردەوە لەسەیتەرەکە تەفتیش دەکران، بێزی لەخۆی بووەوەو لە دڵی چەسپی کاربەدەستانی خۆیان ئەوەی پێیدەگوترێت کەرامەت و عیززەتی نەفس و هەڵوێست لەئاست دوژمن و تەماعەوە لە ناخیانەوە شک نابدرێت. زۆریشیان بۆ هێنا، ناچار هەتا خواستی سەیتەرەکە «گەڕانەوە بەرەو دواوە» یا خۆ «خۆرمایەکەی تەسلیم بکات» نەهێنێتەدی ژێر کیسەکەی کون کردو هەتا دەستی تێدابوو لەگەڵ گوتنی بەدەنگی بەرزەوە:«
- ئەمەش بە قەبری باوکی بەرەی کوردەوە!». تێیهەڵدا.
سێیەم: لژنەی وێران و قەلۆش.
گورجی لەناخەوە دوا:«
- لەبەر چەوری و گرنگی ئەم لژنەیە شێخ سەدرەو هەڵۆ خستوویانە ژێر دەستی خۆیانەوە.

- ئۆتۆمبێـل و شـۆفەر و بلـدۆزەرو مەکینـەی هەمەچەشـنی میـری مەگـەر بـە زەبـری واسـیتەیەکی زۆر بەهێـز، دەنـا لەدەسـت لژنـەی گۆریـن قوتـار نەدەبوون و یەکسـەر ئاوا دەکران. پاشـدان کورسـی و مێزو قەنەفەو موبەڕیدەو سەلاجەو موجەمیدەو کۆمپیوتەرو تەلەفۆن و هەرچی دام و دەزگای میری بوو ئا. بو پ. عەشتەبایان نەهێشت.
زانا هەر زوو با گۆی بەملایە داوە:
- نۆرە گەیشـتە تـالآن و فـڕان و دزینـی سـەیارە و مەکینـەی و نویـن و بڕوبزگـوڕی مـالآن.
- لەمێـژووی سـەرهەلٌدانی مرۆڤایەتییـەوە دزو تالآنکـەری ئەوهـا چاوقاییـم و برسـی و بـێ ئابـڕوو نەبـووەو ناشـبێت و بەخەیالٌـی عەرەبانیـش دا گـوزەری نەکـردووە.
- زۆر ڕاستە.
- هـەر بـە ئاشـکراو بێ سـەنگرانەوەو تەقیـە کردنـی شـەرمەوە لەدیـار خەلٌکـی بـازاڕو جەرگـەی شـارەوە، هەرچـی بکەوتبووایـە بەرچـاو..و مالٌـی هەرکـەس بووایـە بەزەبـری چـەک لـرف دەکـرا.
بێنێکی دایـەوە دەمێک بـوو حـەزی وایدەخواسـت زانـاش ئەمـە بزانێت و بـە مەراقـەوە هەلٌیدایـە و:
- شێخ و هەلٌۆ دوای ئاشبەتالٌە نەگریسەکەی دووەم هەتا پێ و قدوومیان دەرکەوتـەوە، لەهـەوای کەیـف وسـەفاو بەزمـی داوێـن تەبەڕایـی بـاڕو تیاتروخانـەی هەندەرانـەوە پشـووی چێـژی حـەزو خرۆشـتی «گـەلٌ و گوان» یان خواردووە، لەو ساکەوە هەرچی لەکۆڕی خەبات و ژیانی پێشـتریان لەسـکۆلەی دلٌیانـەوە چەکـەرەی کردبـوو، بـە جیرەی ئەوینـی بوتـی دراو لێکـرا ڕەش بـووەوە. بۆیـە وا ئەمـرۆ تەرحـی چاوئێشـە داکەسـانیان نییـە، بەهەرتـەرزە ڕێگایـەک بێت دراویـان چنگ کەوێت.

زانـا بیـری بـۆ ئەمـە نەدەچـوو. و زۆری هەوەسـت پێهـات کەدایکـی زانیـاری لـە زۆر شـتان هەیـە.
- مانگێـک، دووان هەرکـە لەڕووتانـەوەی نیشـتمانە بـێ خاوەنەکەیـان بەرهەمیـان بـەرەو کـزی دەچـوو، هەرخۆشـیان بنیـادەم و خـاوەن هەمـوو شـتێک، میللەتـە ڕاپەڕیوەکـەش چارەواو هیـچ حسـێبێکی ئـەو تۆیـان نەبێـت هەتـا لەبـەر خاتـری چـاوی کاڵـی تۆزێـک بسـلەمێنەوە. یاخۆ بەزەیـی یـان بـە شـارەکەیاندا بێتـەوە، بـێ پـەردەی حەیـاوە بینـاو سـاختمانەکانیان خسـتە مـەزادەوەو بـۆ پـارەی فرۆشـتنی شـیش و بلـۆک و کەرپـووچ و کاشـی و بـەردی حەلانـەوە، دانـە مسـت دزو زەفتییـە چاوبرسـی و بێویژدانـی دەسـتە ڕاسـت و چەپـی خۆیـان.
- سـاختمانی وا هەبـوو نزیکـەی دوو ملیـۆن دۆلاری تێچووبـوو کـرا قوربانـی پـارەی ڕابواردنـی شـەوێکی ((........)) ومەیخانـەوە.
- لـە زەمانـی دەقیانووسـەوەڕا، چەنـد دوژمنـی بەتەمـاع و سـتەمکار دەسـتیان بەسـەر ئـەم شـارەدا گرتـووە، لـە «٦٠» شەسـت ڕۆژ تـۆپ بارانـی نادرشـا و زەبروزەنگـی عوسـمانلی داگیرکەرو ئینگلیزو ئەنفالـی سـاڵی کەرگیرانـی بەعسـەوە. هەتـا ئەمـڕۆی حـازری بەقـەدەر شـێرو شـەپاری بـەرەی چەمەرییـەوە زەرەروزیـان بـەو شـارە نەگەیاندراوە. هـەر شـوێنێک بۆنـی ئاوەدانـی لێدەهـات کـرا سـارایەکی چـۆل.
- ئـەو سـاختمانانەی دوای ڕووتانەوەکـەش مـاون هەرگیـز لەبـەر بەزەیـی پیاهاتنەوەیان نەبوو بەڵکو خۆیـان لەهەڵسـوڕاندنی کاروبـاری ڕۆژانـەی حوکمڕانیـان پێویسـتیان پێهەبـوو.
- سـەر زلەکانـی بـەرە هەرکـە زانیـان ئـەو دوو کەسـە دراوێکـی لەعەقڵ بـەدەر زۆر وەدەسـت دەهێنـن، لەپاداشـتا بـۆ هـەر یەکەیـان دوو سـێ «بایـع»ی بـێ نفـووس دەرهێنـاو ئازووقەکانیـان لەبـازاڕی ڕەشـدا بـە

دە قیمەت زیاتر دەفرۆشتەوە.
- ئەوانیش بە مەدالییەکانیان ڕەشتر دەبوون و..وەک چاوئێشە تەقەلایان بۆ . وەبەرهەم هێنانی پتر دەدا. دەستیان خستە کاروباری لژنەی دووەمیشەوەو گومرگیان لەسەر بەرهەمی ولات وەک دانەوێلە و شتی تر،لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تری ژێردەستیانەوە بچێت زۆرتر کرد.
مەلا سمایل دوو عەلبە گەنمی بۆ نان لەگوندێک کڕی و لەکاتی بردنەوەی بۆ شار «٦» شەش دینار گومرگیان لێساند. لەناخەوە پرتاندی و:«
- ها. بگرن بۆ ژنەکانتان بنێرن هەتا بەدەرمانی خۆ تاس و لووس کردن بدەن لەهەندەرانەوە».
بە ڕوانین بۆ زانا متیەکی بەسەرداهات و:
- ڕەنگ نییە مەکینەیەکی دروومان، ماتۆڕێک، سەلاجەیەک لە دێهاتەکانەوە بۆ لای وەستای شار ببردرێت بە پێچەوانەوە ئەوەندە گومرگی دەخرایە سەر زۆر لە نرخی چاکردنەوەکەی زیاتر تێدەپەڕی.
گورجی لەسەر دوانەکەی بەردەوڕام بوو:
- ئەمە پاداشتی چاکە و سۆزی خەلکە ڕاپەڕیوەکەیە. کەوا دەستیان لە هەمبانەی تەڕی تێکۆشان و خەباتەوە، بەیەکجاری بەربوو، بوو..و سالدانە،سالدانە بێ تەقە و ماندووبوونی هەراو هۆریای حیزبە ((بە.......)) گەڕاندیانەوە سەر..ڕەو سەیەکی سوورکراوە:
زانا زۆر بەم زانیاریانەی دایکیەوەی کەیفدار بوو..و هەر هەست ڕاگری لە قەوام دا بە گوڕتر دەبوو.

* * *

گورجی رووی بە سۆزەوە لە سەفین کرد و گوتی:
- کاک سەفین ئێمە ئەوا سێ کەڕەتە بێین تۆمان پێناگیرێت.
باشی دەناسی و لەبەر..واریقاتی ئەنفالەوە تەقییەی زۆر لێدەکرد و بە ساردییەوە گوتی:
- ئیشتان هەبوو؟.
- ئەوە سارای ئامۆزامەو خەڵکی شاری کەرکووکەو ئەو «قەمەرە»ی.........، لاتانە هی ئەوانە.
پێشتر خەلیل پێیگوتبوو:
- لەڕۆژی کۆڕەوەکەدا ئەوەندەی کەل و پەلی دزیاری لێبارکردبوو، پاشەوەی داهاتبووەوە، لەناو هەڵەتێکدا ڕۆتی دەشکێت و بەجێیدەیلێت. ئەگەر لە سنوور ئاوا کرابووایە قوتدرابوو. پاش گەڕانەوەی خەڵکەکە، بەردەستی ئەم و ئەو کەوت و ڕووتاندیانەوە.
سەفین هەرکە زانی خاوەنی دیار نییە وەریگرتەوەو بەسێ چوار هەزار دیناری نوێی کردەوە.
هۆپێکی لەخۆی زانی. کە تا ئەو ساتە وایدابووە بەر مەزەندە:«
- خاوەنەکەی ڕەفیق حیزبییەکی عەرەبەو ناتوانێت تاقیبی بکات».
بەدڵنیایی یەوە پاش باوەڕ نەهاتن گوتی:
- ئێمە ئۆتۆمبێلی کەسمان لا نییە.
هەر زوو تەرزی لە چەنەدانەوە گوتی:
- ئێمە بەلاش نەهاتووینەو سەنەوی و ڕەسمیشمان لایە.
کڕیارانە دیقەتیدا وێنەو سنەوییەکەو دەهایانە بەڕووی خەنییەوەو . وای پێشنیار کرد:
ئافرەتەو عەقڵ قورەیەو هەرە لە برەی ئەم تەرزە بابەتانە دەرناکات و گوتی:

- ئێوە سەهوونە: ئەو ئۆتۆمبێلەی ئەڵێن بچم و ڕەقەمی جودایە.
لەڕەنگی خۆی بۆیاغ کرابووەوە و زۆر نوێتر دەهاتە بەرچاو.
سارا کە لەحەوشەی بارەگای سەفینی بینی گوتی:
- وەللا ئەوە چ سەیارەکەی ئێمە نییە.
- کچێ هەوە، بەڵان بۆیاغ کرایتەوە.
- چۆن ئەزانی؟.
- زانا لای فیتەری دیتبوو..و لەموحەمەدی کوڕتی بیستبوو:
- بنەوەی چامرلغی چەپی کەرخی تایەی پشتەوە لەحیم کراوە.
هەر ئەوسات شوێنەکەی نیشاندا:
بێ پەردەوە گوتی:
- بەڵێ ڕاست دەکەیت. بۆیاغ کرایتەوە و لەجاری پێشوو نوێتر دیارەو ڕەقەم گۆڕینیش ئەمڕۆ بۆ دزان ئاسایی یە.
وەک شەپەزللەیەک لەدەم و لەوسی بدرێت، لەگەڵ ڕاجفری و شپرزاو ڕەنگی پەڕی. ناحەقیشی نەبوو. هەشت نۆکەسی لێبانلێس گەمارۆیاندا بوو . و تا ئەو ساتە هەر بەبەژن و بالای خەبات و کۆڵنەدانیان هەڵدەدا. کە بێ هاوتایەو لەڕێبازە مەزنەکەیداو:
- ئێمە لەوەتی دەتناسین هەردەم لەجەرگەی تێکۆشانی کوردایەتی بەردەوامیت و پێشمەرگەیەکی چوست و چالاک و جانفیدابوویت.
- دەشت و دەروچیاو چۆل و هەڵەت نەماوە لەناوچەکەدا شایەتیت بۆ نەدەن.
- لەڕاست دوژمنە ستەمکارو سەرکەشەکەمان هیچ ڕۆژێک گێلمەگێلمەت نەزانیوە.
- هەتا خاوەن سەرکردەیەکی بەجورئەت و بیروبڕوا چەسپیو..و دڵسۆزی ڕێگەی کوردایەتی وەک جەنابت بین زۆر زەحمەتە بەدەست دوژمن نسکۆ بێنین.

- خوای مەزن هەتا حەیامێکی زۆر بۆمانت ڕاگیر بکات.
- ئامین.
هەنووکەش وا ئەو پیرێژنە دەم وچاو قەپاوە بەدزی دەخەملێنێت، بیلبتوون کەوتنە گێژەنی قارو دەهرییەوەو شوورەیی ڕێگەی بدابووایە، هەر ئەو دەم هەتا ڕەپ دەبوو دەیان پەستاوە.
سەفین شارەزای بوو، دەیزانی چ پشکێکەو ئەگەر لەگەڵی پێدا بچێت دۆ..و دۆشاو تێکەڵ دەکات و بەسەربردەی ئەنفالیش حەیای دەکاتە حەیای پیاز فرۆش.
ئەمە ملی پێ لارکردەوە نەرم بنوێنێت و بە هێدییەوە بدوێت و:
- دایکی زانا ئەملاو ئەولای ناوێت سەنەوییەکە بە ناوی «موحەمەد یەعقوب»ەو گریمان هەویش بێت ئێوە هیچ مافێکتان بەسەریەوە نییەو خاوەنەکەی با بێتە لام ئەوکات دوو قسەی لەگەڵ دەکەم و دەردەکەوێت هی ئەوە یاخۆ هی منە.
- هەرزوو گوتی:
- موحەمەد کوڕی ئەو ژنەیەو لەترسی بەعسیان لەو ڕۆژەدا ناوێری بێت.
بە بزەیەکی تەڵخەوە گوتی:
- ڕەنگە تۆش بیناسیت: خێزانکەی ناوی «کابان»ە.
- موحەمەدی نەدیبوو، کەچی هاتەوە یادی پێشتر بیستبووی:«
- کابانی ئامۆزای شەونم-ی خێزانی دراوەتە موحەمەد ناوێک لە ڕەحیماوەی شاری کەرکووک».
دەستێکی کەوتە پێش و ئەویتری کەوتەپاش. تۆزێک داماو ئەو نۆرەی نەدا و لەگەڵ قیت بوونەوەیدا گوتی:
- ئەوا لەنیازمان حاڵیبوویت، ئەوجا ئەمڕۆ بێت یا سبەی سەیارەکەمان دەوێتەوە.

ئەمەی گوت و هەیپەی لێکرد.
سارا شەرم دەمی قڕمساندبوو..وکەم و زۆر شەکرێکی لەم ڕووەوە پێنەشکاو گوتی:
- ئەرێ گورجی هەی سەروبابانت لەهەش نێن پێم نالێیت، تۆ ئەو غیرەتەت لەکوێ هێناو چۆن تاسای زارگەڕانت بوو لەدیار ئەو عالەموللایە تومەتەکەی بدەیتە پاڵ!؟.
بە زەردەخەنەوە گوتی:
- سارا من پێشتر لەتۆ فەقیرحاڵتر بووم و مێشم لەدەمی خۆم نەدەکردەوە، بەڵان حەیاتی خۆم هاوسەری کەلەپیاوێکی بەجەرگ و چاونەترس و زانا بوومەو هێشتا بەئاستەمیش وشی لەدوا ناکەم. ئەوەی ئەمڕۆ دەزانم و لەبەرم دەڕوات هەمووی لەمەڕ ئەوەو بەدەرس لێی فێربوومە.
بەدەنگێکی کەمێک بەرزەوە گوتی:
- خۆ حاڵیبوویت؟.
بەسەرلەراندنی هێمنییەوە گوتی:
- بەڵێ.
- ئەگەر سەفین و هی وەکی ئەویش دەڵێیت: هەر لەئیجادەوە لەڕاست کەسانی نەزان و دنیا نەدیتەو هەژاری وەک تۆ شێرن. کەچی لەبەر ئەوە درووشمی ڕاستەقینەی کوردایەتییان لەساڵی ئاشبەتاڵی دووەمدا لە ناخیانەوە ڕەشدا گەڕاوە بڕوا بکە لەخۆیان قەلەزراو..و بێ غیرەت تر نین.
«لەگەڵ قیت بوونەوەیدا چاوی غەزەباوی لە دوڕ چاوی بڕی و گوتی:
- با ئەوەشت پێ بڵێم ئەگەر ئەمەمان بۆ جێ بەجێ نەکەیت حسێبی

گەورەترمان لەگەڵت هەیە.
کردەوە نامرۆکانی گۆڕینی هاتەوە یادو زمانی خۆی گەست و بە مردنی خۆی دەهاتە بەرێ نەک بە ئەوەی لەزاری دەرهات.
ویستی بەبۆرە وەڵامێکی پاکانە دەم بچرێنێت، کەچی حسیا بەدارتێوەردانی بۆنی زیاتر لێوەدێت.
«ئـ هـ پێنجتان لەبنەماڵەکەمان بەلاگیری گری...... خۆتان کردن کەخۆم شاهیدم بەلان هەتا ڕۆژ تاندا دێت پشووی درێژی ئارامی گەرەکە. مەرجە ئەگەر بۆم لوا لەژێر ئەو عەبا کوردایەتییە فیشالەدا بتان تۆپێنم.

* * *

«کاربەدەستانی بەرە ئەمرۆ لەوپەڕی شادی و سەرفرازیدانەو ئەوەی بۆ ئەوان هەڵکەوتووە، لەمێژووی ژیانیاندا ئاوایان بۆ نەگونجاوە، وا بەکەیف و ماشای خۆیان لەپاوانی هێڵی «٣٦» سی و شەش دەلەوەڕێن و گوێ پەڕەی ملیان بەنۆ تەوران نابڕدرێتەوە و لەخۆشییان هەلەکە سەما وسێ جریتانەیانە. ناحەقیش نین هەر بەزیوەکەی گۆڕێنن، کەوا دوژمنی داگیرکەری کوردستان، بەزەبری کوتەک دەزاندرێت قۆناخ لەکوێیە، تەرحی ئاژەڵ چەند ساڵ بوو، هەڵیبڕیبوون و لە هەرچی پێیدەگوترا جم و جۆڵی سیاسی و چەکداری بەری پێهاویشتبوون و عەزرەباتی پێ نەهێشتبوون. جگە لەکوردستانی ئاو تێوەردراو..و هەستێکی سەربڕاو..و ئۆمێدێکی لەبارچوو. وئاشبەتاڵێکی یەکجارەکی بێ کفن و دفن گۆڕبەگۆڕ چووبوون».
حەمەڕەحیم هەر جارێ دەیگوت:«
- لەبەر ئەوە «ئەندامانی بەرە» لەزەیدەوە هەتا عەمریانەوە

بەشداری تاوانی بەزینەکە بوون، بووە ئاردی نێو دڕکان و هیچیان بەدوا هەڵنەبەستا. لەڕاستیشدا ئاشبەتاڵی کورد قڕان و کوردستان وێران بوو».
«گەورەترین کارەسات کەتووشی گەل ونیشتمان بووە میز پیداکردنی هێڵی «٣٦» سی و شەشە".
زانا لێیوەرگرتەوە و گوتی:
- وا لەبەرچاوانە. وێڕای ئەوە ناوچە بەفەڕەکانی لەکوردستان دابڕاندووە خەڵکەکەشی کردووەتە کۆیلەیەکی زەلیلی ژێرچەپۆکی دکتاتۆری داگیرکەرەوە.
- بێجگە لەکاربەدەستانی بەرە کەسی دیکە بەرپرسی ئەو خیانەتە نییەو نەشبووە. لەجیاتی میللەتەکەیان هان بدابووایە، هەموو ڕۆژێ بێداکەسان و سل کردنەوە، لەبەردەم بارەگای" U N"ەوە گەورە و گچکە نێرومێ لە شارەکانی کەرکووک و سلێمانی و دهۆک و هەولێر خۆ پیشاندان ساز بدەن و بەردەوامیش ئەو دروشمەیان بەرزکردبووایەوە:»
- کوردستان یان نەمانمان دەوێت.
گۆڕستان یان هێڵی «٣٤» سی و چوارمان دەوێت».
کەچی بەداخەوە لەبەر خڕکردنەوەی پەڕۆ..و پاتاری تالان و دزین، کە دین و ئیمانیان بوو ئاگایان حەرام لەهەستی «نیشتمانی و کوردایەتی»یان بۆ سونەتیش نەما.
- میللەتیش باوکی ڕەحمەتیم گوتەنی:
- هێشتا زۆری ماوە «گەل و نیشتمان»یان بەلاوە لەسەرکردەی حیزبەکان خۆشەویستر بێت.

* * *

بۆ ئەوەی میللەت بخافڵێت و حەرەجی لەفەرهودو دزین و پۆخلاتی کاربەدەستانی بەرە نەمینێت، بەو پەڕی شەوقەوە ئەم گۆبەندەیان دامەزراند»

- دڵ و قودسی کوردستان» دەستیان بەکلکی «الاکرم منا جمیعا»ەوە قرمساند.

- کەچی ئەمەیان تا ڕادەیەک بۆ زرووفی ئەوسا گونجاوو لەبار بوو، ئەوانی تر لەڕوواڵەتدا بۆ ڕێزو ئەڤین دەبرین بوون، لەڕاستیشدا لەزەینی هزر تیژان شارەوە نەبوو..وبۆنی خافڵاندن و دوو بەرەکی میللەتیان پێوە لکابوو.

کەریمەکۆر سەری شانازی بۆ زانیارییەکانی دانواندو بەنیمچە پێکەنینەوە گوتی:

- تاس و حەمامەکەی «عەدنان قەیس»یە.

گورجی هەوەستی پێهات و هەرزوو بەزەردەخەنەوە زاری هەڵبڕی و گوتی:

- موژدە، موژدە خەڵکی بەشەرەفی کوردستان موژدە: لەمەودا پێویستیتان هەرگیز بەنەفت موشتەقەکانی نەماو:«

- کاک سەردار پشدەری فەرمانی لەهەندەرانەوەبۆ دەرهێنانی نەوتی «شیواشۆک» وفرۆشتنی لەگەڵ شەریکەیەکی بێگانە ڕێککەوتووە، هێناوە. ئەوپەڕی دوو یان سێ هەفتە تر نابات نەوتی خاکی خۆمان، بەڕەنجی خۆمانەوە بۆ دەرەوە دەڕوات».

بە نیمچە پێکەنینەوە گوتی:

- کاکە مەبەست تەنیا ساردکردنەوەی سۆزی خەڵکە هەڵچووەکەیەو بەس.

- زۆر ڕاستە، مادام نەفتمان دەسکەوت شاری کەرکووک و

دەوروبەریمـان بـۆ چییـە.
گورجی لێینەگرتەوەو بەشانازییەوە گوتی:
- ئەدی ئەو درۆ زل زلانە کەخەڵکە ساویلکەکەیان کاس کردبوو.
١- ڕاپەڕین سبەی، یان دوو سبەی لەشاری موسڵ بەرپا دەبێت.
٢- هێزی تەحالوف واگەیشتە زاخۆ.
٣- هێڵـی «٣٤»سـی و چـوارو «٣٥» سـی و پێنجیش دەخرێتـە سـەر هێڵـی «٣٦»سـی و شەشـەوە.
٤- دوژمن وا شاری کەرکووک چۆل دەکات.
کەریمە کۆر پێ شاگەشکە بوو..و گوتی:
- خۆچە دیارە ئەو درۆ زەبەلاحەت لەیاد چووە:
- شـەوێک لەنـاکاو هـات و هـاوار و هۆریایەکی وا بـەرز بـووەوە سـەگ خاوەنـی خـۆی نەدەناسـییەوە، بانگـەواز لەهـەر لاوەی شـار بـۆ گشـت چەکدارانـی حیزبـی و بێلایەنـەکان ڕاهێشـترا:
- هێـزە بـۆ بەگـری کـردن لـە ئەزموونەکەمـان کـەوا دوژمنـی دکتـاۆر نیـازی هێـرش کـردن و لەنـاو بردنێتـی بەزووترین کات خۆتـان تەیـار بکـەن.
هەرچـی چەکـدار بوو..بـاش و خـراپ کۆمـەڵ کۆمـەڵ و دەسـتە دەسـتە قەتارەیـان بـەرەو سـنووری هێڵـی «٣٦» سـی و شـەش بەسـتا.
گورجـی بەبیـری هاتـەوەو ئەوسـا واقـی لەجەسـارەتی چەکدارانـەوە وڕمـا و:«
- دەبـێ ئـەو هێزەیـان هەبێـت بتوانـن ڕووبـەڕوو بەرەنـگاری دوژمـن ببـن!؟ زۆر زەحمەتـە. ئەگەرنـا پێشـتر شـارەکانیان بەچەنـد سـەعاتێک تەسـلیم نەدەکـردن».
هیـچ هەسـت و خوسـتێک نەبیسـتراو لەمـلاو لـەولا لەکاتـی چۆلکردنـی

شارە لە چەکداران مەرامی کۆنگرە نانەکەیان بۆ سەرتاپای خەڵک والآبووەوە:
- تەڕدەستانە (( ٤٥ )) چل و پێنج هەزار دەبەی بەنزینی دزراو دەبەیان بە (( ٣٠ )) سی دینار فرۆشت.
کەریمە کۆر گوتی:
- دەیان درۆی بەکلک و گوێی ئاوا، بۆ ڕووتانەوەی خەڵک و وڵاتەوە لەهەموو ڕووێکەوە بووەتە حەتۆتەی گەردەنی سەر زلەکانی بەرەوە.
گورجی بە دەغەزاوییەوە گوتی:
- ئا. ئەو دزو جەردە مەعلانە نەبوونەتە ڕابەرمان!. کەسیش بیری بۆ ئەوە ناچێت زێن و شێنیان لە ئەوانە نینە ڕووبەڕووی دوژمن بووەستن. ئەگەر نا مەداڵیای دوو ئاشبەتاڵیان لەبەرۆک نەدەدرا.

* * *

نەفت لەبەر دزانی بەرەوە ڕۆژ بەڕۆژ لە بەرزیدا بوو. وئەوجا بەگوللەش دەست خەڵکە هەژارەکە نەدەکەوت و بیست و چوار سەعات لەسەرمان زستان دەلەرزین، مەگەر نۆبات سەر گەورەیەکی بەرەی چەمەری تەنکەرێکی لەپەناوە بدزیبووایەو لەبازاڕی ڕەشدا بەدە قیمەتی دەفرۆشتەوە ئەو کەسانەی ئەوانیان هێنابووەوە سەر حازرەکی. کەچی ڕۆژ نەبوو بەتەنکەر لەمۆڵگاکانیان بەسەر گۆردەکانی خۆیان دابەش نەکرێت.
- دەستیان بەسەر گشت چاپخانەکانی میری داگرت خرانە ژێر ڕەحمەتی حیزبەکانەوەو میری دەستەو پاچە واریداتەکەی لرف دەکرا.
- بەهەندێ باش بوو لەبەرچاپ کردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو زۆر شتی ترەوە پێویستیان پێهەبوو، ئەگەرنا سایلی بابەتەکانی تری شار بە تومەنێکی کەم بۆ ئاغاکانیان ئاوا دەکرد.

* * *

- میمی سەیارەکەم وەرگرتەوە.

موحەمەد پێشتر پێیگوت:

- دەبێ لەگەڵم بێیت.

دەیزانی لەگەڵ سەفین تێک دەگیرێت و کارەکە ئاڵۆزتر دەبێت و ملی نەهێنا بەرێ و گوتی:

- پیرۆزە پیرۆزە!. چۆنت پێوەرگیراوە؟.

بەکەمێک ڕووگرژییەوە گوتی:

- بڵێم چی.

ئاخێکی خەماوی دەرپەڕاند و گوتی:

- ((١٢)) دوازدە هەزار دینار حەقی چاکردنەوەی لێساندم و هەرچوار تایەی کۆنن و بێ سپێریش.

غەزەب دایگرت و بەڕوویکی دڕدۆنگەوە:

- ئە هە تایەکانیش بەلای کەمیەوە ((٨ )) هەزار کردی (( ٢٠ )) هەزار دیناری ڕەبەق.

لە تاوان هەستاوەو بەناو لەپ بەیەکداداندا گوتی:

- ئا. ئەوەیە کوردایەتی!. ئەوەیە تێکۆشانی ڕاستەقینەی ڕزگاربوون و ئازادی!. سەیارەی خەڵک لەدوڕ گەراجیماڵی خاوەنی بەزەبری چەک و بە ناوی خەباتەوە بفڕێنیت و پارچە پارچەی بکات و بە سێ چوار هەزار دینار چاکی بکاتەوە ئەوجا ((٢٠)) بیست هەزار دیناری خەباتی کوردایەتی وەربگرێت.

خەفەت سکوتی دەمێک پێکرد.

بەقارەوە گوتی:

- ئێ. چیدەکەیت وا ئا. وایە!.

لەتاو زۆری پارەکە قلْپێکی درێـژی دەرپەڕانـدو دەمێـک سـەری ناڕەزایەتـی لەڕانـدەوەو تفێکـی غەزەبـاوی لـەزەوی کـردو گوتـی:

- باشە سەیارەکەت ئەمڕۆ چەند دەکات؟.

- ڕەنگە لەدەوری سی و دوو هەزار دینار بکات.

بەساردییەوە گوتی:

- خەم مەخۆ..ڕۆڵە ئەو دوازدە هەزار دینارەی لەفرۆشتنی سـەیارەکەت دەمینێتەوە دونگەو لەدەمی ڕێوییەکی برسیت دەرهێناوە.

- سیروانی پیاوی هەڵۆم دووجار لەگەڵ خۆم برد

ئەگەرنا پێشتر هەر ئەیگوت:

- خاوەن سـەیارەکە تەقەی بۆ پێشمەرگەکانی من کردووەو یەکێکیان تێدا بریندار بووەو شاهیدیش گوللەیـەک بەقاپی پشتەوەی کەوتووەو دەبێ خاوەنەکەی بدرێتە مەحکەمە.

بە پێکەنینێکی تەلخەوە گوتی:

- ڕۆڵـە ئەوانە دزی ئاوقات و بێ ئابڕوونـەو بەزەبری چـەک بەرگری لـە خۆیـان دەکـەن و چـاک دەزانـن بـەدرۆو دەلەسـەو دزیـن ماڵـی خەڵـک ختـوڕا بخـۆن.

بەدەنگێ کەمێک بەرزەوە گوتی:

- ئەگـەر دزی چەکـدار نەبووایـەو لەگـەڵ تـۆی فەقیرحاڵیـش کڵاوی خۆی گرتووە با نەیبات نەبووایە هەرگیز نەیدەتوانی داوای فلووسێک بکات و بـە مەمنوونیـش دەیداوە.

ئەمە سەرنجی یادی بەرەو واریقاتێکی دیکەی بکێشی کردو:

- ئەوە خێرە ئەو ڕێگایەت غەڵەت کردووەو کاک ئەنوەر!؟.

بە بزەیەکەوە گوتی:

- ئەوەی ڕاستی بێت مامۆستا «زرار» منی ناردووە.

یەکسەر لەژێر زمانی حاڵیبوو..وزۆری کەیف پێهات. کەچی بەسەر خۆی نەهێناو گوتی:
- فەرموو.
- داوای لێبوردن لەئاست ئەو تاوانانەی کەدەرحەق بنەماڵەکەتانی ئەنجامداوە ئەکات.
خۆشی لەژێرەوە دایگرت، کەچی بە واق وڕمانەوە گوتی:
- ئەدی بۆ. بەخۆی نەهات؟.
- ئەوەی من بزانم چاوو ڕووی نییە.
پێدڵگیر بوو. گوتی:
- چاوڕووی هەبوو ببێتە جاش و گۆردەی داگیرکەران و کۆڵان بەکۆڵان و ماڵ بەماڵ وەک چاو ئێشە بگەڕێت و خەڵکی هەژاری شارەکەی تووشی بێناموسی جاش شەعبی بکات و پارە لەسەر جادان لەبەرکی خەڵکی بازاڕ دەربهێنێت و بەزۆریش لەنێو خانووی دوژمنی بەعس دانیشێت، چاوەڕووی نییە پێ بنێتە ماڵی ئێمە.
زمانی بەستراو پاشدان بەڕامانی بەرخۆیەوە تۆزێک خۆی بوارد.
- مادام بەخۆی نەهاتووەو ماوەی دوو ساڵ لەناو خانووەکەمان بووەو هەر مانگێ بە((٥٠٠)) پێنج سەت دینار حسێب دەکەم. دەکات ((١٢)) دوازدە هەزار دینار.((١١)) دیناریشی لەلای قەسری شیمال لەبەرکی ڕەحمەتی دەرهێناوە.
سێیەم: کەتنیشی بە زۆر بۆ جاشاتی بردبوو.
ئەنوەرە جاش تازە لەگەڵ زرار باوەشیان بۆ یەکێک لەحیزبەکانی بەرە گرتبووەوەو گیان بەگیان یەکتریان خۆشدەویست. بۆیە حەزی وایدەخواست باری تاوانەکانی سووک بکات. پاش تاندانە بەرخۆیەوە گوتی:

- دایکی زانا ئەوەی دەفەرموویت ڕاستن و غیلافیان تێدا نییەو حەقی خۆشتانە. بەس ئەدی خاتری من کە لەوێڕا هاتوومە!.
هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:
- خاتری جەنابت لەسەر چاوان تۆ چاکەیەکی یەکجار گەورەو مەردانەت لە سەرمان هەیەو هەتا هەتایێ لەیادی ناکەین و ڕێزت لەناخی دڵماندا تۆزێک لەوێر.. وەی ڕێزی لاکەی سەگە بۆرەیە.
بەزەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە:
- دیارە هێشتا لەبیرت ماوە.
بەچاوبڕینە چاوی و:
- هی. لەبیرچوونێیە هۆ باب.
بێ مرتە بەچاوی مۆنەوە سەری بەخۆیدا شۆڕکردەوە.
گورجی یەکجار. زۆری خاتر دەگرت و:
- ئەوا لەبەر خاتری جەنابت لەبردنەکەی بۆ جاش شەعبی خۆشبووین.
بەمە گوراح خۆشی پەڕییە دەم و چاوی و زانی قەدری دەگرێت، کەئاواتی بوو زاری بووەوەو:
- ماڵت ئاوا بێت، بەڵان بە ئەوەندەی گوتت ڕازی نابم.
دوای مڕدامانەوە گوتی:
- دوو هەزار دیناریش بەقوربانی پێڵاوەکانی جەنابت بێت.
زۆر پێ کەیفدار بوو..و بەئەوەندەش نەوەستاو:
- هێشتا ماوێتی.
سەری کەمێک بەخۆدا شۆڕکردەوەو:
- کاک ئەنوەر غەدرمان لێمەکە.
یەخەی بەرنەدا هەتا پێی سەلماند بڵێیت:

- ئەگەر بەخۆی بێت و لەبەر ڕدێنی جەنابت دوو هەزاری دیکەش فت.
بەسێرە گرتن لەدورچاوی و ماوەی نەداو:
- دەمینێتەوە ((٨ )) هەشت هەزار و ((١١ )) یازدە دینار.
عەنتیکەی بە ((١١ )) یازدە دینارەکە هات، کەچی نەیویست چیتر لەم بارەیەوە بیدوێنێت و بەدەست لەسنگ و چەمانەوە گوتی:
- زۆر سوپاس دایکی زانا. زۆر سوپاس.
- بەس دەبێ لەبەراییدا ((١١)) یازدە دینارەکە بژمێریت.....
دەنگی کەمێک بەرزتر کردو گوتی:
- خۆ لەمەرامم حاڵیبوویت؟.
ئەوسا لەبن و بۆتکەوەی گەیشت و گوتی:
- سەرچاو.
سام و هەیبەتی بنەماڵەکەیان لەنێو دەروونی خەڵکی دەڤەرەکەوە وایکرد هەر ئەو ڕۆژە داواکانی جێبەجێ بکرێت.

* * *

ئاشقەو ماشقانەی هاوچەرخ و دڵ و دەروون یەکی وا هێز نییە لەدنیادا لێکیاندا بڕێنێت. دەست لەنێو دەست و بەوپەڕی خولق خۆشی و سەربەستی و بێباک لەداب و نەریتی کۆمەڵایەتی سەردەم و خەڵکی شارەکە، شەقامە سەرەکییەکانی ناوەڕاستی بازاڕ نەما، بەناوی پیاسەوە جارێک و دووان ئەم سەرو ئەوسەری نەپێون. وا بەڕووی یەکتردا دەتریقانەوە زۆرجار دەبووە جلەوکێشی خەڵکەکەی ئەمبەرو ئەوبەری جادەوە.
متووانی مزگەوتان تف و نەفرەتیان بەهەڵچوونەوە حەواڵە دەکردن و:

- تف و نەفرەت لەخۆتان و کەس و کارتان!.
- دەگ ڕووی ئەو دایک و باوکە ڕەشبێت وەکی ئێوەی ئاوا. بەڕەڵلا کردوونە!
- شارەکەمان بووەتە قاحپەخانە.
- کەلکی موسلمانانی نەماوە.
- ڕۆژێک دادێت لەسەر بێدینی و بێ ئەخلاقی ئاوا خوا غەزەبمان لێبگرێت و نغرۆمان بکات.
مام ناوەندییەکان:
- بابە یەکترتان خۆشدەوێت بووێت بەس نەگ بەونەوعە بەڕەڵلایی یە.
- بەملی شکاوتان چ زۆرە پەناو پەسارگە زۆرە.
- کوڕە ئەوان دڵداری خۆیان دەکەن ئێمە بۆ پێ قرس ببین.
مەیل خوازەکان:
- خۆزگەمان بەخۆتان!.
- سەت ئافەرین لە دایک و باوکتان کەجلەوی سەربەستی ڕاستەقینەیان پێداون.
- بەڕاستی خۆشەویستی ئاوا دەبێت!.
- ئەوەیە بەهەشتی ژیان.
- یاخوا هەر ئاوا. بە خۆشی و کامەرانی ژیان بەسەر بەرن و تەگەرە نەیەتە سەر..ڕێگەتان.
تەنیا لەبالآدا ئاوکووف بوون. ئەگەرنا لەزۆر شتان لەیەکتر هاوێر دەکران. یەکیان باریک و شلک و کەمێک کەڵەگەت. ئەویتر کورتەڵە و تێکچەقی و توندوتۆڵ و چوارشانە. تەمەنیش چەند ساڵێک. ئەویان تازە پێی نابووە «١٧» ساڵ و بەرزی مەمانی لەمێژ نەبوو، بوو

بووە قوچەکی چاوتێبڕان. چاوکاڵێکی وا لەدوورەوە حەزی حەزدارانی بەسەما دەخست. نەخاسمە لەرە لەری سمتە خڕو بەرزەکانی، لەژێر تەندوورە. ڕەشە سادە تەنگەکەی لەڕۆیشتندا کاتێک قژە درێژو سوور خونیەکەی باوەشینەی دەکردو هەرزەکارانی دەخستە دنیای حەپەسان و فیت و هۆڕەوە.

لووت خنجیلانەی قینجکە تەرۆزی بەپتێک دەپەڕی. دەم بچووکی وا پاروو گچکە نەبێت پێوە ناچێت. خوێن چەندی بڵێیت شیرین. تەنکە سووراوو سپیاوەکەی لێ بووبووە نەخش و هەر زینەت بوو سێرەی لێ بگرێت. جوانی لەگەڕەک و دەوروبەر پەنگی خواردبووە وە هەرکە دەگوترا:

- ئاڤانی کەریمە کۆر دەبڕاوە.

- ئاڤان گیان منت خۆشدەوێت؟.

بەڕوویەکی گەش و عوبابەوە گوتی:

- کاری خۆشەویستنە زانا گیان.

مچوڕکەی ئەوینی لەنێو دەمارەکانی جەستەیدا مێروولەی کردو ڕەنگی سوور سوور هەڵگەڕاو:

- لە کەینێوە؟.

زەردەخەنە دەم و چاوی داگرت و:

- ئەو ڕۆژەی وەکی لە حەپسێ بەربوویت و من لەگەڵ دایکم دوو جار هاتین. بەدیتنت زۆر سەرسام بووم و دڵم حەزی لێبوو زوو زوو بتبینم.

- ئەدی وەکی باوکت وەسیەتەکەی کرد؟

بە گرنژییەوە:

- لەخۆشییان سەرم گەیشتە کەشکەلانی حەواوەو و شوورەیی

نەبووایــە هەرئــەودەم تلیلیلییەکــی حێلــم تێهەڵدەکــرد.

پــەردەی شــەرم لەهەڵسـوکەوت و گفتوگـۆی ڕۆژانــەدا چ لــەدەرەوەو چ لەماڵــە باوکیانــەوە هەڵگیرابــوو. دڵیــان وا بەیەکتـردا بــوو تەنیــا شــەوان بۆ نووستن ئەگەرنا لەیەکتر دانەدەبڕان. هـەر نیوەۆڕیـەک نـان لەماڵـی یەکێکیــان دەخــورا. لەتانــەو تەشــەرەی ئەمــلاو ئــەولا بــێ منــەت بــوون. ئەمــەش دەگەڕێتــەوە بـۆ:

گورجـی تـازە لای کەریمـە کـۆری نەخـۆش گەڕابــووەوە زانــا هەرکـە هەواڵـی پرســی و:

- ئەمڕۆ کوو بوو؟.

بەخەمبارییەوە:

- حاڵی زۆر شڕەو خوا ڕەحمی پێ بکات.

زۆری لە دڵ گران بوو.

- بەس گەلێکی مەراقە پێش مردن تۆ ببینێت.

لەکاتی خۆ ئامادەکردندا دایکی گوتی:

- منیش بۆیە زۆر دانەنیشتم وبۆ ئەو خەبەرە گەڕامەوە.

- وایـدا بــەر مەزەنـدە ڕەنگــە وەسـیەتی باوکـی لابێت. تەنگەتـاو خـۆی گەیانـدێ و پـاش ماچکردنـی دەسـتی و یەکســەر گوتــی:

- قیتم کەنەوە.

ژن و کەس وکاری پیلیان گرت و دایاننیشاند.

پشــوو زیاتــر ســوار بــوو..و دەمێــک وەســتا هەتــا پشــووی گــەڕاوە دۆخــی پێشــترو گوتــی:

- زانا، ئاقان وەرنە لام.

دەستی هەردووکیانی بۆ یەکەمجار بە یەک گەیاندن و گوتی:

- مـن هێشـتا زەینـم تـەواو لەسـەرخۆیە، ئێـوە هەمووتـان شـایەد بـن

ئـەوا ئاڤانـی کیـژی خـۆم پێشـکەش بەزانـای حەمەڕەحیـم کـرد.
زانا دووبـارە بەسـۆزەوە پەلامـاری مـاچ کردنـی دەسـتی داوە، ئاڤانیش ڕەنگە سـپیەکەی پەڕی و سـووریی تەریقی شـوێنی پڕ کـردەوە.
ماوەیەک پشووسواری وەستاندی و بەجرەجرو پچڕپچڕەوە گوتی:
- بەشـەرتێک، نەبـادا دوارۆژ کـوڕە بەکچـە ڕازی نەبێـت، یاخـۆ بەعەکسـەوە ئۆباڵـە کـە لەملـە مـن بشـەتێت ڕێمـداون و دەبێت ئێوەش هەمووتـان، پـاش تازییـە ڕەوینـەوەم ئیزنیـان بـدەن نزیکـەی مانگێـک، بـۆ ئـەوەی سـوخەتی یەکتـر شـارەزابن، بەکەیـف و ماشـای خۆیـان بەیەکەوە بگەڕێـن، ئەگـەر دڵیـان یەکتـری گـرت ئەوجـا مـارە بکرێـت.
هەر ئەو ڕۆژە ئەمری خوای بەجێ گەیاند.
- بـەس ئاڤـان گیـان بەخـۆت دەزانیـت مـن ڕێگـەی هـات و نەهاتێکـی دووروودرێژم لەبـەرەو دەبێت تۆ ڕەچاوی بکەیت و پەلەت لەگواسـتنەوە نەبێت.
- دەزانـم زانـا گیـان باوکیشـم کەشـانازی پێـوە دەکـردن و هەمـوو جـارێ پـاش نەمانـی باوکـت دەیگـوت:
- زۆرم پێخۆشـەو پـێ سـەربڵند دەبـم ئەگـەر لەگەڵ بنەماڵـەی ڕووتـان تێکـەڵ ببیـن.
- لەبەرئـەوە کـوڕی نەبوو..پێشـتر کچتـان بخوازێت. چـاوەڕووان بـوو هەتـا مـن پێگەیشـتم کەئاخیـر کچـی بـووم لەماڵـەوە. ئەوەشـی هـەر لەبـەر ئەوەبـوو ئێوە توخمێکی چاونەتـرس و جەسـوورن. ئەوجـا مـن ئەمرۆ لەجیاتی ببمـە پاڵپشـتت، هەتـا بتوانیـت لەسـەر. ڕێگـەو شـوون و ڕەوشـتی بـاب و باپیرانـت بڕۆیـت قاتـی دژیشـت ناوەسـتم.

* * *

- «خەڵکی بەشەرەفی کوردستانی خۆڕاگر بەگشتی و شاری هەولێر تایبەت ڕژێمی بەعسی دکتاتۆر کە بەخۆتان شارەزای سوخەتە قەڵپەکانینەو خاوەن ڕابردوویێکی ڕەش و تەژی کاری خراپ و نامرۆیاتییەو هیچ تاوان و ستەمێک نەماوە دەرحەق ئێوەی خۆشەویست و نیشتمانە ئازیزەکەمان ئەنجام نەدابێت. ئەمڕۆش وا چاوی بەکوردستانی ئازاد کراو..و سەربەخۆ هەڵنایەت و تەقەلایەتی ئەم ئەزموونە دیموکراتییەی بۆمان ڕەخساوە لە کیس بچێت و بۆیە بیست و چوار سەعات خەریکی پیلان و دەسیسەو تیرۆر کردن و ئاژاوە نانەوەیە.

دوێنێ شەو بەداخەوە دەستی چەپەڵ و دڕندایەتی گەیشتە گیانی پاکی شۆڕەسوارێکی مەیدانی کوردایەتی و خەبات و فەرماندەیەکی چاونەترس و پێشمەرگەیەکی دێرینی کوردستان کاکە «شوان حەسەن»ی قارەمان کە دارو بەردو چیاو دەشت و دۆڵی کوردستان نەماوە ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا نەکردبێت. بۆیە داوا لەگەورەو بچووکتان دەکەین لەمەودوا هەرچاوێکتان بکەن بەچوار چاوو دەرفەت هەرگیز نەدەن دوژمن بەهیچ تەرزێک زەفەرتان ئاوا پێ ببات و پێویستە بەهەموو هێزو تواناتانەوە ئاڵای مافی چارەنووسی کوردو کوردستان بپارێزین و نابێت کەمتەرخەمیتان بۆ سونەتیش لەم ڕووەوە ئاوقا ببێت.

بەدەنگی زۆر بەرزترەوە گوتی:

- هەزار سەلاو لەگیانی پاکی شەهیدی نەمر کاکە شوانی تێکۆشەرو خەباتگێڕی کوردستان.

هەرکە گورجی بەیانەکەی لەڕادیۆ بەرگوێ کەوت لەخۆشییان دەلحاز پڕ بە زار هەلهەلەیەکی«

- ئو. ئو. ئو. ئو..ی» درێژیی بووکانەی وای هەڵدا زۆر لەدوورەوە دەبیسترا. ئەوجا سوسکەیی هەڵپەڕی و لایوابوو هەتا ئەو ساتە لەخۆشی و سەرفرازی بەملاوە لەژیاندا چیدیکەی بەرەنگار نەبووە. مەزەندەشی لەزانا بەدەر بۆ کەسی تر نەدەچوو. دڵی کەوتە قرت و فرتی «ناسراوە» نە «ناسراوە؟». کەچی لەبەر منداڵەکان بەسەرخۆی نەهێنا.

نەبەزو سۆزانیش لەمرازی حاڵیبوون و بەشداریان بە سۆزەوە کرد.

کاتێک هاتەوە یادی:

زانا شەو کەم و زۆر نقەی لەم ڕووەوە لەبەرەوە نەهاتووەو بەیانیش بێ نانێ خواردن چووە دەرەوە. گریمان ئەو بووایە مرتەیەکی هەر لێوە دەهات، یان هەر نا خەندەیەکی بەڕوویەوە دەبینرا.

هەرکە پێی لەسەر عەتەبەی دەرگای حەوشە سەنگرایەوە لەچڕوچاوی دڕدۆنگییەوە دڵنیا بوو دەستی ئەوی تێدا نییە. دەلحاز تەپەسوڕی خۆشییەکەی وەلاناو بەڕووێکی مچومۆڕو زارێکی ساردەوە گوتی:

- پێمناڵێیت کێ دەستی خۆی بەتۆپاندنی ئەو تاوانبارە کەسک و پیرۆز کردووە!؟.

بە کزییەوە هەر ئەوەتە بەرگوێی کەوت:

- گۆران و لوقمان.

لەقاران دوای واژیبوونەوەی ڕاستییەکە چاوی سووڕ هەڵگەڕاو توانای وەستانی بەپاوە نەماو قووناو قوون تەپ کەوت و دەستەکانی بەمەلوولییەوە لەکەشکە ئەژنۆکانی وەراندو نێوچەوانی خستە سەر.

زانا حسیا مردەی چییەو بەدەست لەمل و ماچکردنی و گوتی:

- دایە گیان بڕوا بکەن ئەوەی بۆ ئەوان هەڵکەوتبوو، بۆ من قەت هەڵنەدەکەوت.

بەتەوسێکی غەزەباییەوە گوتی:
- بەڵێ ڕاست دەکەیت. کاری مەردانەی ئاوا چۆن بۆ حەزحەزۆک پەرستان هەڵدەکەوێت.
لەمەرامی گەیشت و خۆی گورگە هەڵنەخست و گوتی:
- دایە چاوەکەم تۆ لەبنەوانی واریقاتەکە حاڵی ببە ئەوجا هەرچی دەڵێیت سەرچاوان.
ما بەدڵ ڕەنجاوییەوە هەستی بۆ ڕاگرێت.
- بەهۆی خزمێکی لوقمانەوە گۆران و لوقمان خۆیان پاش ئەوە لەمێشکی شوان سەقا دەدەن ئینتمایان بۆ حیزب لەبەر خاتری چاوی ئەوە، گەلێک ڕەپێش دەکەن. زۆر نابات دۆستایەتیان دەگاتە پۆپەی بەرزییەوەو بڕوای لەناخەوە پێدێنن لەهەموو ڕوویێکەوە دەلسۆزینە. بەو فێڵە دوێنێ شەو کەسنەزان، بەناو بیبەنە ماڵێک ژنەکەی زۆر جوان و منداڵەو لەمێژ نییە شووی کردووەو بڕی بەمێردەکەی دانەکەوتووەو تایبەت بۆ ئەویان هەڵفریواندووە.
خەفەت هەڵوێستەی پێکردو گوتی:
- لە ڕێگادا بەچەقۆ پارچە پارچەی دەکەن و لە چۆلەوانی فرێیدەدەن.
بەدەنگێکی بەرزو دەغەزاوییەوە گوتی:
- دەستیان خۆش وکوڕی باوکی خۆیانن. ئـ هـ وا دیاریشە زۆر عاقڵن و زانیویانە ئەوانە بەدووشت دەگیرێن «پارە و........)).
بە مووڕییەوە سەری تووڕەیی لێباداو گەڕاوە سەردوانەکەو گوتی:
- ئـ هـ دنیا سەیروسەمەرەیە!.
هەتا لەسەر پشت کەوت حریتاندی و زانای بەجارێک حەپەساند و:
- ئەوانە وا لێرە بەژنەکانمان فێربوونەو بەکەیف و ماشای گەڵ و گوانیان بەناوکەوتوونە. کەچی ژنەکانی خۆشیان وا: ((........، ........)) یان

لێخۆشڕا هاتووەو تیکە بەتیکەش بکرێن نایەنەوە ناو ئەو ئەزموونە دیموکراتییەی پیاوەکانیان لەکوردستان بانگەشەی بۆ دەکەن».
بۆ ئەوەی غەللەی دڵی بپەڕێت بە ئاخەوە گوتی:
- نارەزایی خۆشم دەربڕی: قەت عەیبتان نەکردو شەرمتان بەخۆ نەبوو بەبێ من ئەنجامتان داوە!
- کاکە لەمێشکت بچەقێت ئەگەر جەنابت لەگەڵ بووایە ئاشکرا دەبووین. خەڵک و خوا دەتانناسن و لێشتان لەهەنجەتن بێدان پێدانانیش دەیانکوشتیت. ئەگەرنا باوەڕ بکە لەشەکرمان پێ خۆشتربوو. بگرە شانازیشمان پێدەکردیت.
لەگەڵ هەستانەوەیەکی بەکەف و کولەوە گوتی:
- لەسایەی جەنابتەوە ئەوە یەکەم قەسابی بنەماڵەکەمانە بێ ئەوەی زبری ئێمەی لەژیاندا پێ بکەوێت، ماڵئاوایی بکات.
ناچار بێ خوایشتی حەزیەوە خۆی بوارد. بە قارەوە گوتی:
- ئەوا دوا جارت پێڕادەگەیەنم: بەحەقی خوا ئەو ژنە ناگۆزرێتەوە هەتا یەکێک لەئەوانەی ماون نەتۆپێنێت. ئەوجا خۆ چاک لێم حاڵیبوویت.
ڕێ پێوان و خۆپیشاندانێکی گەورەو بەگوڕو جۆشەوە لەهەر چوار ئالیی شارەوە سازدرا. بەرەو حیزبە بچووکەکانی کوردستان لەگەڵ ڕێکخراوە مەدەنییە کلکدارەکان، بەو پەڕی سۆزەوە بەشداریان کردو لەبەردەم پارێزگاوە یەکتریان گرت. دەرزیت هەڵبدا بووایە بەزەوی نەدەکەوت.
درووشمی پرشنگدارو سەرنج کێش لەحەواوە دەجمجمان.
- هەزارو یەک سڵاو لەگیانی پاکی شەهیدی نەمر کاکە شوان.
- ئێمە هەردەم بازووی شەهیدین و دەسبەرداری ڕێبازە پیرۆزەکەی

هەتا تۆڵەی دەقات نەستێنینەوە نابین.
- هەزارو یەک نەفرەت لەخوێنرێژو تیرۆریستان.
- بڕووخێ ڕژێمی بەعسی بۆگەن.
- بڕووخێ دکتاتۆری داگیرکەری کوردستان.
«ئـ هـ یەکێک شارەزا نەبێت وا دەداتە قەڵەم دوژمنی هەرە گەورەیان بەعسی داگیرکەرەو شوانەش ڕابەرو ڕزگارکەری گەل ونیشتمانە»..
- پێویستە بەزووترین کات دەستی تیرۆریستان ببڕدرێت.
- بژی هێزی ئازادی و دیموکراتییەت. بمرێ تیرۆریستان.
- ئامادەین گیانی خۆمان لەپێناوی تۆڵەی شەهیدی نەمرو سەرجەم شەهیدانی کوردستان پێشکەش بکەین.
لابەلا ئاوقای یەکتر بوون و لوقمان بە شاگەشکەیی یەوە بەپیرییەوە چوو. و:
- چۆنت عەقڵ ئەو مەسیرەیە دەگرێت؟.
- بڵێم چی؟.
گۆران نەیهێشت زانا تەواوی بکات بەزەردەخەنەوە گوتی:
- وا دیارە شەهیدەکانی پێشتریشیان هەر ئاوا مەزن و پایەبەرز بووە.
- کورە بەڕای من ئەوەیان شەریفەکەیان بوو.
- خۆ لەگینیشە.
- لەگینەی ناوێت لەکونی کارک ڕاستترە.
- کورە ڕکم مەکەنەوە ئەگەر بەئاستەم شەریفیان تێدابووایە وڵاتی باب و باپیرانی خۆیان نەدەڕووتاندەوەو هەتا ئەمڕۆی حازریش حەتۆتەیەکی چاکەیان لەگەردەنی میللەتە چەوساوەکەی خۆیان دەخست.

* * *

هەڵمـەت شـەو..و ڕۆژ بیـری لەمشـوور خواردنـی تۆڵەسـەندنەوە دانەدەبڕاو هەرچەنـد سـەری دەهێنـاو دەبـرد نەیدەزانـی چ ڕێگایـەک، پیلانێکـی لەبـار بـۆ . دەسـت وەشـاندن بدۆزێتـەوە. هـەر هەوڵێکـی دەدا چەکدارانـی بەحـەزەری دەوروبـەری شـێخ سـەدرە لێی هەڵدەوەشـاندەوە.
ڕۆژێـک بەهەڵەداوانـەوە لـە زانـا بـەژوور کـەوت و گوتـی:
- ماڵـە ((........)) یـەک جیرانـی ماڵـی پلکمـەو دەشـەو یاخـۆ دوو هەفتـە جارێک شـێخی چەمـەری بەتەنیا بۆ ڕابواردن دەچێت و سـۆپەرێک و دوو سـێ پێشـمەرگە........
قسەی زۆر پێ بڕی و گوتی:
- عەفـوەن، بڵـێ دوو سـێ گـۆردەی مـل پـان و خزمەتچـی. پێشـمەرگە قـەت نابێتـە گـەوادی بـەر دەرگای ماڵـە ((........))!
قسەکەی لەدڵ چەقی و بە شەوقەوە گوتی:
- سـۆپەرێک و دوو سـێ گـۆردە لەبـەر دەرگای حەوشـەی ماڵەکـە، هەتـا جەنابـی شـێخ لێدەبێتـەوە دەوەسـتن.
بەخۆشـترین مزگێنـی خەملانـدو لەکەیفـان هەناسـەی سـوار بـوو..و تاکـو دەمێـک زاری بـۆ نەپچـڕا.
هەتـا دڵـی لەدەسـت کەوتنـی سـەرە پەتێـک لـەم ڕووەوە ئـاو بخواتـەوە.
بەڕووێکی بافرەدارەوە گوتـی:
- پلکەکەت خوشکی باوکتە، یان دایکت؟.
لەمەرامی حاڵیبوو. هەرکە گوتی:
- خوشـکی باوکمە»خەنـی خۆشـی پتـر دایگـرت و هـەردوو دەسـتی لەمـل وەرانـدو بـە سـۆزو گـوڕی حـەزەوە ئەمـلاو ئـەولای چەنـد جـار مـاچ کـردو گوتـی:
- مادام خوشکی باوکتە جێگەی متمانەیە.

- مـام حەمیـدی مێـردی شـەوێک لەتـاو دیتنـی سـۆپەرەکە لەبێدەسـەڵاتییەوە پێکابـە تویتەکـەی لەبردنـە حەوشـە تـەق لـەدەرگا دەدات و لایەکی کـەل و کلـۆم دەبێت. لـەو شـەوە هەرجارێک بزانێت شـەو سـۆپەرەکەدێت ڕوو لەمـاڵ ناکاتـەوە.

- حەقیێتـی: داب و نەریـت و ڕەوشـتی ئەمـڕۆی کـوردەواری ڕێنـادات چـاو لەشـتی ئـاوا، کـە پێیدەگوترێـت: «گـەوادی» بپۆشـێت.

ئەمەی گوت و دەست لەنێو دەست بۆ ماڵی پووری هەیپەیان لێکرد.

هەڵمـەت بـەدزی وەبـەر گوێـی پـووری، ئافرەتێکـی گەنـم ڕەنـگ و کەلـەش گـەورەو تێکچەقـی و بەجەسـارەت هەڵـدا:

- لەگەڵ ئـەو کـوڕە سـوێندمان خـواردووە، هەتـا شـێخ لەژیانـدا مابێت ژن نەهێنین.

لەگەڵ ڕوانینی بۆ زاناو گوتی:

- ئەوجا ئەو کوڕە چ عەداوەتی لەگەڵ شێخ هەیە؟.

- چوار پێنج کەسی بە فیتی ئەو بەر ئەنفال کەوتوونە.

پـاش دیقەتدانێکـی کڕیارانـەی سەروسـەکوتی و..وای بـۆ چـوو چـی لەبـار دانییـە، لەبـەر گوێـی چرپانـدو:«

- ئەوجا ئەو قولە مەیتەرەو ئەو غیرەتەیان گوتووە!؟«.

بەڕوویدا تریقاوەو ئەویش کەوتە دەریای حەیرمانەوەو گوتی:

- ڕۆڵە بە چ پێدەکەنیت!؟.

- ئەوە لەنەوەی عەولا ڕووتەی کەندیناوەیە.

دەمی حەپەسانی پێ بەشبووەوەو چاوی عاجباتی پێهاتن زەق.

- ئەوەشیانە کەدوژمنی خۆیانی لەدوڕ حەپسخانە کوشت.

دەمێـک بەچـاوی شـانازییەوە بـۆ سـەرتاپای جەسـتەی ڕووانـی و بەبزەیکـەوە گوتـی:«

- ڕۆڵە هەر لەهەوەڵەوە قسەم بڕا».
پاش ئەمێک وەستان گوتی:
- بزانە بەهەر فرت و فێڵێک بێت کلیلی بەیتوونەو دەرگای پشتەوەی ماڵیان وەدەست ناهێنێت.
- ئەوە زۆر ئاسانە هەفتە نییە بەسەفەر نەچن و نەبادا میوانیان بێت کلیلەکانیان نەهێننە لای من.
ئەمە کەیفداری کردو بەزەردەخەنەوە گوتی:
- کەواتە ئەگەر ئەوجارە هێنایان هەر زوو بۆ منیان بێنە هەتا کلیلی تریان لەسەر دروست بکەم.
بەبزەیەکی را لەخۆ..وە گوتی:
- پێویست بەهێنانە لای تۆ ناکات و پلکی خۆت جێبەجێی دەکات.
بە گوراح خۆشییەوە گوتی:
- باشتریش.

* * *

وێڕای تاریکە شەوی هەورێکی ڕەش و تیر ئاسمانی داپۆشتبوو.. وفزەی لە ڕووناکی ئەستێرانی بڕیبوو، چاو چاوی سەح نەدەکردو شەوی دزان بوو.
هەرکە ئێوارەدا دەهات زانا لەماڵ دەرنەدەچوو..وچەشنی لەسەر ئاو..و ئاگر بێت و ئۆقرەی لێهەڵدەگیراو لەبیرو دالغەی لێدان و ڕابیتە کردن و هەستان و دانیشتندا هەتا کازیبەی بەیان وەنەوزی نەدەداو بۆ بەیانی زوو خۆی دەگەیاندە هەڵمەت و بەدڵساردی یاغر یاغر دەگەڕاوە.
ئەم شەوە سەر لەئێوارە هەرکە لەدەرگایان درا دڵی یەکسەر خەبەریدا و بە پەلەو شەوقەوە بەپیریەوە چوو. گورجی بەوپەڕی

ڕێـزو حورمەتـەوە پێشـوازی کـردو گوتـی:
- دنیا هـەورەو دەمی گورگ چـەورە. با بزانین شێر دەردەچن یاخۆ ڕێوی. دەبـڕۆن خوای گەورە چەپالەتـان بدات.
بەهەنـدی بـاش بـوو لەسـایەی حوکمـە دادپـەروەرو دەسـت پاکەکـەی سـەر زلەکانی بـەرەدا گلۆپێک بەعامـوودی شـەقامەکانی ئـەو گەڕەکـەی نیازیـان بـوو نەمابـوو. بـۆ بەسـەرداددانی شـەوان لەبـار بـوو. بەرپـێ نەدەدیـترا. مەگـەر ڕووناکـی گلۆپـی حەوشـەکان. ئەویـش لەدەسـەڵاتی دزانـی پـەروەردەی بـەرە دانەبـوو.
مـام حەمیـد سـەر لەئێـوارە لەبۆنـی تکـەو گۆشـتی بـرژاوی دراوسێیەکەیان حسیا دنیا چ باسەو شـەو جـاران ئاسـا ڕووی لەمـاڵ نەکـردەوە.
پوور هەیبەت بەئەنقەست دەرگای حەوشەی دانەخستبوو.
- هەڵمـەت نەبـادا ئافرەتەکـە لەهاتوچـۆی ماڵـە پلکـت تـۆی دیبێـت و شـێوەت بـکات پێوسـتە ببێتـە پـاش دز.
بە بزەیەکی ڕەزامەندییەوە گوتی:
- بۆچوونەکەتم عەقڵ دەگرێت.
پاش مشتوورخواردنێکی چەند سانییە گوتی:
- کاکە مـن خـۆم تەنیا بەئەوەنـدە بەمـەزن و سـەرفراز لەقەڵـەم دەدەم و هەتـا هەتایەش لەیادم ناسـوێت کـەوا لەگـەڵ جەنابت بۆ لەناوبردنـی دوژمنمـان هاوپەیمانـم و بـەس. ئەوجـا هەرچـی دەفەرموویـت ملـم لەمووێـک باریکـترە.
هێشتا وەختـی سۆپەرەکە نەهاتبوو، بەسپایی خزینە نێو ئـەو ناندێنە بچووکـە دەرگا واڵایـەی پشـتەوەی حەوشـە. پلکـە هەیبـەت دەسـت نیشـانی کردبـوو..و گلۆپەکانـی پشتەوەشـی دانەگیرسـاندبوو.

شەو بەرەو ڕاشکان دەچوو..و تازە دەهات بپرووشێنێت. وەک سروشتیش پاڵپشتیان بێت لەبەر چرپە چرپی باران خشەی لابەلا تێدەچوو.
ماڵەکە کردبوویانە خوو، شەوی کەیف و سەفا هەتا شێخ لەگەڵ ئاسیای کورتەڵەو تیکچەقی و گۆشتن وسوورو سپی و تەمەن «٣٠» سی ساڵ بەکەیف و ماشای حەزی خۆیان بەڕووتی و ئاشقەو ماشقانە ڕابیوێرن چۆل دەکرا. لە بەراییدا مێز بەبیرەو ویسکی و تکەی گۆشت بەرخ و سینگە مریشک و خاس و سێوو پرتەقال و چەرەزات لەسەر حسێبی گومرگی خوێنی میللەت ڕازابووەوە.
لەو قاتی و قڕی و نەهاتی و حەسارە بێ بەزەیی یەدا کەوا خۆراکی هەرە زۆری خەڵکی گەڕەکەکە، لەشلە ساواری کەم بۆ..و نانی مزاش تێپەڕ نەدەبوو، زۆربەیان مانگێک زیاتر دەمیان بەگۆشت و برنجی نەکەوتبوو.
دەنگی پێوەدانەوەی دەرگای سۆپەرەکە هەستی هەردووکیانی قوڵاخ کردو ڕەنگ و هۆڕی خۆشی تۆڵە لەپەرەکەی دڵیانەوە بەگوڕتر دەبوو. مچوڕکەی شادی نزیک بوونەوەی بەدیهاتنی ئاواتە سرکەکەیان بەنێوشا ماسولکەکانی لەشیان مارەزیو ئاسا هێدی هێدی گوزەری دەکرد.
پوور هەیبەت خەو لەچاوانی هەڕمابوو..ولەسەر گازەرەی پشت لاتە عەردێکی گرتبوو..ودیدەی ترس و دڵەڕاوکێی بڕیبوونە، نەترە نەخشاوەکەی ساپیتەی ژوورەکەوە. لەدەروونەوە هەزارو یەک دوعای دەکردو لەخوا دەپاڕایەوە:«
- خوایە جوانەگایەک لەسەر من نەزر بێت کەسنەزان سەرکەون:»
- سەرکەو بنکەکانی لێکرا لارو پار کەوتبوون، نەیدەویست بەهیچ تەرزێک پێ بحسێین.

بێباک لەعەبدی بێ شەریک، هەر یەکەیان شەشاگری یەدەگ پڕ فیشەک لەبەر و دوانیش مینەک لەبەر پشت، بێ خشپە هاتنە دەرەوە. پرووشانەکە بووە بووە نمنمێکی چڕ. هەردووکیان بەیەکەوە بەدیواری پشتەوەی مەعبێن هەردوو حەوشە هەڵگەڕان.
هەڵمەت کلیلی دەرگای پشتەوە نایە نێو دەستی و. وەک پشیلە خۆی لەسەر دیوارەکە دانووساند.
ئەویش بێ چرپەو خشپە خشییە خوارەوە.
دەنگی گۆرانی موسەجیلەکەیان هەموو دەنگێکی تری ئەملاو ئەولای کپ کردبوو، وەک لەسەر هێلکان بڕوات چرپەی لێوە نەدەهات.
گورجی ئەوشەوە لەگەڵ منداڵەکان هەر سایەدی دەرگابوون و بیری لەنێوان باوەڕ هاتن و مژدەی خۆشی و بەرەواژییەوە خنگەملانێی بوو..وبە هاتوچۆ کردنی بەگوڕو ناولەپ لەیەکتر داناو:«
- لاحەولە وەلا قووەتە ئیللا بیللاهـ))ی دووپات دەکردەوەو هەریەکەیان بە مەزەندەی خۆی دابوویە، بەر نەزیرۆکان ناخاسمە منداڵەکان:
- دەبێ مامە زانا لەتوانای دابێت؟.
- دەبێ ئاشکرا نەبێت؟.
- لەو..وەختە بهات بووایەوە باش بوو.
- گورجی هەر زوو بەرپەرچی دانەوە و گوتی:
- ئێوە بەس سەلاوەتان لێ بدەن شاللا بێ ئەوەی ئاشکرا ببن سەردەکەون.
وەستانێکی کەمی بۆ کردو گوتی:
- بەس دووعا بکەن بۆی مەیسەر ببێت ئەوجا هەرچی دەبێت، با ببێت.

* * *

لەسۆزی دامرکانەوەی خروشتی گەل و گوانیان کلیلدانی دەرگایان لەیاد فڕیبوو. هەتا قاپی ژوورەکەشی کردەوە نەحسیان. عەشتەبایان لەبەردا نەبوو.
ئاسیا لەسەر کۆشی دانیشتبوو..و دەم لەنێو دەم و ئاوێزانێکی وا لایان وابوو حەوت ساڵە لەیەکتر دابڕاون و تازە بەیەکتر شاد بوونەتەوە.
زانا لەخۆشی بەمراز گەیشتنەکەی تەنیا هەستی بەپارچە گۆشتێکی سپی، کە پشتی ئافرەتەکە بوو کردو بەس.
لەگەڵ گوتنی:
- مەرحەبا شێخی پایەبەرزو کەرامەتدارمان.
ئەو کەچاوی پێکەوت دەمامکدراوێک دەمانچەی لەبان سەریانی ڕاگرتووە، هەتا دەنگی تێدابوو لەزووکەیداو دڵی دەلحاز بوورایەوەو پشتاو پشت تەپەی هات.
ئەمیش هەر لەسەر قەنەفە دوو نەفەرییەکە، لەدەقی خۆی بێ نقەو لاکە و بەڕەنگ پەڕین و دڵە مەلەرزەوە ماوە.
زانا ترسی ناسینی دواڕۆژی نەماو لەگەڵ دەمامک هەڵماڵیندا قەشمەریانە گوتی:
- بابە شێخ ئەوجا خۆ چاک دەمناسیت کێمە!؟. لەئاسمانان لێتدەگەڕام، کەچی سوپاس بۆ خوا وا لەعەردانم چنگ کەوتیت.
لەگەڵ درێژکردنی لوولەی دەمانچەکەی بۆی و گوتی:
- بگرە ئەوە لەتۆڵەی دە دوازدە هەزار کەسە ئەنفال کراوەکانی فکرییەن پێنەگەیشتوو..وبنەماڵەی ڕووتان و مام برایمی دەرپێ پڕ بەردکراویش، سەربار.
بەدەگێکی لەتەختی تەوێلی ئاگردا.

ئـەوان لەقسـان و دڵەڕاوكێـی خۆیانـدا بـوون لەنـكاو تەنگەتـاو لێـیان بـەژوور كـەوت.
هـەر لـەدوورەوە لەڕەنـگ و ڕووسـوور هەڵگـەڕاو..و بافرەدارییـەوە زانیـان مـەرام پێكراوە، لێكرا هەتـا ئارەقـەی شـین و مۆڕی شـەكەتیان بەلەشـدا شـۆڕابەی نەبەسـتا دەسـتبەداری شـایی و هەڵپەڕیـن نەبوون.
گورجی بەپشوو سوارییەوە ڕووی تێكردو گوتی:
- ئەو شەوە چ شەوە؟.
- دووشەممەیە.
- دەبێ دوو شەممەی دیكە بووك بگوازرێتەوە.
سـۆزان هەتـا ئەوسـاتە باراشـی بۆچوونـی لەئاشـێكی دیكـە لێدەكـرد. هەركە نـاوی شـێخی بەرگوێ كـەوت یەكسـەر لەشـوێنی خۆیدا وشـك هەڵگـەڕاو حەپەسـان بەسـەریدا زاڵ بوو..ولەشـروان زۆری نەبـرد لەپرمـەی گریانێكـی وایـدا كافـرو فەرمەسـۆنیش زگیـان پێیدەسـووتاو بەهیـچ كلووجێكـەوە كڕنەدەبـووەوە.
لەگریانەكـەی گەیشـتن و بـۆی كەوتنـە پەرۆشـەوە گورجـی هـەرزوو ئامێزی خۆشەویسـتی تێوەرانـدو نەختێك بەشـداری گریانەكـەی كـردو جـا بەسـۆزەوە كولمە سـپی و گوپنەكانی دوو سێ كـەڕەت مـاچ كـردن و گوتـی:
- ڕۆڵـە شـێخ بەپـا بـوو. بەهەمووداوێـك نەدەگیرا.كەچـی ئـەوەی تـۆ دەیڵێیت بێ پایەو زۆر ئاسـانەو نابێت هیـچ دڵ لـەدڵ بدەیت و مامۆژنت بمینێت خوێنـی ئـەو خائینـەش نەختـی گواسـتنەوەی تـۆ دەبێت.
پشـووێكی ئومێـدی هاتەوەبـەرو بـاوەڕی زۆر پێبوو..ولەخۆشـیان دەسـتی ئەوینـی لـە مـل وەرانـدو لەگـەڵ ملچـەی ماچێكی قاییمـی گۆنـا چرچەكانییـەوە گوتـی:

- بەقوربانی دەم و زارت بم.

نەک هەرچی لەبەر دڵ نەماو بگرە بزەی شادی پەڕییە لێوەسوورو تەنکەکانییەوە.

ئەو شایی و زەماوەندەی بۆ زانا گێڕدرا مێژووی بنەماڵەکەیان بەخۆیەوەی نەبینیبوو.

ئەحمەدە گولە لەئاهەنگ گێڕانی بنەماڵەی ڕووتانەوە حسیا لەخۆشی کوشتنی شێخ سەدرەیەوە و بەڵام چ بەڵگەی ڕوونی بەدەستەوە نەبوو، تاکو لەم باریەوە تاوانباریان بکات.

دوو ڕۆژ دوای کوژرانی شێخ هەر نەفەرەی کیلۆ گوشتێکی جواناگای مالی مام حەمیدیان بۆ هات.

* * *

- دایە جلەودارەکانمان قاندری شیراتۆنی بەغدایێ بوونە!.

بەزەردەخەنەیەکی تەڵخەوە گوتی:

- ڕۆڵە عاجباتیت نەمینێت ئەوانە ئەو ڕۆژەی دەستەندووی خەباتیان بە دەستەوە گرتووە، بۆ ئەوەی گیانیان سەلامەت بێت هۆگری شیراتۆنی بەغدا و تاران و ئەستەنبۆل بوونە.

بۆ ئەوەی جلەوکێشی هەستی بکات بەدەنگی قاییمترەوە گوتی:

- لەو ماوە دوورودرێژەی بەناوی خەبات و تێکۆشانیان هەتا ئەمڕۆی حازری، لەیەک لەو دەڤەرانە، نەڕوویان لێ دڕدۆنگ هەڵگەڕاوە، نەتەقەی بووکانەشیان بەسەردا هاوێشتراوە.

بۆچوونەکەی پەسەند کردو باری گفتی گۆڕی و گوتی:

- دایە من وای بۆ دەچم، داغمەدارەکان هەتا پاشەڕۆژ منەتمان لەسەر بکەن، کەوا شتێکیان لە دوژمن هەڵکڕاندووە، بەحوکمەزاتییە کارتۆنەکەش کە ڕەفز کراوە مەمنوون دەبن. ئەوجا دکتاۆر لەو بێ

شنگ و هێزییەی خۆیەوە تەڕەماشیشیان دەقەبەل ناکات.
هەوەستی بە بۆچوونەکەی هات و گوتی:
- ڕۆڵە عەرەب و عەجەم دەزانن، ئەوا نەبای چەندینە. ئاخر حەق بدرێتە کێ.
بەپێکەنینەوە گوتی:
- وەللا دەنا هەریەکەیان خۆی بەنێرەکەری کەلیاوە دەچووێنێت.
- قسە باجی لەسەر نییە و ئـ ە خوایان بە قوربانی ڕاپەڕینی میللەتەکەیان بکات. ئەگەرنا بەخەونی شەوانیش نەیاندەتوانی هەوای ئاسمانی نیشتمانە داگیرکراوەکەیان هەڵمژنەوە.
نەیدەویست لێی بگرتەوە گوتی:
- پاش ئەوەی دکتاتۆر بەهێلی «٣٦» سی و شەش لغاوکرا داغمەدارەکانیش بە دزین و تالآن و فڕانی بەرژەوەندی گشتی هەنگڕان و پارووپان کەوتە ڕۆنەوە، کە لەژیاندا ئاودالی ئەو ڕۆژە بوون و:«
- خوایە هەر لەو قایدەی ڕابگرێت و لێمان تێکنەدەیت».
ئاگایان لەگەورەترین شاری باب و باپیرانیان بڕاو ناوچە بەفەڕو نەفتاوییەکانی باشووری پایتەختیش کە لەژێر دەسەڵاتی حوکمەزاتییە کارتۆنەکەشدابوون هەر هیچ.
دەم لە دەم زیاتر گوێی قوڵاخ تر بۆ ڕادەگرت.
- ئەگەر بەئاستەم هەستی نیشتمانیان لەدەروونندا بەسەر ئەوینی گیرفانیاندا زاڵ بووایە، هەر بەڕاپەڕینی زۆرینەی میللەتەوە، ڕۆژێک، دووان دەیان بەردەوام ئەوانیش دەرباز دەبوون و کوردیش ئەوسا بەئاواتی خۆی دەگەیشت.
هەر ئەوسات پەشیمان بووەوە:

- بۆ من نەهاتووە بڵێم: بەخوا چابوو نەکەوتە بەردەستمان حەوجە بەبەڵگە ناکات بەرەی فەرهوودو جەردان، بێ چەندو چۆن شەریکەی نەوتیان لەسەدەی «بێخمە»یان خراتر لێدەکردو پارچە ئاسنێکیان نەدەهێشت و خڕیان بە تومەنێکی زۆر کەم بۆ ڕابەرەکانیان ئاوا دەکرد. ئەوسا جیهان سەرتاپا پێدەحەسیان و دەبووە لەکەیەکی ڕەشی دەمۆری نێچەوانی کوردەوەو ڕەواجی لەنێو میللەتان بەجارێک دادەبەزی.

* * *

- هەڵبژاردن لەڕوواڵەتدا دەستی پێکردو خەڵکەکەیان تەرزی خۆیان مەبەستیان بوو شەق کرد. کەچی لەژێرەوە تەماع هێشتا بەری چاویانی بەرنەدابوو..ومەرامیان پتر بهەنگرێن. بەرژەوەندیشیان لەبەرایی هەموو شتێک بەیەکەوە بەند بوو.

- گریمان یەکیان لە «٩٠٪»ی دەنگی بهێنابووایە بۆ خاتری بەڕکەوە حوکمیان هەر دابەش دەکرد.

چ حوکمێک؟. نەدی و بدی کوڕێکیان بوو کێروگونیا بڕی. تەرحی بەهێزی بازوویان کوردستان ڕزگاربوو بێت، کەسێک بیەوێت لەدەزگایەک بە «فەڕاش» دامەزرێت. دەبێ لەبەراییدا کڕنوشی «تەزکیە» بۆ یەک لە ڕەنگەکان بەرێت. فەرمانەکەش هەرگیز جێبەجێ نەدەکرا هەتا کەسێکی تر ئاوا بۆ هەمان نیاز کڕنووشی تەزکییە بۆ ڕەنگەکەی تر نەبات.

ئەڤانە هەردەم لەمێشکی گورجی قەلاقوچکەیان دەخواردەوەو بەپێکەنینێکی گاڵتەجاڕییەوە:

- خانووچکۆڵەی منداڵانە!.

گورجی هەر لەسەر دوانی ناخەوەی بەردەوام بوو:«

- ڕەنگەكان هەركە زانیان حكومەتێكی ڕاستەقینە دامەزراو واش بچێتە دوێ میللەت مسۆگەر ئاوێزانی ئاواتە توریندییەكەی دەبێت، بەیەكجاری دەسێتەوە». هەموو كەسیش بیری بۆ ئەملایە چوزەی دەرنەدەكرد.
بەرژەوەندی ئەوانیش لەشەڕو كێلەوەژەو و دوو بەرەیەكی و ئاژاوەدایە.
- هەتا ئەو ڕۆژەش بەتاڵان و دزین و فڕانی سامانی كوردستان و گومرگی خوێنی گەلەوە چەشنی دابەستووی جووان وا قەڵەو..و هەنگڕابووبوون مێژووی ژیانیان بەخۆیەوەی نەدیبوو. هەریەكەیان لەئەوانەی گوتران لە «٣٥٪» ی بەروبوومی نیشتمانی كەمافی قاسەی حكومەتەكەیان بوو خڕ دەچووە گیرفانە زل و بێ بنەكەیانەوە، تەنگەتاوگەڕانەوە سەر دۆڵەدانی سەرەتای بەچیاكەوتنیان.
بەپێكەنینێكی زۆرەوە:
- كەچی ئەم كەڕەتە شەڕە كورسی و گومرگ و دابەش كردنی كوردستانە.
لەناخەوە لەمە قەبز بوو:
- زۆر كەسانی گەوج و كەودەری و عەقڵ قوندە، لەم ڕووەوە بەم نەرزە شەكر دەشكێنن:
- شەڕی براكوژییە. ئـ.هـ ئەوانە لەنێوگۆڕیشدا تەریقەتی قادری و نەقشبەندیی دوژمنی باوەكوشتەی میللەتن. هەتا دنیاش دنیایە. لە كۆتكێك ئاوی برایەتی ڕاستەقینە ناخۆنەوە.
«ئـ هـ هەریەكەیان بەناوی حكومەتی گەلەوە لایەكی ئەوەندە نیشتمانەی لەژێر چنگیاندابوو كە ئاواتی خەباتیان وابوو:
- دابڕی و. واریداتی ڕووتانەوەی گەل و نیشتمان بە جیاجیا

دەچووە بەرک و سندان لەڕزگاربوونی شاری کەرکووک و ناوچە دابڕاوەکان بدات.
لەسەر دوانەکە بەردەوام بوو:
- ئەوانە نزیکەی «۳۳» سی و سێ دەوڵەتی جیهانی پاڵپشتیانن و شەرعییەتی حکومەتێکی تەواویان پێ بەخشیون ئەوجا لەپێناوی بەرژەوەندی بەرتەسکی خۆیان و هەڵوێستە جوایەزی و گیرفان پڕکردندا دایانە بەر شاپی ڕیسوایی و هیچەوە.
- لەسایەی خیانەتیان و میزی تاوانی «UN» ەوە نیشتمانی ئازیزەکەمان بووە بەچەند پارچەی ڕەشی بەدیۆمی تەختی ناوچەوانیان.«
- هەولێرو کەرکووک و مەخموور.
- هەولێرو سلێمانی و هەڵەبجە».
ئەگەرنا حکومەتێکی سەربەخۆ..و بێ کێشە و تەگەرە دامەزرابوو.. وبەشە دابڕاوەکانیش مسۆگەر ئەگەر ئەوان پێشڕەو نەبوونایە دەهاتنەوە ژێربار.

* * *

بەفیتی ئەحمەدە گولەوە بایزو سەیدە سۆرە، هەریەکەیان بۆ پاشەڕۆژ خۆی وە گەل ڕەنگێک داو دوای هەڵبژاردن بوون بەنوێنەری کوردو کوردستان.
«ئـ.هـ کێ کردی و کێ خواردی!. بەرەی ڕووتان شەهید بدەن و پەراگەندە ببن، کەچی ئەمڕۆ لەسایەی بەرەی نیشتمانییەوە بەعسی و جاش و موستەشارو خائینان بوون بەبرا بەشی میللەتەوە. تاسەریش بمێنێت پاشەڵ عاجباتییان دەبینێت».
زانا لێیوەرگرتەوە گوتی:

- جل و جەوەندە لەیەکتر دەوەشێنەوە.
- دەنا ڕۆڵە من هێشتا جاشە سادە خائینیەکانم لاپەسەندترە.
باشتری دەزانی بەس نیازی بوو گوێی بۆ ڕاگرێت و:
- چۆن؟.
- ئەوانە درۆیان لەگەڵ میللەتی خۆیان نەکردو لەهەوەڵ ڕۆژەوە گوتیان:
- ئێمە جاشین، واتە «خائینین» کەچی جاشە داغمەدارەکان درۆیان کردو گوتیان:
- ئێمە پێشمەرگەی ڕزگارکەری کوردو کوردستانین. ئەوجا خائین دەرچوون. ئـ.هـ خۆ ڕاستیش هەردەم لەدرۆ هەموارو ڕەواترە.

* * *

لەهەورازە نەفتەدا لۆرییەکی چادردار، دوو سێ چەکداری داغمەدارەکان لە پێشەوە خەڵکەکەیان دڕ دەداو:
- لاکەون، لاکەون. ڕێمان بەردەن. هێزە بەقوربانتان بین ڕێمان چۆل کەن بریندارمان زۆر پێیە. بریندار.
عەشاماتی ئەملاو ئەولای ڕێگاکە، بەڕێکی و خوایشتی حەزو بەگوڕەوە ملکەچی بانگەوازە بوون و ڕوویان بەدیقەتێکی بەزەییدارەوە، بەلای لۆرییەکە وەرگێڕا.
گورجی خورپەیەکی کەوتە دڵ و ڕایچلەکاندو بەخۆی نەوەستاو بلەزو هێمنییەوە، وەبەرگوێی زانای هەڵداو:
- ڕۆڵە گیان لەوچاوەتە، خۆت لەپەنایەکەوە بگەینە لۆرییەکەو ناوی سەح بکە.
بەسەرسوڕمانەوە گوتی:
- وا نییە دەڵێن: بریندار ی تێدایە!.

بەگرژینەوە گوتی:
- من وایبۆ دەچم درۆ بێت.
بەهەڵچوونەوە:
- دایە چاوەکەم لەو ڕۆژە حەرەج و کەس بەکەس نەبووەدا مێشکی خۆت بۆ بەشتی لابەلای ئاوا خەریک دەکەیت!.
بەنیمچە غەزەبێکەوە گوتی:
- لابەلای چی. ڕۆڵە؟. پێویستە سۆران و تۆران بزانن، کە ئەوانە لەو ڕۆژە ڕەشەشدا لەگەڵ میللەتی خۆیان ساخ نینەو درۆزن و مخەنەتن.
بەدرۆی حەملاندو کەزانی لەسەری بەشیرە، بەنەرمییەوە:
- چۆن دەزانیت بریندارى تێدا نییە؟.
بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە گوتی:
- ئەوانە ئەوەی مەبەستیان نەبێت کوردو کوردستانەو بۆ خاتری پەڕۆو پاتاری دزی و تالآنەوە، بەزەیی یان بەمیللەتەکەی خۆیانەوە نەهات و هەشت نۆ هەزار کەسیان بە فەتارەتدان، پێم ناڵێیت: کوو بەزەیی یان بە بریندارا ن دێتەوە تاکو خەمانی بۆ بخۆین؟.
باوەڕی تەواو هات و لەدڵەوە منگاندی و:
- هەر((........)) لەوتارێکدا بیست، سی جار((.........،........))دووپاتی کردەوە کەچی((....... ))لەبەر چاوی میللەتی خۆی و جیهانەوە((.........،........)).
هەرکە دوای سەیرکردنی و ئەو نەختە چادرەی هەڵدابووەوە داداوەو یەک لەچەکدارەکان کەدیتی بەو پەڕی غەزەبەوە بۆی چوو..و گوتی:
- حەرامزادە ئەوە تەماشای چ دەکەیت؟.
گورجی دەلحاز لەدڵی زاخاودرا کەل وپەلی بەهادارى دزیاری تێدایە، ئەگەرنا خۆ کفری نەکرد. هەرزوو بەدەنگی بەرزەوە لێیهەڵگەڕاوەو گوتی:

- ناوەڵلا حەرامزادە ئەو کەسانەن کەبەناو سەرکردەنەو ئەوجا هیچ کات لەگەڵ نەتەوە مەزلوومەکەی خۆیان ڕاستەڕێ نەبوونەو ناشبن.
جا بەهەڵچوونەوە ڕووی لەخەڵکەکەی دەوروبەری کردو گوتی:
- ئابڕوو قەترە ئاوێکەو کەڕژا هەڵناگیرێتەوە. ئەوانە تەنیا بەرکیان گەرم بێت و بەس، جا با حەیایان هەزار کەڕەت ئاوا برژێت باکیان نییە.
لۆرییەکە لە «موجەمیدەو سەلاجەو موزەخەو مەکینەی دروومان ئاخێنرابوو».

* * *

- شەوێک لەژێربارى حکومەتە ئەزموونە دادپەروەرە فیفتی بە فیفتییەکەدا ڕیزە دوکانەکانی نزیک پردی سەیداوە تالأن کران.
- شەوێکی تر دوکانەکانی تەک بانقی ئاراس. دەرابەکانی مکووم بوون، بە زنجیر لەپشتەوەی ئۆتۆمبێلیان خست و لەگەڵ هەڵتەکانیاندا خرۆهۆڕیان خەڵکی گەڕەکەکەی بەبتوونی وە ئاگاهێنان.
گورجی لەناخەوە بەجارێک قاری لێخواردن و :«
- نوێنەری حکومەتە ساواکەمان بە ئاشکرا لەبەرچاوان بێ ئەوەی تۆزێک شەرم و هەستی ئەخلاق بیانگرێت، دزی لەمیللەت و وڵاتی خۆیان دەکەن. ئا. ئەو جەردە چاو برسی و قاییمانە ڕابەری دوا ڕۆژمانن. هەر خوای مەزن بۆمان چاک بکات».

* * *

ڕۆژێک بەهاواری مەلاسمایلەوە چوو. باوەڕی بەگێڕانەوەکەی نەهات و بۆ دڵنیایی پێی دووبارە کردەوەو:«
- دوێنێ سەعات سێی «٣» پاش نیوەڕۆ هێشتا مەلای عەسر بانگی نەدابوو و دوو پیکاب لەپێش دەرگای حەوشەمانیان ڕاگرت و چەند

چەکدارێکمان لێ بەژووورکەوتن و بەهەڕەشەو گوڕەشەی چەک خۆم و منداڵەکانمیان خڕ لە حەمام پەستاین و ئەگەر نووزەمان لەبەروە بێت بمانکوژن. تەرحی ماڵ بارکردن بەکەیف و ماشای خۆیان چی کەل و پەل و بزگوڕی بەکەلک دەهات بردیان».
لەشروان دوو سێ قلپی دەنگداری لەهەناوی دەرپەڕاندو ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو بەدەنگی بەرزەوە گوتی:
- قوونێک فێرە تڕ بوو چاک بوونی زۆر..زەحمەتە.
قلپێکی تریشی بەدوا داهات و:
- حەمەڕەحیم هەزار ڕەحمەت لەگۆڕەکەی هەر جارێ دەیگوت:
- بەڵگەی ناوێت ئەوانە لەڕاستیدا دوژمنی میللەتن نەک نوێنەر. هەتا چاویان زندوو بێت کورد خۆشی لەخۆی نابینێت. خوا عالیمە ئەگەر ترسیان بەیەکجاری نەمینێت لەخۆ بسمیل کردنی شەوانیش بەشداری میللەتە پرزە براوەکەی خۆیان دەکەن.
- زۆر..ڕاستە..لەبەر ئەوە دزو جەردەو خائینێکی یەکجار زۆر، لەڕێگەی خەباتی نەتەوایەتیدا عەبای وەتەنییەت و نیشتمان پەروەریان بەسەرخۆدا هەڵکێشاوە، نوێنەرانی هەڵبژاردنەکەش کەوتە ژێر پۆستاڵیانەوەو بێجگە لەزەرەروزیان بەئەندازەی جگێکی پووزە سوودیان بۆ گەل و نیشتمان نابێت.

* * *

لەمەرگەساتی کۆڕەوەکەدا سەرتاپای میللەتە پێشکەوتووەکانی جیهان لە ناخی سۆزی حەزیانەوە بوونە پاڵپشتی واریقاتی میللەتی کوردو بەهەموو چەشنە باروبوویەک دەهاتنە بەرێ، کەچی بەداخەوە((........)) پاشگەزی کردنەوەو بۆیانیش واژی بووەو سەر زلەکانی((.........)) نەخاوەن عیززەت و کەرامەتن، نەخاوەن هەڵوێست و بیروباوەڕ.

- ئەو میللەتە خاك بەسەرە هەتا جڵەوی لەمست ئەو بەرژەوەندارانەوە بێت هەرگیز بەئاوات ناگات.
خەشیمانە هەڵیدایەو:
- کێن ئەو بەرژوەندارانە پیاوەکە!؟.
هەوەستی پێهات و بێ سلەمینەوە:
- ئەوانەی لەشەستەکانەوە هەتا ئەمڕۆی حازری لەسەرکردایەتی حیزبەکانن.
سرکانەتر هەستی بۆ ڕاگرت.
دوو: ئەوانەی جاش و موستەشارو ئامیرفەوج و بەعسی بوونە.
سێ: ئەوانەی لەئیجادەوە غەوارەنەو کوردستان خاکی باپیرانیان نەبووە. تەرحی تورك و بەرزنجی و........
- ئەوانەی خۆیان بەسەرکردەی میللەت دادەنێن و گوایە لەپێناوی خزمەت کردنیاندا گیانی خۆیان تەرخان دەکەن، کەچی بێزیان بەهیچ کلۆ بابەتێکەوە نایەت ئافرەتێکی شەل و شێت و کوێریشیان بدەنە شەریفترین کەسیان.
گورجی بەخۆی نەوەستاو گوتی:
- مانگ لەچواردەیەو حەوجە بەئەنگوست ناکات.
- کەواتە تێکۆشان و خزمەتەکەیان درۆیە ئەگەرنا ئەم هەڵوێستە تڕووهاتەیان نەدەبوو.
چوار: خاوەن شەهادە بەرزەکان.
گورجی پێ حەیرماو بەخۆی نەوەستاو هەر زوو زاری کردەوەو گوتی:
- تاوانی هەموو کەسێکت بۆ دەسەلمێنم تاوانی ئەوانەی دوایی هەرناو.

لەزاری گەیشت، کەچی بۆ ڕوونکردنەوە گوتی:
- بۆ...!؟.
- هەموو کەس دەزانێت، میللەت بەخوێندن نەبێت بەئاوات ناگات.
- ئەوە نکووڵی لێناکرێت حورمێ.
- کەچی تۆ خوێندەوارە پلە بەرزەکان تاوانبار دەکەیت!.
واتە بەبۆچوونی تۆ نەخوێندەواربووانە باشتر بوو.
بەوپەڕی باوەڕەوە گوتی:
- بەڵێ بۆ سوودی میللەتەکەیان سەت قات باشتر بوو.
دووبارە بەحەپەسانەوە:
- ئەم قسەیەت گۆترە نییەو دەبێ بەڵگەت بەدەستەوە بێت. بەڵگە.
بەگرژییەوە بۆی ڕووانی و:
- بەڵێ. من بەپێخواسی بەناو نەکەوتوومە.
باوەڕی نەهات و بەچاوی مۆلەق و سەیرەوە بۆی ڕووانی و مەراقی بوو بە بەزووترین کات هەنجەتەکەی بەڕەوانی بەرگوێی هەڵبدات.
- ئەوانەی دەڵێیت خوێندنەکەیان لەژێرباری حەزو ویستی داگیرکەرانەوە بووە، نەک لەژێرباری هەستی کوردایەتیدا. بۆیە هەردەم بەگوێرەی خواستی ئاغاکانیان، کەسرپینەوەی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانییە لە دڵاندا شەقاو دەنێن و زۆربەیان بەئاستەم بەرژەوەندیان لێبدرێت لە حوشتر خراتر دەڕەونەوەو پشت بەیەکجاری لەگەڵ و خاک و تێکۆشان دەکەن. ئەمەش بەهێزترین بەڵگەی کزی هەستی نیشتمانیانە.
بۆ زیاتر دڵنیابوون و پەڕاندنی دوو دڵییەوە لەم ڕووانگەیەوە:
- ئەگەر بەخوێندن بووایە ئەوانە دەبووایە هەردەم لەئاست خزمەتی گەل و خاکدا لەبەرایی میللەت بووانە. کەچی بەداخەوە وانییە.

چاوێکی بڕوا بەخۆوە لەچاوی بڕی و:
- ئەوانە بۆ ئافەرین و خۆشحاڵی بەعسی داگیرکەرەوە زۆربەیان منداڵی خۆیان دەنارده قوتابخانە عەرەبییەکان و بەگوڕەوە پشتیان لەخوێندن بە زمانە زگماکەکەی خۆکرد.
بۆ ئەوەی دوودڵییەکەی وەلانێت و گوتی:
- بەخۆشت لەمن چاکتر دەزانیت، سەرهەڵدانی خەبات و تێکۆشان و پێشمەرگایەتی و کوشتن و ئەنفال و زندەبەچاڵ و کیمیاباران و دەربەدەری وکاولکاریی ساڵەهای ساڵ بەزۆری لەپێناوی خوێندن بەزمانە زگماکەکەمانەوە بوو.
دوای ئاخ هەڵکێشانێکی قاری تۆخەوە گوتی:
- کەچی باوکە بێ سەوادو خوێندەوارە نزمەکان بێزیان هەرگیز نایەت چاویان لەم ڕووەوە لێ بکەن.

* * *

«منداڵان لەهێندە یاریدا دەبنە دوو بەرەی ژمارە یەکسان. لەهەوەڵەوە زۆر بەڕێک و پێکی و تەبایی و خولق خۆشییەوە هەتا شەکەت و هیلاک دەبن و زەوقیان دەڕوات گەمەکە دەکەن. ئەوسا ناکۆکی و ئاژاوەیان لێ پەیدا دەبێت و زۆر نامینێت وەرگەڕێنە سەروگوێلاکی یەکترەوە. کەچی با خۆشەکەیان «دەمڕاستەکەیان» تاکو دارێک بەنێوانیاندا بهێنێت لەناوە ڕاستیاندا قیت دەوەستێت و ڕوویان بەدەنگی بەرزەوە تێدەکات و دەڵێت:
- ئەوە چییە لەبن پێم؟.
یەک لەئەوانەی هەردەم شەڕو ناکۆکی لەمل گران بووە، پێش کار لەکار ترازانێ وەلامی بەم دەرزە دەداتەوە:«
- نان و ماست»

بەدەنگی حێل ترەوە دەڵێت:

- ئەوە نەڕوات((.........،.........)) دایکی چەپ و ڕاست.

بەم وتەیە لەیاسای یارییەکەدا هیچ لەگۆڕێ نەدەماو هەریەکەیان، ناچار بەلایەکدا گەنم و گردو جۆبڵاوەی لێدەکرد.

بەبزەیەکی دەهایانەوە گوتی:

- ئـ هـ حکومەتی فیدراڵی کوردستانیش بەم جۆرە دامەزرا. لەفەڕاش و حەرەسەوە، بگرە هەتا ئەنجوومەنی وەزیران نیوە بەنیوە.

بزەیەکەی کردە قاقاو:

- پاشدان هەرکە وەزارەتەکان چەسپان وەزیرێک چ قەنەفەو کورسی و مێزو ڕایەخی لەژوورەکەی بووایە، وەک ژن بە ژنی دەبووایە هەمان تاس و حەمام لەژووری جێگرەکەی کەڕەنگێکی تر بوو هەبووایە.

گورجی دووبارە بەپێکەنینێکی گاڵتەجاڕییەوە گوتی:«

- ئەوەش کاری عەقڵ قوندەو نەدیتکانە»یە.

* * *

ئەو خۆپیشاندانەی بۆ بەڕێ کردنی تەرمی شێخ سەدرە سازدرا بۆ هیچ کەس ساز نەدراوە. بەهەزاران کەس لەشەقامە سەرەکییەکانی شاردا جمەیان دەهات و دەرزی هەڵ بدرابووایە بەزەوی نەدەکەوت. پەڕۆی هەمە ڕەنگ لەئاسمانی بان سەران دەشەکانەوەو هوتاف بەناوی نەمری و پایەبەرزی و کۆشانی بەردەوامی شێخی چەمەرییەوە، لەهەر لاوە دەنگی دەداوە:

- بژی شێخی شەهیدی کوردو کوردستان.

- بژی شێخی تێکۆشەرو خەباتگێڕ.

- بژی شێخی پێشمەرگەی کوردایەتی.

- بژی شێخی کۆڵنەدەری مەیدانی بەرەنگاری دوژمنانەوە.
- بژی شێخی سەرکردەی کوردایەتی..
-:«خۆزگە سەفین و هەڵۆش ئاوا لەسەر((........))بتۆپێترابوونایە ئەوجا با هەر ئاوا بەباڵای تەرمەکانیان هەڵبدابووایە!».
مەگەر زۆر بەدەگمەن دەنا بەخەیاڵی گەورەو گچکەی ئەو هەزارە زیلەدا نە دەهات شێخ بەری لەهەرچی بۆنی هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی لێدێت هاوێشتبوو.
«ئـ هـ بەرهەمی راپەڕینەکەیان کردە شیوی حەمەشێت: زێن و شێن، هەڵوێستدارو خائین، جاش و پێشمەرگە، بەفانووسیش لەیەکتر هاوێر ناکرێنەوە. تەنیا ئەوانەی لەلەوچیندا لێزان و مەعلان بن لەپێش و خۆشەویستن و بەس. باحەز دەکات دوو سێ «نەوتولشوجاعە»ی خیانەتی دەرحەق گەل و نیشتمان و «پاداشتی دوژمنی داگیرکەر»یان بەشان و شەپیلکانەوە هەڵواسرابێت کۆڵنەدەرن و هەڵگری تیشکی ئومێدی دوارۆژی میللەتن». لەهەموو ڕوویکەوە جێگەی باوەڕو متمانەنە:»
- پێشتر گەلی کورد وێڕای ئەوە بیلبتوون لەژێر ساڵدرمەی داگیرکەران دەڕەتایەوە لەهەموو مافێکی مرۆڤایەتییەوە بێبەش بوو. هەتا پەلەقاژەی دەربازبوونی بەمێشکدا گوزەر نەکات ئومەمییەکان بروایان وا پێ هێنابوو:
- جارێ دەبێت خەمی ڕزگاربوونی قولەڕەشەکانی ئەمەریکای لەبەر بێت. کەوا چۆن فاشییە مرۆخۆرەکان جوایەزی پێست ڕەشەکان دەکەن. ئەوەش لەهەموو کوفران کوفرترە.
بەئاهەوە دەففەی سینگی لەگەڵ بەرزبووەوە:«
- بڕیار بەبڕیاریێی خوا حەمەڕەحیم بەچاوی خۆت بدیتبووایە، ئەو

پێست ڕەشانەی کەوا خەمت بۆ مەزلوماتیان دەخوارد، وا ئەمڕۆ بەناوی یارمەتیدانی نەتەوەکەت هاتوونەتە کوردستان، مەعاشی هەر یەکەیان کە بەرهەمی خوێنی میللەتە کەتە نزیکەی «٥٠٠» پێنج سەت کەڕەت مەعاشی مامۆستای کوردی پێدەدرێت. ئەوجا بێزیان نایەت هەڵسوکەوتیان لەگەڵ میللەتە چەوساوەکەت بێت و خۆیان هەردەم لاگر دەگرن».
ئەمە داخێک بوو چەند..دەکۆشا لەدڵی نەدەپەڕی و:«
- ئـ.هـ ئەی هاوار بۆ ئەو وڵاتەی دەستی UN ی تێوەردرا. لەهەموو ڕووێکەوە کەلکی دەبڕێت.».
دەستەیەک لە داغمەدارەکان هەرکە حسیان ڕەسیدیان لەنێودڵی میللەت بە دزی و تالان و ڕاوەڕووت دابەزیوەو بوونەتە پەڕۆپیسی ئافرەتان. پڕ بەزار هاواری دەکرد:
- گەلی کوردی بەشەرەف و ئازیز لەسەر گەورەو بچووک و ژن و پیاومان پێویستە ((........، ........، ........))
ئەمە لە ئاست بیروبۆچوونی خەڵکە ساویلکەو نەشارەزایان سەلاوەتی پێدەویست و هەرجارێ سۆزی هەستی کوردایەتی بەناخی دەروونی گەنجە دنیا نەدیتەکان دەبەخشی و سێ جرتی هەڵیدەچووواندن. تایبەت (........) لە دڵی خۆیان خۆشتر دەویست و لایان وابوو هەر (........) کەچی هەرکە (........).
لەشەڕی یەکەمی دابەش کردنی کوردستان و سامانەکەی شەڕکەرەکان لە هێزو توانادا هاونیر بوون و هیچیان نەیدەتوانی لە «پایتەخت» ی کوێی پیرۆزە تاکو شەڕی تیا بەرپا نەکرێت». بەئەنقەست شەڕ خرایە جەرگەی و بەسەر ئەویتر زاڵ بێت و قاوی بدات. دەستەیەکیان زۆر کۆشا و تەقەلایداو ئەملاو ئەولای کرد هەتا ڕاگیرا.

- زۆربەی خەکەکە بەم کارە پیرۆزو ڕەوایە گوشاد بوون و ئەمیان بە خاوەنی هەستی مرۆڤایەتی و نیشتمان پەروەرتر لەقەڵەمداو بەچاوی ڕێزەوە سەیریان دەکرد.

گورجی گریانی بەم سەردولکانە، هەرگیز نەدەهات و بگرە بەعەقڵی ئەوانەی باوەڕیان هاتبوو پێدەکەنی و:«

- سەیرە بەبکوژی کوردو دزو تاڵانکەری کوردستان دەڵێن: «نیشتمانپەروەر». ئ.هـ لەمێژووی سەرهەڵدانی مرۆڤایەتییەوە قەت ڕووی نەداوە:«

- یەکێک دەیان ساڵ ئاڵای ئازادی خاک و گەلەکەی بەرز بکاتەوەو لەپێناویدا حەیام و زەمانێک بجەنگێت، کاتێک بۆی ڕەخسا بەرژەوەندیان بدزێت و تاڵانی بکات. ئەمرۆش وا متمانەی بەشەڕ. ڕاگرتنی پێدەکەن».

ماوەیەک سەری خەفەتانی باداو دڵنیابوو:«

- ئیللا بیللا ئۆینێکی لەو شەڕ.. ڕاگرتنەدا لەژێرسەردایە. بەڵام چییە؟ .نازانم. ڕۆژێکیش هەر دادێت قوونی ڕەش و سپی لەیەکتر هەڵماندرێن». بیری بەمەلاوە هۆیداوەو:«

- دکتاتۆری داگیرکەر هەموو کەس شارەزای سوخەتینەو دەزانن چ پشکێکە و دوژمنی هەرە گەورەی کوردەو بۆ گوڵمە خوێنێکی بەحەوادا هەڵدەچوو، ئەوجا چەندین پرۆژەو *ساختمانی گرنگی* لەکوردستان بنیات نا. کەچی ئەوانە بە ناخێری گیانیان لەگەڵ سەنگرانەوەیان لەسەر خاکە ئازاد کراوەکەیاندا، بەناوی کوردایەتی و ئازادیی کوردستانا وەک چاو ئێشە هەر زوو دەستیان بەهەموو شتێکی بەکەلک دەهات داهێناو عەشتەبایان نەهێشت. حەق وابوو میللەت هەر ئەو ڕۆژە بەچەپڵەو پلووکە بەردی ڕیسوایی یەوە

سـەراودویان نێـن و نیشـتمان بەدەریـان بکـەن. کەچـی بـە داخـەوە هێشـتا نەگەیشـتنە ئـەو پلەیـە. بۆیـە وا کارە خیانەتەکانیشیان بـە کاری نیشـتمانی و وەتەنییـەت لەقەڵـەم دەدرێـت».

بەبیروبۆچوونـی هـەردەم لەبەرژەوەنـدی ئەوانـە ئـەو پارچـە کوردسـتانەش ئـاوا دابـەش بێـت. ئەوسـا هەریەکەیـان لـەو بەشـەی لەژێر ڕەحمەتی دایە وەک نێرەکەری عوزێر پێغەمبەر «د.خ» بەکەیف و ماشـای خـۆی تێیـدا بزەڕێـت و بەروبوومەکـەی خـڕ باوێتـە باخەلـە بێبنەکەیـەوە و:«

- لەزێـن و شـێنەوە دەرکـەوت ئەوانـە هـەر لەهـەوەڵ ڕۆژەوە بـۆ ئـەم نیـازە بـە چیـا کەوتبـوون. ئەگـەر بەخێـری خۆیـان مووچـەی ژیانـی فەرمانبەرانی دەوڵەتیاندا ئەگەرنـا هیـچ کـەس حـەدی نییە پێیـان بڵێت:

- کاکە هێشتا تێر نەبوون؟»

- هەتـا ئەڤینـی دڵـی خەڵکەکـە بۆخۆیـان جلەوکێـش بکـەن مووچـەی گشـت فەرمانبـەران بەنـاوی حکومەتـەوە وا زێـدە کـردن هەرکـەس بەوپـەڕی ڕەفاهییـەوە پـێ بژیـت.

گورجی باوەڕی هەرگیز نەدەهات و:«

- حوشتر بگرە خەت، پیشەم نەبووە قەت».

ئەوانەو سوودگەیاندن بەمیللەتیان نەگوتووە.

- کەچـی هەرکـە زانـدرا پارەیەکـی یەکجـار زۆر دەکات، گیرفانـی خۆشـیان لـە بەرایـی هەمـوو شـتێکە، بـێ پـەردەی خەجالەتـەوە، پێشـتریش لەئێسـتگەکاندا بەمەزنایەتـی بەیانەکەیـان هەڵـدەداو سـینگی شـانازیان پـێ هەڵدەکێشـا، جـوان لەپەڕۆپیسـی ئافرەتانیـان لوولـداو خسـتیانە نێوتەنەگـەی زبڵـی پەشـیمانییەوە».

بیری بەلایەکیدیدا هەڵەتە بوو:«

- کورد ئەگەر خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی هەبێت پێویستە لەسەری یەکەیەکەیانی بەدەردی شێخ سەدرە لەناوبەرێت. ئەوسا بێگومان بە ئاسانی بێ گیروگرفت و تەگەرە، بەئاواتی خۆی دەگات».
زانا بەم زانیاریانەی دایکی چاوی حەیرمانی زەق و دەم قولاجێک بەشی بۆ مابووەوە.

* * *

دەستێکی تاوان و چەپەڵ و داخ لەدڵی ئەم ئەزموونە دیموکراتییەی کوردستان ئەمشەو سەر لەئێوارە بۆ ئاژاوەو لەبارچوونی حکومەتە پاڵێوراوە ئازیزەکەمان هێرشێکی ترسنۆکانە دەکاتە سەر گیانی هێژا:«
- «سەید تەها» کەبەسەیدە سۆرە مەشهوورەو ئەندامی پەرلەمانە خۆشەویستەکەمان، بەئوعجوبەو خۆش بەختانە دەرباز بووە. تەنیا بە سووکی بریندار بووە. داواکارین لەیەزدانی مەزن بەزووترین کات شیفای بۆ بنێرێت.
بەهەندێ باشبووە دەستوەکەری چاپووکانەی حیمایەکانی تاوانباران هەڵدەبڕن و یەکێکیشیان بەدۆزەخ شاد دەکەن».
بەیانی زوو لەسەرتاسەری شار تەقیەوەو مانشێتی ڕۆژنامەکانی شار پڕکردبووەوە.
گورجی لەلایەک بەدەنگ و باسەکە دڵی داخورپاو زاناش بەهۆی کوژراوەکە دەناسرێت، لەلایەکی دیکەوە زۆر لێپەست بوو هەرکە گەڕاوە حاڵی کرد. بە تەنیا ئەنجامیداوە.
- ڕۆڵە ئەو دەنگ و باسەی بڵاوبوویتەوە دڕۆی تۆ سپی دەکاتەوە. بۆیە بڕوام نەما کەدەستی تۆ لەو غەزایە پیرۆزەدا بێت.
لە قاقایەکی وایدا لەدوورەوە دەبیستراو جا گوتی:

- دایە هەتا هەنووکە مەگەم چۆن درۆم بەسەر زاردا نەهاتووە. نەخەسەلە، لەڕاست جەنابت. ئەو کوژراوەی دەشڵێن بڕوا بکە هەژارێکی لابەلایەو بەس.
لەگەڵ گوتنی:
- ئەیڕۆ. سەراو قەت کەسمان نەما لەباتی ئەو خائینە بتۆپێنیت قوڕبەسەرێکی لابەلات کوشتووە!؟.
لەشروی زگ پێسووتاندا هەتا شەپ گرتی لەڕوومەتە چورچەکانی خۆیدا.
زانی سەرچیغ چووەو خێرا گوتی:
- دایەگیان هەڵمەچوو. دڵنیابە گوللەی من ئەگەر لەسەیارەکەشی دەرچووبێت بەدیوارکەوتووە.
بۆ ئاو خواردنەوەی دڵی بەهەشتاوییەوە گوتی:
- ئەدی پێمناڵێیت: ئەوەی دەڵێن، چۆن کوژراوە؟.
پێچەوانەی ئەو بە هێمنییەوە:
- لەبەر ئەوە دەیناسیم نەمتوانی لێی نزیک ببمەوە. چەند هەنگاوێک دوور بوو پێش ئەوەی لەسەیارەکەی دابەزێت، بەمەزەندە مسۆگەرم بوو زەبری خۆم وەشاندو تێمتەقاند. خەڵکەکەی دەوروبەریش لەترسانا زۆربەیان چاویان لێکردم. حیمایەکی شەلم کوێرم دوو گوللەی کلاشینکۆفی بە کەرخی من وەنا. یەکێک لەتەکم و بای غارا لەگەڵ نقە لێوەهاتنیدا لەسەر ڕا دەماو دەم کەوت. من لەهەوەڵەوە بەربوونەوەکەیم بەساتمە لەقەڵەمدا.
هەرکە قرت و فرتی دڵی فڕی، دڵگیری کوژراوکە بەقسەی هێناو گوتی:
- چۆن دڵت بەردەستیدا لەنێو ئەو قەرەباڵغیەی باست کرد دەست

بووەشێنێت؟. هۆ باب. نەتدەزانی کەسی بێتاوانی ئەوها بەردەکەوێت؟.
بە هەناسە ساردییەوە گوتی:
- چارەم نەبوو. بەڕۆژ دەیناسم و نەمدەتوانی تخوونی بکەوم. بەشەوێک بە هیچ نەوعێک بۆم ڕێک نەدەکەوت.
بەس دەمزانی هەفتەی بەلای کەمیەوە سێ چوارشەو سەر لەئێوارە هەتا نوێژی عیشا سەردانی ئەحمەدە گولەی ئاغای دەکرد. بەخۆشت لەمن باشتر دەزانیت بەردەرگای حەوشەو ژووری ماڵی گولەی خائین شەو..و ڕۆژ وەک سەربەستی کوردستانی لەسەرشان بێت مۆنجەی لەداغمەدارەکان دێت.
- ڕۆڵە ئەوە لای ئەوان مەبەست نەبێت بەرژەوەندی گەل و نیشتمانەو لای عەوامی خەڵک بەڵگەی ناوێت گولەی خائینیش بەمەلایین دیناری ئەمن و ئیستخباراتی داگیرکەری پێ سپێردراوەو ناوە ناوە بەبەریان وەردەکات. ئەوانیش مردەی پارەنەو هەموو شتێکی قوربان دەکەن.
- گولە ئەوانی لەمێژە لچ کردوونە. مانگ نەبوو ئافرتانی خزم و کەسیان بۆ ڕەزامەندی دڵی نەنێرنە ماڵی و بەکۆشێک پارە نەگەڕێنەوە.

* * *

- شەڕی دووەم، بەناوی گومرگ و خاوەو سەرانە بوو. کەچی لەڕاستیدا شەڕی دابەشکردنی کوردستان بوو لەجەرگەی پایتەخت هەڵگیرسا.
گورجی بێ پەردەی شەرمەوە هاواری کرد و گوتی:
- نەمگوت: ئەوانە هی ئەوە نینە ببنە کاربەدەست و ڕابەرو حکومەتی ڕاستەقینەی میللەتی خۆیان!.
-: ئـ.هـ لەهەندەران قاپ شۆرو بۆیەو ناترو خزمەتچی و سەگ

شۆڕبوونە. هەرە شەریفەکەیان پۆستەچی بووە. گەڕان و سووڕانیان لەوڵاتی غەریباندا و هەست کردن بەکەمی و نوقسانیان هەرچی کاری قەڵپ و درێو..و ترووهاتە فێربوونەو هەستی کوردایەتی و نیشتمانیان، کەپێشتر بەو ناوە بەچیاکەوتبوون توورِ هەڵداو حاجی دۆلاریان لەشوێنی جێگیر کردو هەتا بۆیان بلوێت هەرچی سوودی کوردو کوردستانە بەلاگێڕی چەند دۆلارێکی دەکەن.

- دەستەکەی پێشتر هەتا شەڕی ڕاگرت بەرد شەقی بردو چەندین کیلۆمەتر ئافرەتانی بەپێیان ڕۆ..واند. ئەمجارەش تەرحی گۆرین وا کاوێژی دەکاتەوە کەچی لەبریتی ئافرەتان دەور ببینن ڕۆژ بەڕۆژ خۆی لەجەرگەی پایتەخت بەهێزتر دەکات.

گورجی مەرامی دڵی چاک بۆ..والا بووەوەو بێباک تێیهەڵکرد و گوتی: هەڵمەت و زاناش توریندانە هەست ڕاگربوون.

- کورینە: ئەم جارە پێشتر خۆی زۆر چاک قاییم کردووە ئەگەر دنیاش بچێتە ڕجایێ شەڕ ڕاناگرێت.

غەنیمەکەی شاروەدەر کرد. چەند ڕۆژان لەبەر دەنگی تۆپ و مەترەلۆزان کە بەنیشانە ئاراستەی بینایەی «شیراتۆن» دەکرا خەڵکەکەیان بەجارێک هەراسان کردو لەهەرلاوە تف و نەفرەت دەکران.

- نەفرەت لەخۆتان و چەکتان.
- نەفرەت لەخۆتان و شەڕتان.
- نەفرەت لەخۆتان و هەڵوێستتان.
- نەفرەت لەو کەسانەش کەئومێدی بەئێوە هەیە.
- ئێوە پێشمەرگە نینە، پێشفیتنەنە.
- دوژمنی میللەت و دۆستی داگیرکەرانن.

- بەمەش دڵانی نەفام و کەودەری و عەقڵ قورەش سەقادرا کەخواستی میللەتیان بۆ سونەتیش لەبەدەندا نەماوە.
- خۆی بوو بەمیر پەنجۆی پاختەخت و بەکەیف و ماشای دڵی فەرهوودو تالانی کرد. تالانێکی وا عەرەبیش نەیکردبێت و زەندیق و عەرووسیش زگی بەشارەکە دەسووتا. تەنیا ئەوان نەبن.
- لۆری و پیکابی تالانکەران قەتارەیان بەستابوو..ولێفەو دۆشەک و مافوورو سەرەنازو بەڕەو کراس و کەواو سوخمەو ئاوەلکراسی ئافرەتانی پایتەخت گەیشتە ناوچە دوورەکانی گەرمیان. غەرەزیش لەچوونە قەلات «دۆڵمە» خواردنە.
- هەرکە بەیەکەوە بەناو شار کەوتن بڕووخێنەو بڕمێنەو بدزەو بفڕێنە. وک مەفتەنی دوژمنی بابەگەورەیان بێت بەزەیی یان بەهیچ شتێک نەدەهاتەوە. هەتا لەدیمە شارستانییەکەیان تەواو ڕووتاندەوە.
- ئەوانە بەتەمای نیشتمانی خۆیان نەماون و خۆیان بەمیوان دەخەملێنن حەقیانە خراتریش بکەن.
- ساختمانی تاک و لۆک لەملاو لەولا مابوون. ئەمانەش بەناوی ئەوە دەستە بەکرێگیراوەکەی تر ماوەیەک. پشووی تییان خواردووەتەوە و گلاوبوونەو پێویستێکی نیشتمانی و کوردایەتییە ئاتاریان لەسەر پاتاریان نەمێنێت.
- هێندە خانووش بەهەنجەتی ماڵە جاشن.

لەکاتی ڕووخانی شیراتۆندا گورجی، بەدژی هەڵوێستی زانای ڕووی لەو چەند کەسە کرد، کەکوتەکی غەزەبییان لەسەربان دەوەشاندو گوتی:

- دەی لەو چاوەتانە ئەو هەولێرە گوێی پیرۆزە هەتا ئاوا نەڕووخێت و کۆڕ نەبێتەوە.

بۆ ئەوەی چیتر لەم ڕووەووە نەدوێت زانا هەرزوو گێڕەکەی گۆڕی و گوتی:
- وێڕای ئەوەش دەست و پەیوەندەکانیان ڕوخسەت داون ئۆتۆمبێلان بدزن و ئاوای بکەن، یاخۆ کەلوپەلەکەی دوا تەفلیش کردنی بفرۆشنەوە.
گورجی ناچار بوو بەگوێرەی وتەکەی هۆبداتەوەو بەزەردەخەنەی بێ خوایشتی حەزیەوە گوتی:
- پیکابە توێتە دەبل قەمەرەی سەیدە سۆرەی ئەندامی پەرلەمان لە «بابولنیزام»کەسەخترین شوێنە دزراو قەلۆشیش کرا.
- ناوەناوەش پارەیان بەزۆر لەدەوڵەمەندانی پایتەخت دەستاندو بەسەر خوبزەو گۆردەکانی خۆیان دابەش دەکرد کەبووە هۆی حەشاردانی پارەو کزبوونی ئالو..وێرو مامەڵەو باری ئابووری ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو. وبرسێتی پەرەی دەستاند.
- زۆربەی زەوی حکومییان بەسەر خۆیاندا بەش کرد. زەوی هەبوو نرخی خۆی لەقەرەی «١٠٠» هەزار دینار دەدا.
بەدەنگی بەرزی تووڕەییەوە گوتی:
- بەگورگ بێت هەرچی گیانلەبەری سەرگۆی زەوی هەیە بکاتە بوریانی بێچووەکانی خۆی.

* * *

ئەم پایتەختی کەوتە دەست و شەڕ وەستا. تەنیا لەنێوان دوو کۆمەڵگەی لە یەکتر نزیک نەبێت. شەڕ نەبوو. بگرە جەڕباندنی دەست و بازووی قازیفە و هاوەن و دۆشکان بوو. زۆر بەدیقەت و سیرەگرتن و نیشانە پێکان دەهاویشتران و هەردەم سەریان بۆ دەخورا.

ڕۆژ نەبوو خەڵکە بێ چەک و ئەنواکەی کۆمەڵگەی «بنەسراوە»و «کەسنەزان» نەبنە قوربانی.

- دایە بەرهەمی نیشانەکانی داغمەدارەکانی ئەم شەو((٩)) نۆ کەسی لابەلا کوژراو «٢٥» بیست و پێنجیش بریندار.

- گورجی بەواق وڕمانەوە گوتی:

- نۆکوژراو.. وبیست و پێنج بریندار. کافرستانییە.

ئاخێکی داخداری وای هەڵکێشا ئاو لەدیدانی بازرەقەی بەستاو:

- نازانم هەتاکەی میللەت ئەو مرۆکوژو دزو تاڵانکەرو خائینانە ناناسن و بەر شاپی ڕیسوایی یان نادەن؟.

بەڕوویێکی دڕدۆنگەوە گوتی:

- هێشتا زۆرمان ماوە بگەینە ئەو ڕۆژەی دەڵێیت.

- کەواتە هەتا دەگەینێ پێستەمان بەدەستیانەوە دەچێتە دەباغخانەوە.

- ئەگەر هەردوولا بەو پێودانگەش ڕازی بن«پایتەخت بۆ یەکیان و گومرگە زۆرەکەش بۆ ئەویتر» خواستی ئاغاکانیان «ئارام بەرقەرارنەبوونە» بە توندی و غەزەبەوە بەرپەرچیان دەداتەوە.

زانا دەیزانی دایکی قولەقاپی لەزۆر دەراوان تەڕ بووەو دەیویست زیاتر زانیاری لێوەربگرێت.

- بەڕاستی من سەرم لەو کێشمە کێش و هێن و منهێنەی ئەوانە دەرناچێت.

- ڕۆڵە دڵ لەدڵ مەدە بیکە سەعاتی دەستت لەبەر خاتری بەرک و کورسییەکانیان، بەفیتی حەزی هەرسێ دوژمنی داگیرکەر دەجوڵێنەوەو لە دەسەڵاتیاندا نییە بەئەندازە «فسەگورگ»ێک لاگریان بووەستن.

زانا کەئەمەی بیست و گوتی:

- کەواتـە ئێمـە هەتـا ئەمـڕۆی حـازری شۆڕشـی ڕاسـتەقینەی خۆمـان نەبـووە.
- مانـگ لەچواردەیــەو حەوجــە بەئەنگوســت نــاکات و لەکونــی کارک ڕاســتترە.
زانا پتر پێ حەیرماو بەزار بەشبوونەوە سرکانە هەست راگر بوو.
- بەهێزتریـن بەڵگـەش، کەتـا لەژیانـدا ماویـت لەیـادت جوقـە دەربـکات و بـە هیـچ هێزێـک نەسـڕێتەوە:«.
-: ئەوانــە بیلبتوونیــان لەهەڵبــەزو دابــەزی پەڕینــەوەی هەرســێ ســنووران، پەســاپۆرتی ســەر ســەلامەتیان لــەدوڕ پەڕەکــەی دڵیانــەوە قرمســاندووە.
زانـا یەکسـەر بـاوەڕی هـات، کەتـا ئـەو سـاتە بیـری بەلایـەوە کـەم و زۆر نـە دەشـکاوە. هەرکـە ئەمەشـی لەگوێـی زرنـگاوە:
- ئەگەرنا بڕوا بکە لەمێژوو بوو پەلەوازکرابوونەوە.
چەقێلـەی لەدڵدا کوتـاو یەکسـەر قیـت بـووەوەو بەوپـەڕی شـانازییەوە پڕیـدا مـاچ کردنـی دەسـتە لـەر زۆکەکانـی و گوتـی:
- تاکوخـاوەن دایکێکی وەک تۆ بـم مـن هەرگیـز ڕێگـەی. ڕاسـتیم لێبزر نابێت.
پێنـج و دوو ڕۆژێکی نەبرد ئەمیـان بەدەسـت لەپشـتدانی کوردکوژەکـەی ئـەو دیـو لـەدوو لاوە تەنگـی بەئـەو هەڵچنـی. ئەویـش هەرکـە زانـی ئـاوی بەکـون وەربـووەو ڕۆژی حـەلاو. وەلایەتـی، هەمـوو شـتێکیش بەمەزەبیـان لەژێـر کەوشـی مانـی دەسـەڵاتەوەیەو مافـی میللـەت و هەسـتی نیشـتمانی ئـەو سـاقرنەی ژێـر کلکـی بارگینانـن بـێ پـەردەی هەسـتی نەتەوایەتـی و شـەرم و تەریقییـەوە هانـای گۆردایەتـی و چەورەیەتـی بـۆ ئـەو داگیرکـەرە بـرد کەچەنـد سـاڵە بەنـاو بۆمافێکـی

ڕەوای میللەت لەگەڵی دەجەنگاو ئەنفال و زندە بەچاڵ و ئاشبەتاڵ و تالان و وێرانی بەدوایا سەریان هەڵدا.
- هەموو شتێک لەدەڤەرەکەمان عەبای فیشاڵی بەسەر خۆیدا هەڵکێشاوەو زەرەزەڕی نێرەکەری حەساوییەو بۆنی کەلاکی ماف میللەتی بەجارێک هەراسان کردووە.
- بڕوا بەهەڵوێست بووەتە پشیلۆکەی بەر تەوژمی هۆڕەوەو بەخەونی شەوانیش ئاوقای نابییەوە.
- هەول و تەقەلای بەگوڕی بەرپەرچدانەوە دیمەنی عەرشی بەلقیسایە.
- کەسێک بەهەردوو پەنجان و کڕنووشەوە شادەی بەدڵ پێنەهێنێت بە کرۆکەی ئاخر زەمانەو بەمەزەب و یاسای سەردەم گوللەی ناگەهانی پاداشتە.
گورجی بەپێکەنینەوە ڕووی لەزانا کردو گوتی:
- ڕۆڵە پێشتر دەبابەکانی بەعسی داگیرکەر چەند هەنگاوێک لەهێڵی میز پێداکراوی ٣٦ سی و شەشەوە بترازابوونایە دەلحاز لەقەوچەی دەدراوە، کە چی ئەوجارە ترسی نەبوو.. وخواخوای ئەوڕۆژەشی بوو UN باڵی قووڵ بکات.
- ئەگەر بەدەست لەپشتدان نەبووایە لە«٨٠٪»ی چەکدارانی ئەم فاتیحایان بۆ لێدەدرا.
- ئەم کارە نارەواو نەگریسە بۆ ڕاگیری دەسەلاتی هەریەکەیان ئاسایی یەو دەیخەنە ژێرباری جم و جۆڵی نەتەوایەتییەوە، نەک تاوان و خیانەت. گریمان پەنجەی نارەزایی بەرزکرێتەوە دەلحاز دەبڕدرێت.
زانا جار لەجار بەزانیارییەکان گوراح خۆشتر دەبوو..و

لێیوەرگرتەوە..و:

- پشت بەهێزی هەر سێ بکوژان دەبەستن تەنیا بەمیللەتی خۆیان نەبێت.

- ڕۆڵە بەرهەمی کوڕەشێخ وسەرەک هۆزان هەر ئەوەیەو زیاتر لەگۆڕێ نییە.

دوای دامانێکی زۆرەوە لەناخەوە دوا:

- ئـ.هـ ئەم پێشتر خراتر بوو..وچەند ساڵ بەردەوام بوو. بێجگە لەئەوەش نزیکەی«٢٠٠»دووسەد کیلۆمەتر بووە پێناوی کورد کوژانی ئەو دیو. تاکو بەس زەربە لە((........،........))پەناهەندەکانی بدات. کە لەژێر باڵی بەمیوانی حەوابوونەوە، ئەمەش هیچ کەس لەسەر گۆی زەوی ئەنجامی نەداوەو ناشدەن».

- ئەگەر هەردووکیان مافی دەسەڵاتیان لەنەتەوەو خاکەکەیان لاشیاوتر نەبووایەو هەستی نیشتمانیان لەدەروونـدا نەپەڕیبووایە، پاش ئەوەی بۆیان واڵا بووەوە «UN»و داگیرکەر بۆ مەسەلەکەیان یەک تاس و حەمامن دەبووایە هەر ئەودەم ئامێزی ئاشتی و برایەتی یەکجارەکی لەگەردەنی یەکتر وەرێنن.

زانا بەزەردەخەنەیەکی تەڵخەوە گوتی:

- ئەم لەترسانا دوو لاقی هەبوون و دووانی تریش قەرز کردن و هەتا ئاودیو نەبوو، تاسای هەرگیز نەکرد بەتی چاویش ئاوڕێکی سرکانە بداتەوە.

بەپێکەنینەوە:

- ئەویش هەر پایتەختی بۆ ڕێدرا بوو، کەچی تەماع پێدرێژی پێکردو نەیزانی فەناحی لە دوایە.

- ها. لێرە، ها لەوێ شێروشەپارانە سەری لەدوانا.

- بۆ ئەوەی زانا تەواو حاڵی ببێت و گوتی:
- دوای کارەساتی ئاشبەتاڵە گەورەکەی یەکەمەوە داگیرکەرانی هەر چوار پارچە هەرگیزاو هەرگیز ڕێنادەن کورد جارێکی تر تەرحی پێشوو لەژێر.. ڕەشماڵی یەک ئەستوندەدا پشووی خۆشی بخواتەوە بۆیە بەکون فەیەکونێک ئەمیان بەقەیدو شەرتی: «پڤەیە تخوونی پایتەخت بکەوتەوە».
بەپێکەنینێکی زۆرەوە گوتی:
- کەواتە ڕستەیان لەدەست ڕاوچی دایەو لەو دیو بلەز بوژاندنەوە هەتا ئەوەی لەدوڕ پایتەخت نەپەستاوە «شەڕە بەرانی دەسەڵات و داغمەدارییە و فڕی بەسەر هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی نییەو ئەوەی وانە بێژێت ڕشانەوە»یە. لەکۆڵی نەبووەوە، دەست و پەیوەندەکانی ئەو لەترسانا لەنێو جەرگەی پایتەختیشدا جێیان پێ چێنەبوو..وناوکی ورەیان کەوت و گریمان ئەم«١٠٠»سەت چەکداری بنار بووایە پایتەخی بەئاسانی دەگرتەوە.
- ڕۆڵە بەزم لێرەدایە ئەوەندە کەسەی خۆ بەخۆکوژراوە بڕواناکەم گەلی کورد ئەوەندە داگیرکەرانی هەرچوار پارچە کوشتبێت.
- وازەن دەبردرا ئەوەیان لەڕکابەری ئەمیان تۆزێک بەزەیی و ڕوحمی بە پایتەخت و خەڵکە نەدارەکە دێتەوەو تخ لەڕاوەڕووت و فەرهود دەکات. کەچی قوونێک فێرە تڕ بوو چاک بوونی زۆر زەحمەتەو سەت خۆزگە بە کفن دز. هەتادزە چاو برسییەکانی تەواو هەڵنەهەنگران سوکناتیان بە ئاستەمیش لەدزی و فڕان و فەرهود کردن نەدا. کافری حەوت دینانیش زگی بەپایتەختە بێ خاوەنەکە دەسووتا. تەنیا داغمەدارە خوێنڕێژ و چاو برسی و بەڕک بێ بنەکانی بەرە نەبێت.

گورجی شێت و هار بوو..وچاوی غەزەبی چووە پشتە سەری و لەعەردو بەردی خوا توتکەی نەدەگرت و بەدەغەزەوە ڕووی لەزانا کردو گوتی:

- ڕۆڵە ئەوا سێ جارە پایتەخت لەدوای ڕاپەڕینەوە جگە لەشەڕ و کوشتن و ئاژاوەو رمان و ڕووخانەوە لەسێبەری بەرەوە تاڵان بکرێت.

- یەکەم: شێرو شەپارانە بەیەکەوە.

- دووەم: جیاجیا..

بەسەربادانی قارەوە گوتی:

- لەشارەکانی تر حەددیان چیە دەست بۆ پاتارێک درێژ دەکەن بەپلووکە بەردی ئیهانەو نەفرەتەوە چاویان دەردەهێنن..

* * *

گورجی بیست و چوار سەعات لەمشوور خواردنی کێشمەکێشی چۆن دەبێت و نابێتی دەروونیەوە دابوو:

- هێشتا دوو کونی گەورەو بەسۆم لەجەرگم ماون سارێژ ببن.

مسۆگەری بوو ڕۆژێک دادێت نەوەکەی خواستی بە جێدهێنن بەلام:«

- زۆر زەحمەتە لەژیاندا بمێنم و بەچاوی ئۆخەی ببینم».

ئاواتی هەرە گەورەی بوو لەژیاندا.

ئەگەر لەبەردابەش کردنی نیشتمان نەبووایە شەڕەکەی زۆر لەملان خۆشبوو ..و هەر جارێ دەیگوت:«

- هەرچەند یەکتر بکوژن بەسوودی میللەت دەشکێتەوەو دزو تالانکەرو خوێنرێژو داغمەدار لەکوردستان کەم دەبنەوە».

بە ئاخەوە:«

- دەبێ لەم زووانەدا حاکمێکی دادپەروەر سەر هەڵبدات و دژی ئەو جەردە کورد کوژانە بووەستێت و گەلی کوردی خێر لەخۆ نەدیو چەند ساڵێک بەخۆشی و سەرفرازی لەژێر باڵیدا بسێتەوە!».

* * *

گورجی سەردانی سەیدە سۆرەی کردو لەدوورەوەی دیت دەستی راستەی لە «چبس» گیراوەو بەسینگ هەڵواسراوە:«

- شاللا هەتا ماویت پێوەی دەناڵێنیت».

بۆرەشکێکی بۆ ئەمان دەچوو. تایبەت هەرکە لەملاو لەولا بۆی گەڕابووەوە، دوای گرتنی مەنزوومەی بەعس هەوڵیداوە بەدەستی میللەتە راپەڕیوەکە، بە فەتارەتی بدات. کەچی بەسەردانەکەی پەڕی و لەدڵەوە:«

- شارەزامە: بەرەی رووتان عوجبیان قەت نایەت دیدەنی ناحەزی خۆیان بکەن».

ئەویش هەر بۆ ئەوەی بوو:«

- ئەمرۆ هەرچی لەو شارەدا دزو جەردەو جاش و زەلام کوژە لایەنگرینەو نەبادا بەناوی جاسووس و کۆنەپەرستی رچەلەکم لەناو بەرێت. ئـ هـ زۆر چاکیش لەدەستی دێت. بەڵکی بەم سەردانە لەکۆڵمان دەبێتەوە».

- پوخڵەواتی پێش سوێند خواردنەکەی دەزانی و دوای نەمانی حەمەڕەحیم لەنامەیەکدا بەسەرهاتەکەی لەسیری هەتا پیازی کەتایبەت بوو بەنەوەکەی نووسیبوو.. و حاڵیبوو:«

- دەبێ پاش مەرگم هەرچۆنێک بێت سەیدە سۆرەی خائین لەتۆڵەی «جەمال»دا بتۆپێنن».

خێرێکی لەخۆگرتبوو دەستی سەقەت ببێت.

بەڕوویێکی گەش و عوبابەوە گوتی:
- کەفارەتە کەفارەتە مام سەید.
زۆری هەوەست پێهات و هەر زوو بەگوڕاح خۆشییەوە گوتی:
- خوا ئیمانت بداتێ دایکی زانا.
لەگەڵ قیت بوونەوەی ڕێزگرتندا گوتی:
- یاخوا بەخێربێیت سەر هەردوو چاوم.

* * *

- ئەو لەیەک هاوێربوونە یان لاموایە ئیشەکەمانی شلۆق کردووە.
- لەبەرچی؟.
- پەکیان پارووداری ئەمەیان ئەویتر هی ئەو.
ماوەیەک بۆیداماو گوتی:
- خوا بکات ئەوەی ئێرە بتۆپێنین، کەولاشەکانیشت بۆ ئەم مەبەستە لێی چوونەتە پێش، تەکبیری ئەو بەمن گەیشت.
بەسەرسوڕمانەوە گوتی:
- هەر لەو گۆڕەی دەفەرمووێت؟.
- زانی عەقڵی بڕ کات و گوتی:
- نەخێر.
دیسان ڕامانی بۆ کردەوەو گوتی:
- زۆر ئاسانە. لەڕواڵەتدا هەتا خۆمان لەمێشکی ئەمە دەچەسپێنن دەخەینە تا تەرازووی ئەویانەوە. ئەوکات ئەمەش هەروەکو سوخەتیانەو لایان وایە وڵات دوای ڕاپەڕین لەسەریان تاپۆ کراوەو میللەتیش غەوارە مسۆگەرە دەرمان دەکەن و دەچینە ئەولا.
بەچاوی تەژی شانازییەوە دەمێک بۆی ڕووانی و گوتی:
- هەتا دایکێکی جەسوورو چاوکراوەو تەکبیرکەری وەک تۆمان

هەبێت شاللا پشتی گەورەتری دوژمنمان لەعەردی دەدەین.
- ئەوانەی گوتت هەمووی بەرهەمی باوکی ڕەحمەتیتە. چوار پێنج ساڵ بە دەرس خەریکم بووە. لەهەوەڵەوە ئەلف و بێی کوردی وعەرەبی فێر کردم. لەبەر ئەوە کۆشێک سەرکەو بنکەم هەبوو نەیهێشت خۆم فێرەنووسین بکەم کەئەویش ئەرکێکی تر بوو. هەر جارێ دەیگوت:
- خۆت بەس بەخوێندنەوە ڕۆشنبیر بکەو گوێ بەنووسین مەدە.

* * *

زانا ماوەیەکی زۆر بەیانیان زوو دەڕۆیشت و حەدو سەدی ماڵ نووستنان بەمەلوولی و گوراح سستییەوە ساڵدانە ساڵدانە دەگەڕاوە. گورجی باوەڕی زۆر پێ بوو، هەر جارێ خۆی بەئەنقەست لەپرسیار کردن دەبواردو کەم و زۆر لەم ڕووەوە نەیدەدواند.
هەرکە زۆری خایاند ڕۆژێک ڕووی تێکردو گوتی:
- ڕۆڵە دەڵێیت ڕەنج بەخەسارد یاریت؟.
بەهێدییەوە هەر ئەوەتە لێیحاڵی بوو هەرکە گوتی:
- بڵێم چی.
هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو گوتی:
- ڕەنگە.
لەدڵی گران بوو بەڕووگرژییەوە گوتی:
- سەبەب؟.
بەکزییەوە گوتی:
- ئەو خائینە هەر دەم پێنج شەش چەکداری لەپێشماڵینەو لەچوونە دەرەوەو گەڕانەوەشدا موسەلەحەیەک لەپێشەوەی دەڕوات و یەکیش لە پشتەوە.

- بەخەمبارییەوە گوتی:
- ئاوا. بێت زۆر زەحمەتە.
بۆ دۆزینەوەی تروسکاییەک گوتی:
- چ..ڕێگەی تر شک نابەیت؟.
بەسەر لەراندنی بێ ئومێدییەوە گوتی:
- هەرچەند سەردەهێنم و دەبەم هیچم بەخەیاڵدا نایەت.
مانگێک، دووان، سێیان بەتەما بڕییەوە جلەوی هەوڵەکەی خۆی گرتەوەو لەسەر پەیڕەو کردنی بیروبۆچوونی، دایکی کەهەرگیز باوەڕی پێنەبوو..و داشینابوو ڕیسەکەیان بەئاشکرا بوون، بەیەکجاری لێ هەڵبووەشێتەوە. بەس لەبەر..ڕاگرتنی دڵی ناچار بوو بەردەوام بێت.
ڕۆژێک چێشتەنگاو بەهەلە داوانی کەیفسازی و موژدە بەزاراوە گوتی:
- دایە دایە:مزگێنی مزگێنیەکی زۆر خۆش غەنیمەکەمان پارچە بووە!.
لەخۆشیاندا توند بەبەرۆیەکی خۆ..وەی نووساندو فرمێسکی شادی بازرەقەی بەستاو دوای دوو سێ کەرەت ماچ کردنی ئەملاو ئەولای گوپەگوپنەکانی بەسۆزەوە جاقسەی بۆ هات و گوتی:
- نەمگوت ڕۆڵە!.
- «بۆ هەوڵ نادەیت، بە تەماعێکی زۆر یەک لەخوبزەکانی هەڵخەڵەتێنن و قونبولەیەک لەژێر کوشینی سەیارەکەی دابنێتەوەو هەرکە لەسەری دانیشت بتەقێتەوە».
- دایە ئەوەی جەنابت دەفەرموویت موستەحیلە.
زانا بەبیری خۆیەوە لێیدەخوڕی، تەرحی بەڵگە هێنانەوەیەکی واسەری سەلماندنی پێدا بنوێنێت.

- ڕۆڵە تۆ هێتشتا بۆنی شیری خاوت لەدەم دێت و سەرت لەشتی ئاوا تەواو دەرناچێت.
بۆ ئەوەی سەرنجی ڕاکێشێت گەشیەکی زاندەڕوویەوە و:
- من ئەوانە لەڕێ و پیکەوە دەناسم، لەڕاست تەماع دۆخینیان شلەو چاویان بە پارە بکەویت ((ز..........)) دەکەن
- عەقڵی نەگرت و نەشیدەویست باگوێ بۆ چوونەکەی بداتەوەو بەنا بەدڵییەوە هەستی بۆ ڕاگرت.
- بەس بەسینگو کوتکی نابێت، لەهەوەڵەوە دەبێت زۆر باش وێ بکەوین حیمایەکانی کێن و چۆن و بەچ دەگیرێن. ئەوکات مشووری خۆمان بخۆین.
ئێوارەیەک بەبۆنەوەی تێپەڕبوونی چل ڕۆژ لەسەر مردنی مام ڕەمەزان چوونە سەرەخۆشی گۆران. هەرکە زانا لەسەر خواستی دایکی لەکاتی بەڕێ کردنیان بۆ کۆران و زارێی دایکی دەورکردەوە. گەشییەک دەم ودەستە ڕووی گۆرانی داگرت و بلەزەوە گوتی:
- مزگێنیت کەوت، دایکت لەدوای نەمانی باوکمان لەهەموو ڕووێکەوە مامۆستاو ڕابەرمانەو ئەنجامدانی تەکبیرەکەی زۆر ئاسان و لەمگێزە!.
بەحەپەسانەوە، کەتا ئەو ساتە باراشی بۆچوونی لەلایەکی تری لێدەکردو:
- چۆن!؟
بەوپەڕی سۆزی شانازییەوە گوتی:
- لوقمان ئەمڕۆ بۆ ئەم مرازە خۆی کردووەتە حیمایەی و داینا‌وە شەوێک بیکوژێت. کەچی بەم ڕێگایەی دایکت پێشنیاری کردووە، بێ گیروگرفت و تەگەرەو ئاشکراش نابێت. بەس هەتا کۆن ئەبێت مانگێک، دووان سەبرو پشوو درێژی دەوێت.

چەند ڕۆژێک لوقمان لەماڵی گورجیدا مەشقی پێکراو تاکو تەواو لێڕاهات. هەتا نۆبەتە حەراسەتی کەوتە لەنیوەشەو بەملاوە ئارامی گرت»

گۆران ئەو ڕۆژە بەسەردانواندنی تەوازووەوە داوەراوە دەست ماچ کردنی و گوتی:

- هەتا زانایەکی وەک جەنابت مامۆستاو پێشرەومان بێت مەگەر خوا دەنا بە هیچ هێزێک نابەزین و تەگەرەو نسکۆشمان نایەنە پێش.

گورجی پشووێکی سەرفرازانەی خواردەوەو گوتی:

- ئۆخەی خۆ کەلەکەم لەڕاست دارودەستەی ئەمەیان کەوتە عەردی.

ئـ هـ بۆ دارودەستەی ئەویش خوا کەریم و کارزانە.

بۆ بەیانی لەبەر ڕێپێوان دەوام هەڵگیراو زۆربەی خەڵکی شاریان ڕژاندە سەر شەقامەکان و دار هەڵدرابووایە بەزەوی نەدەکەوت. مامۆستاو قوتابیانی هەر قوتابخانەیەک، بەدرووشمێکی گەورەو دژی تیرۆ..رستان لە ئاسماندا دەشەکاندەوە، لەهەرلاوە هوتاف بەناوی شەهیدی کۆڵنەدەرو ماندوو نەناس و پێشمەرگەی دێرین و قارەمانی سەنگەران بەرزبووەوە:

- بژی سەفینی سەرکردە.

- بژی سەفینی کۆڵنەر.

- بژی سەفینی پێشمەرگەی جانفیدا.

- بژی قارەمانی دەشت و دۆڵ و کێو. وهەڵەتان..

- بژی ڕابەری کوردایەتی.

- بمرێ پیلانی دوژمن و ئاژاوەگێڕو تیرۆرستان.

زانا زاری بەحەپەسانەوە بەڕووی دایکیدا پچڕی و گوتی:

- چما..ئەو هەموو عالەموللایەیان لایەنگیرە!.

بەزەردەخەنەیەکی تەوسەوە گوتی:
- نەخێر لەهەزاری دەشیان لەگەڵ دانییە، بەڵان کاربەدەستی شارن و بە زۆرە ملییەو هەتا لەمێشکی ئێمەمانانی دوور نەبین و ساویلکەو هەڵخەتاو بچەقێنن. هەر ئەوانن نوێنەری ڕاستەقینەی میللەت و گەورەو گچکەیان لەگەڵدایە.

* * *

گورجی ماوەیەکی زۆر لەدەریای کێشەو هێن و منهێنی ڕێگا دۆزینەوەی دوا تۆڵەدا دەخولایەوە. کەتا لەژیاندا ماوە دوا کەسەری دڵی نەوەی ڕووتان دامرکێنێتەوەو نەیباتە ژێر گڵەوە.
هەرکە ئەو هاتەوە پایتەخت لەخۆشییان شتاقە لینگی عەردی نەدەگرت و بزەی لێنە دەبڕاو لای وابوو:« قۆچانی ڕەشی «لایین»ی سەرتاسەری شاری پێشکەش کرا».
بەبافرەیەکەوە ڕووی لەسۆزان کردو گوتی:
- ڕۆڵە خوای مەزن وا نێچیرەکەمانی بە پێی خۆی ناردە بەسێرەمانەوە.
هەناسەیەکی درێژدادڕی، کە سینگوڕکی لەگەڵ بەرز بووەوە هەڵکێشاو گوتی:
- ئەو برینەشمان سارێژبووایە شتی چاک بوو.
بەدڵنیاییەکی بتەوەوە گوتی:
- هیچ خەم مەخۆ. ڕۆڵە نسکۆ نەیەتە بەر هەنگاوی نەوەی ڕووتانەوە، بە زەحمەتی مەزانە.
- : نسکۆ نایەت شاللا.
- : بەتەمای خوای گەورە و کارزان. ئـ هـ مەولوویێکیشم لەخۆم گرتووە.

* * *

چەنـد مانگـی پێچـوو زانـاو نەبـەز داریـان لەسـەر بـەرد، بـۆ نانـی ڕۆژانـەی ورگـی خۆشـییان دانەدەنـاو کاروکاسـبیان، لەسـبیانێوە هەتـا ئێـوارە لەبـەرو بـازاڕ دەیانگوزەرانـد. هـەر کەماوەیەکـی زۆری خایانـد دایکیـان بەجارێـک هەراسـان بـوو بـوو..و بەچـاوی سـووکەوە سـێرەی لێدەگرتـن. گەزگـەز گوشـتیان پـێ بـەردەداو تـا نیـدەدان ڕشـتر ببـن و:
- ڕۆڵەکانم هەر ئەو برینەمان ماوە «گۆشتپارە»ی بهێنتەوە.
ئەوانیـش هەرجـارێ سـەری تەوازوویـان بـۆ دادەنوانـدو بـەس. کەچـی بیسـت و چـوار سـەعات دەسـبەرداری تەکبیـرو مشـوور خواردنـی پـلان دانـان نەدەبـوون.
«ئاڤـان» شـەوێک حـەدو سـەدی نوێـژی خەوتنـان کوڕێکـی بـوو..و دوای نـاوک بڕیـن و ڕۆیشـتنی مامـان نەبـەز تەنگەتـاو خـۆی کوتـا ژوورەوەو لەتـاوان و هەناسـە سـواریی غـاری پڕتـاوەوە قسـەی بـۆ نەهـات.
گورجـی بەدیمەنەکـەی یەکسـەر حسـیا کارەسـاتێکی گـەورەی ئاوقـا بـووەو هـەر زوو گوتـی:
- ڕۆڵە ئەوە چیت لێقەوماوە!؟.
- بەقوڕگی پڕ گریان و پچڕ پچڕی زارەوە گوتی:
- لەکوشتنی هەڵۆ..دا مامە زاناش کوژرا.
شـلەژان دەلحـاز خورپـەی لەناخـەوە هەسـتاندو بەدەنـی هـەژاو ڕەنگـی زەردەچـوو..و بەرچاوتـارو پشووسـواریی لەبڵنـدو نـەوی بوونـی سینگی دەزانـدرا. پاش تۆزێک تاندانـە بەرخـۆی و بەجرەجرەی زاری هەڵبـڕی و:
- سەر بەهەش تێمناگەیەنیت چۆن بووە!؟.
دوای نەختێک شنگ هاتنەوە بەری، بەهەوگی پڕ گریانەوە گوتی:

- مـن و مامـە زانـا زۆر لەمێژە لەسـایەدو موراقەبـەی جێگـەو ڕێگـەو ئامـە شـۆكردنی بەردەوامـی هەڵۆدابوویـن. هەتـا مسـۆرگەربووین هەمـوو ئێـواران پـاش نوێـژی شـێوان، بەجـادەی پێـش «مەسـرەف عەقـار» دا تێدەپەڕێـت.
گریان هەڵوەستەی پێكردەوەو:
گورجیش لەسەر ئاوو ئاگر.
- ئـەو ئێوارەیـە خۆمـان لەكۆڵانـی وێـرووەی مەسـرەف عەقارەكـەوە دانووسـاند. هەركـە قەمـەرە سـوورەكەی دەركـەوت ناسـیمان و دوو حیمایەشـی لەگەڵـدا بـوو، هـەر زوو دوو ڕسـتە كلاشـینكۆفمان پێكـڕا خاڵـی كـردن و قەمەرەكـە داغـا بـە داغـان بـوو كەچـی........
گریان دیسان دەستی لێساند. پاشدان بەهێدییەوە گوتی:
موسەلەحەكەی دواوەی بەكلاشینكۆف ئێمەی ڕشاندو بەداخەوە........
پێی تەواو نەكراو لەپرمەی گریانی داوە.
گورجی ئارامی بەجارێک لێهەڵگیراو نەوەستا هەتا گریانەكەی هێور بێتـەوە و بەهەشـتاوییەوە گوتـی:
- هیزە جاریَ وەختی گریان و ڕۆ..ڕۆ نییەو دەی خێرا حاڵیمان بكە.
دوای سڕینەوەی فرمێسكە دروشت و بەگورەكانی و گوتی:
- مامـە زانـا لەتەنیشـتمەوە هـاواری لـیَ هەسـتاو ڕنگـەی لەعەردییـەوە هێنـاو گوتـی:
- مـن كەلكـم بـڕاوەو بەهـەر دوو چۆكـم كەوتـووەو تـۆ خێـرا هـەر هەنووكـە خـۆت قوتـار بكـە.
گریـان بەسـەریدا زاڵ بـووەو سـرپلە گورگـوڕ شـۆڕابەی بەسـتاو ڕووناكـی گلۆپەكانـی لەبـەر دیدانـی زەرد هەڵگـەڕان.
گورجی لەدەروونەوە خراتر دەكوڵی.

ئەویش بەنزگرەوە:
- مـن ویسـتم لـەدوو خۆمـی ڕاکێشـم تەقـەی موسـەلەحەکە، کەلەکۆڵانەکـە تـەواو ڕەتبووبـوو، هـەر دەهـات لێمـان نزیـک ببێتـەوەو زانیمـان لەگەڕانـەوە دایـە.
دیسـان زاری گێـراو داپیریشـی خەمـی دنیـا گەمارۆیدابـوو..و هـەر ئەوەتـە گوێـی لەقسـەکانی دەبـوو.
- دووەم جار پێیگوتم:
- پێتدەڵێم حەقت بەسەر منەوە نەبێت زوو بڕۆ.
- گوێـم پێنـەداو جـاری سـێیەم کلاشـینکۆفی هەڵکێشـاو سـوندێکی زۆر گـەورەی خـوارد ئەگـەر بەرچـاوی بەرنـەدەم بمکوژێت.
- بەدەست لەمل وەراندن هەتا شل و کوت بوون گریان.
گورجـی لەگـەڵ سـڕینەوە فرمێسـکە زۆرەکانـی و دوو سـێ شـەپ دان لـە کولمەکانـی و لـووت فـن کردنـدا هۆشـی تۆزێـک هێـور بـووەوەو زانـی کار لـەکار تـرازاوەو لەگـەڵ چووانیـش چ ناکرێـت هـەر چۆنێـک بـوو:«
- انا لله و انا إليه راجعون»ی لەدڵەوەی گوت و توانی زار هەڵێنێت:
- لـە کوشـتنی دوا غەنیمەکەمانـدا سـفت و سـۆی برینەکانمـی بەجارێـک دامرکانـدەوەو کەسـەریانم نەبـردە ژێرخاکـەوە.
لەدەروونەوە بەبێ دەنگ هەڵبڕین کولی و بڵقیدەدا. ئەمما بڵق.
- یاخـوا ڕۆڵـە چۆن لەدنیایێ بەسـەربەرزیت مـاڵ ئاوابیـت کـرد شـاللا لـە قیامەتیشـدا هـەر ئاوا..سـەربەرز دەبێت.
بەنزگـرەوە ماوەیـەک لەبەرخۆیـەوە دامـاو لەگـەڵ سـەربەرزکردنەوەدا بـەو پـەڕی جورئەتـەوە گوتـی:
- بەرخەنێـری بـەرەی ڕووتـان پێویسـتە بەشـانازییەوە لـەو نەوعـە

ڕێـگا پیـرۆزەدا سـەرببڕدرێت.
ئەوجا گاڕی وەبەرخۆیدا و ڕووی قسەی بەگریانەوە تێکردو گوتی:
- ڕۆڵـە هەسـتە لێـرە مەمینـە، دوای ناسـینی تەرمـی شـەهید دێـن دەتکـوژن.
لەبـەر ئـەوە لەڕێـگادا هەتـا گەیشـتەوە مـاڵ گریـان بەرینـەداو بۆیـە پێش ئەوانـدا کەوتـەوەو بەئاسـاییەوە گوتـی:
- نا..نا. وات نەحەملاندبوو هەتا بناسرێت.
لەم دڵ توندییەو کارەساتە گەورەیەدا لێیحاڵی بوو.
- زۆر لێیدوور نەکەوتمەوە، بەدەنگی بەرزەوە گوتی:
- لەمـەو دوا خەمی ناسینی مەیتی منتـان لەبـەروە نەبێت. نسـحەتەکەی تۆی بەجێ هێنا.
ئەمـە کەمێـک فێنکاتـی و شـانازی بەدڵـە گڕگرتووەکـەی بەخشـی و بـۆ ئـەوەی دڵـی نەبـەز بداتـەوە گوتـی:
- کەواتە لەسبەینێرا سۆزان حەڵاڵی تۆیە.
ئـەو لەلایـەک بەقسـەکەی و لەلایەکـی دیکـە بەکوشـتنی غەنیمـی بنەماڵەکەیـان زۆر شـادمان و سـەرفراز بـوو، کەئاواتـە گەورەکـەی چەنـد سـاڵە عەودالـی بـوو هاتـەدی و دڵـی تـەواو داکـەوت. کەچـی خەمـی زانـا هـەرزوو لەدەروونیـەوەی پەڕانـدو لەگریـان و ڕۆ..ڕۆی بەجۆشـەوەی بەشـداری کـردن.
ئاڤان لەژوورێکی تـر بوو..وشـەکەتی و هیلاکی منداڵبوون نەیانهێشـت زوو لـە واریقاتەکـە بـگات. هەرکـە حاڵیبـوو بـەدەم بەشـبوونەوەی تاسـان و شـلەژان و چـاو لەمۆڵـەق کەمێـک سـەیری کـردن و زۆری نەبرد جەسـتەی سـەرتاپا هـەژاو لەرزگرتـی و چرک و هـۆڕی پێکـەوت و شـەقە شـەقی ددانـی لـەدوورەوە دەبیسـترا.

گورجی هەستی پێکردو ناحەقیشی نەدەگرت و توند بەگریانەوە لەئامێزە خۆی گرت و بەیەکەوە لەهۆڕژنیاندا. دە خولەک زیاتری نەبرد دڵی بوورایەوەو تەنگەتاو گەیاندیانە نەخۆشخانە.
گورجی لەملاو لەولا بەرگوێی کەوت:
- چوار تەرم هاتوونەتە نەخۆشخانە، چەند کردی و کۆشا بەخۆی نەوەستاو ترسی ئاشکرابوونی وەلاناو بێباک و بوێرانە و بەموشتاقەوە بۆ لای تەرمەکان خشی. هەرکە دیقەتیدا تەرمی زانا، ئامۆژگارییەکانی:«
- ڕۆڵە بۆ ئەوەی دوژمنان لەهەڵسانت بەکارێکی دژیان نەتناسن پێویستە جل و بەرگی ڕۆژانەی خۆت لەبەر نەکەیت و هەوییەش هەڵنەگریت و گریمان زانیت لەدەست دوژمن قوتار نابیت و دەتکوژن دەبێ لەپێشدا خۆت بەجۆرێکی وا بکوژیت هەرگیز نەناسرێیتەوە.
- دایە گیان ئەوەی دەڵێیت چۆن دەبێ؟.
بەچاوی غیرەت و شانازییەوە بۆی ڕووانی و گوتی:
- لوولەی چەکەکەت لەژێر چەنەگەی خۆت بتەقێنەوە.
- تەواو پەیڕەوی کردووە بەدڵێکی پڕ سۆزو بەزەیی و ئەڤینی و گڕی جەرگ سووتان و لە گوێ و حەمد..دەرنەچوونی لەم ساتە حەرەجەو مەترسییەدا بەسەریدا زاڵ بوون و حەرام ئاگای لەوە نەما، ڕەنگە خراپ بەسەریدا بشکێتەوەو هەر ئەودەم بێ چەندو چۆن تیکە بە تیکەی بکەن:
- ئێمە تازە زەبری خۆمان وەشاند با عالەمیش ڕەحمەتی گوتەنی خڕ بزانن. هەرچیش دەبێ بەگونی «مان» مانەوە.
هەتا دەنگی لەبەردابوو نەڕاندی و:
- بژی نەوەی ڕووتان.

- بژی زەبری کوشندەمان.
- بژی «مان»ی نەوەی نوێمان.
- بژی نەوەی دوارِۆژمان.

یەکـەم شـەوی بەهـاری «٢٠٠٠»دووهـەزار واتـە ڕۆژی «٣/١٤»ی سـەعات سـێی دوای نیوەشـەو تـەواو بـوو.

## کورتەیەک

## لە واریقاتی ژیانم

- ((عەزیز مەلا ئەحمەد رەحیم)) باوکم بە مەلای رەش ناوداربوو.. و منیش کردوومە لەقەبی خۆم = عەزیزی مەلای رەش.
- ساڵی ((١٩٣٨)) لە ئاوایی ((چەغەمیرە))ی ناوچەی دیبەگە، قەزای مەخموور، پارێزگای هەولێر چاوم لە دونیای روون هەڵێناوە
- لە حوجرەی باوکم دەستم بە خوێندن کردووە.
- ساڵی ((١٩٥٦)) چووینە گوندی مورتکەی گەورە ناوچەی قوشتەپە.
- ساڵی ((١٩٥٧)) باوکم ئەمری خوای بەجێ گەیاند.
- گوزەرانی خێزانی لە ملە من شە تا. بۆیە دەستبەرداری خوێندن بووم.
- ساڵی ((١٩٥٩)) بەهۆی سەرکەوتنم لە تاقیکردنەوەیەکی وزاریدا لە دەورەی پەروەردەیی، تایبەت بە پیاوانی ئایینی لە شاری کەرکووک وەرگیرام.
- دوای سەرکەوتنم لە دەورەکە لە ((١٠-١٢-١٩٦٠)) بە مامۆستا دامەزرام.
- ساڵی ((١٩٨٨)) لە ترسی ((جەیشی شەعبی)) خۆم خانە نشین کرد.
- دوای راپەڕین گەڕامەوە.
- ساڵی ((٢٠٠٦)) خانە نشینکرام.
- هەنووکەش لە گەڕەکی رۆناکی نیشتەجێمە.
- لە حەژمەت هەرەس هێنانی شۆرشی ئەیلول ئاوێزانی خوێندنەوەی کتێبی کوردی بووم.
- ساڵی ((١٩٧٩)) لە تەمەنی ((٤١)) چل و یەکساڵیدا دەستم بە نووسین کرد. واتە بەپیری چوومە بەر هەویری.
- ساڵی ((١٩٧٩)) یەکەم نامیلکەی شیعری منداڵانم، بەناوی ((پشیلۆکە)) بڵاوکردەوە.

****

## کتێبە چاپکراوەکانم

1) پشیلۆکە. ١٩٧٩
2) قولە مەیتەر.١٩٨٠
3) کێخوا سێوێ.١٩٨٦
4) غەوارە. ١٩٩١
5) تۆبەی گورگ مەرگە. ١٩٩٠
6) خاک و چەوسانەوە ١٩٩٨
7) خاک و کێشەی مان. ١٩٩٩
8) حیزبی کەران ١٩٩٤
9) کۆڵنەدان ٢٠٠٣
10) کرمانج ١٩٩٨
11) گورز گورزانێ ٢٠٠٨
12) واریقاتی ژیان ٢٠١٦
13) مەلای رەش ٢٠١٠
14) لێقەومان ٢٠٠٥
15) پل ٢٠١٧
16) مێرێی دەرسیم ٢٠١٣
17) خۆری پێغەمبەرایەتی ٢٠١٦
18) خورچەیەک لە فۆلکلۆر ٢٠١٢
19) گورگ و بزن ١٩٩٠
20) بۆرە ١٩٩١
21) نەفرەت لە مین ٢٠١٧
22) واریقاتی ژیان خۆم ٢٠١٩

**

# ئەنفالی دووەم

کارەساتە، کارەساتە، کارەساتێکی نەگریس و نامۆ..و دڵتەزێنی وایە لە مێژووی سەرهەڵدانی مرۆڤایەتیدا ڕووینەداوە. بە دیتنی ئەوەی بە ئاستەم هەستی ویژدانی لەدەروونیدا شک ببردرێت خۆی بۆ ناگیرێت و بێ خواستی حەزییەوە لە براڕۆ دەدات. کارەساتێکی دەستکردی دوو زلهێزی دڵڕەش و چاوسوور و ئاوداڵی کوشتن و وێرانکاری.
گۆریللایەکی نەقۆڵاو و چەتوونەو هەردەم تەقەلایەتی کێرمیز لەناوچەکە ببرێت..
ئەویدی گورگە ڕووتەی هارودەم بە خوێنی خانەزایەو بە پیکی ئەو لێدەخوڕێت.



چاپکراوی بژاری ساڵانەی
"مەدالیای قەڵات"ی د. محەمەد عەلی عوزێری

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر